# بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد

## لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە

محەمەد عەلی قەرەداغی

بەرگی نۆیەم

# بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد

## لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە


محەمەد عەلی قەرەداغی

ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی


بەرگی نۆیەم

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

هەولێر - هەرێمی کوردستانی عێراق

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
تەلەفۆن: 35 49 224 66 (0) 00964
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

محەمەد عەلی قەرەداغی
بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد - بەرگی نۆیەم
کتێبی ئاراس ژمارە: ١١٠٢
چاپی یەکەم ٢٠١١
تیرێژ: ١٠٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٩٠ - ٢٠١١
نەخشاندنی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
رازاندنەوەی بەرگ: مریەم موتەقییان
پیتکاری: سەیران عەبدوڵڵا
هەڵەگری: بۆکان نووری، شێرزاد فەقێ ئیسماعیل

# وتەیەک

خوێنەری بەڕێز ئەوەی لە سەرەتای ئەم بەرگەی (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد)ەوە دەمەوێ بە تۆی ئازیزی بڵێم ئەوەیە:

هەوڵم داوە- بە یارمەتی خوا- لە رووی دەوڵەمەندیی ناوەڕۆک و زانستی نەوازە و نەبیستراو، بە متمانەییی سەرچاوە و وردەکاریی لە بابەتەکان و، رێکوپێکتریان- بە گوێرەی توانا- لە رێکخستنیدا ئەم بەرگەیش- ئەگەر لە بەرگەکانی پێشووی- چاکتر نەبێ لەوان کەمتر نەبێت و، ماندوویتی و ساردیی منی پێوە دیار نەبێت.

هەر وەک لە بەرگەکانی تردا کردوومە لەم بەرگەیشدا لەسەر ئەو نەریتە رۆیشتووم کە دوو بابەتی سەرەکیی و دامەزراو بخەمە پێش بابەتەکانی ترەوە:

١- بابەتی حوجرە و مەدرەسەکانی کوردستان، کە تاکە سەرچاوەی رۆشنبیری گەلی کوردن.

٢- دەستخەتی قورئان و شوێنەواری مامۆستایان و زانایانی کورد.

لەسەر ئەم دوو بابەتە نووسیومە و قسەم کردووە کە:

لە رووی نووسینەوەی مێژووی حوجرەوە دەتوانین بگەینە مێژوویەکی پڕ شکۆی هەوڵی زانایانی کورد و رەشەخەڵکی کوردستان، کە چۆن یەکەمیان هەوڵی فێربوون و بڵاوکردنەوەی زانستیان داوە و دووەمیشیان چۆن بە بەخششی بێ سنووریان ژیانی حوجرە و فەقێ و مەدرەسەکانیان دابین کردووە.

مێژووی خۆشنووسانی کوردیش مێژووی چینێک لەو بلیمەتە دەستڕەنگینانەی گەلی کوردە کە ئەگەر وەک پێویست- ئەوەی ماوە و لە دەستدایە- لە مێژوویان کۆ بکرێتەوە و بخرێتە کتێبخانەی جیهانی و ئیسلامییەوە، ئەوا مێژووی بەشێک لە شارستانیەتی گەلی کورد بە جیهان دەناسێنرێت.

ئەگەر تەمەن بە بەریەوە بێت و بۆم بگونجێت بە هیوام- بە یارمەتی خوا- ئەلبوومێکی رەنگین لە شاکاری بەری رەنج و دەست و پەڕەمووچی ئەو بلیمەتانە برازێنمەوە و بیکەم بە یادگاری ئەو سەربازە بێنازە نەناسێنراوانە و، بەم کارە بچووکە سووچێکی قەرزی گەورەی ئەو مامۆستایانە بدەمەوە و- هیچ نەبێ- ناویان زیندوو لە مێژووی خۆشنووساندا بپارێزرێت.

هەر وەک بەرگەکانی تر سەرەتا بە باسی حوجرە و مەدرەسەکان دەست پێ دەکەم و ناوی چەند مەدرەسەم دەست کەوتبێت کە لە بەرگەکانی تردا نەنووسراون و پێشتر پەییم پێ نەبردوون بە پێی پیتی هیجا دەیاننووسم. بە دوای ئەوانیشدا باسی ئەو قورئانە دەستخەتانە دەنووسم کە تا ئێستە باسیانم نەنووسیوە.

# ورده زانیاریی

جار جار لەملاولاو لە دەمی مامۆستایان و کەسانی تر هەندێ ورده زانیاریی دەبیسم کە ڕەنگە تۆمار نەکرابن، یان ئەگەر تۆمار کرابن لە پێچ و پەنا و دوورەدەستدا بن، بۆیە لەم پێشەکییانەدا دەیانخەمە ڕوو بەڵکو بۆ کەسانی خۆیان سوودگەیێن بن. لەوانە:

مامۆستا سەید باقری هاشمی دەفەرموێ:

١- مەلا محەمەدی قوبادیی و مەلا محەمەدی باوەجانیی دوو مامۆستای کورد بوون، هەردووکیان کوێر بوون، هەردووکیشیان دوو شاعیری پلەی یەکەمی هەجوو- داشۆرین بوون، بەڵام بەداخەوە بەرهەم و شوێنەواریان کۆ نەکراوەتەوە.

٢- خانای قوبادیی کە خوسرەو و شیرینی داناوە تەواوی نەکردووە، دوای ئەو چوار کەس تەواویان کردووە:

أ- مەڵکەی مراوەیس کە نەخوێندەوار بووە.

ب- شێخ قادری کەمانگەر.

ج- میرزا ئەولقادری پاوەیی.

د- مامۆستا سەید تاهیری هاشمی.

٣- سەرهەنگ موحەرەرزادە لە شاری سنە بەیاضێکی نایابی شیعری کوردی، فارسی لەلا بووە کە کاتی خۆی بۆ (أمان الله خانی والي کوردستان) نووسراوەتەوە.

## قورئانە دەستخەتەکانی پێشانگەی قورئان لە سەقز

برای هێژا مامۆستا عیرفانی پارسا هەوڵێکی دڵسۆزانەی بۆ دام و وێنەی سەرەتا و کۆتایی و چەند لاپەڕەیەکی لە هەر یەکێک لەو قورئانە دەستخەتانەی لە ڕەمەزانی ساڵی ١٤٣٠ک دا لە شاری (سەقز) لە پێشانگەی قورئاندا نوێنرابوون بۆ سکان کردبووم و خستبوونییە سەر سیدی.

لەگەڵ سوپاسی زۆرمدا بۆ مامۆستا عیرفان لەم دەرفەتەدا بۆ هەر یەکێک لەو قورئانانەی ناوی نووسەرەوە و مێژووی نووسینەوەیان دیارە کورتە پێناسەیەک دەنووسم، بە هیوای ئەوەی ئەمانەیش خشتگەلێکی تر بن لە کۆشکی ڕەنگینی مێژووی خۆشنووسانی کورددا.

باسی ئەم قورئانانەم پێکەوە نووسیوە و بۆ بەرو دواییان مێژووی نووسینەوەم کردووە بە بنەما، واتە کامیان لە گشتیان کۆنترە ئەوەم لە پێشەوە داناوە و، یەک لە دوای یەک ئەوانی تریشم بەپێی مێژووی نووسینەوەیان داناوە. ئەگەر گونجایش نموونەی وێنە لە هەر یەکێکیان لە تەک باسەکەیدا دادەنێم.

### قورئانی دەستخەتی مامۆستا خونسرد

١

ئەم قورئانە پێوانەکەی ١٢×٧,٥ بەرگەکەی بە گوڵی جوان نەخشێنراوە، زەرکەفتکارییەکی نایابی تێدا کراوە، پێش سەرەتای قورئانەکە دوو لاپەڕە زەرکەفتکاریکراوی تێدایە ناوەڕاستەکانیان هەشتگۆشەییەکی تێدا بە ئاوی تەڵا نەخشێنراو دانراوە، دوعایەکی تێدا نووسراوە. ناوی سوورەتەکان لەناو لاکێشییەکی تەڵاییدا بە مەرەکەبی سوور نووسراوە. کۆتاییی ئایەتەکان بە خڕکەییەک کە چوار باڵی شینی لێ جیا کراوەتەوە و خڕکەییەکە تەڵاییە، دیاری کراون.

چوارچێوەی هەموو لاپەڕەکانی بە جۆگەلەی تەڵایی و ڕەش گیراوە، نیشانەی حیزب و جوزئەکان بە گوڵی تەڵایی و جوان ڕەنگێنراوە، ناوی حیزب و سوورەتەکان بە مەرەکەبی سوور نووسراوە. لە سەرەتای سوورەتەکانەوە ناوەکانیان بە گوڵێکی تایبەتیی جوان کە ناوی سوورەتەکەی تێدا بە مەرەکەبی سوور نووسراوە، دیاری کراوە.

هەندێک پەڕپووت و شپرزەبوونی پێوە دیارە.

لە کۆتاییدا دوعایەکی کورت نووسراوە. دوای دوعاکە ناوی نووسەرەوەکەی نووسراوە کە بەداخەوە دەستێکی چەپەڵ ناوەکەی کوژاندووەتەوە، لەوە دەچی (أبوالقاسم الحسيني) بێ. نووسەرەوەکە نووسیویە:

(راقمه اقل السادات أبو... الحسيني في سنة ١٢٢٢).

واته ساڵی ١٢٢٢ک. نووسیویەتییەوە.

پێشانگەی قورئانی سەقز ١٤٣٠ رەمەزان.

## قورئانی محەمەدی کوڕی مەحموود سوڵتان

## ٢

ئەم قورئانە دەستخەتەیش یەکێکە لەو قورئانانەی لە پێشانگەی قورئانی پیرۆزدا لە مانگی رەمەزانی پیرۆزی ساڵی ١٤٣٠ک.دا لە شاری سەقز نمایش کراون.

ئەم قورئانە بەرگێکی پێستی هەیە. پێوانەکەی (٩×١١,٥)ە. بە خەتێکی نوسخی مامناوەندیی نووسراوەتەوە، زەڕکەفت و رازاندنەوەی تێدا نەکراوە. بە مەرەکەبی رەش و سوور نووسراوەتەوە. ناونیشانی سوورەتەکان و ئاماژەکانی تەجوید تێیدا بە مەرەکەبێکی سووری کاڵی مەیلەو پرتەقاڵی نووسراون.

لە کۆتاییەوە نووسراوە:

«در حال هم و غم بسیار از گردش روزگار ناپایدار بید العبد المذنب الراجی محمد ابن محمود سلطان، حاکم محال خورخوره، از یوم چهار شنبهء بیستم شهر ذي قعدة الحرام از قریهء قولدرهء علیا من محال افشار بتوفیق خدای پروردگار باتمام رسید، مبارکباد بمحمد وآله الامجاد»

لێرەدا ساڵەکەی نەنووسیوە، بەڵام لە سەرەوە دەڵێ: لە ساڵی ١٢٧٧دا بووە.

## قورئانی دەستخەتی ئەڵڵاوێردی

## ٣

ئەم قورئانە دەستخەتە پێوانەکەی (١٨×٢٥)ە، پێستێکی چەرمی قاوەیی نەخشێنراو بەرگی بووە. بەرگەکەی کۆن بووە بنەکەی دڕاوە و بە پەڕۆیەکی خەتخەت بنی تێ گیراوەتەوە.

ساڵی ١٢٣٢ بە دەستی ئەڵڵاوێردی کوڕی فەرەض عەلی بەگی سنەیی نووسراوەتەوە.

چوارچێوەی تەلایی بۆ لاپەڕەکانی دانراوە، سەرەتاکەی- سوورەتی فاتیحە و لاپەڕەی یەکەمی سوورەتی البقرة- زەڕکەفتکارییەکی جوان کراوە، بەڵام بە رەنگگەلێکی مات و کەمێک تاریک.

ناوی سوورەتەکان و نیشانەی بەشکردنی جزم و حیزبەکان بە مەرەکەبی سوور نووسراون.

بە خەتی (نسخ) نووسراوە، دوعای خەتمی قورئانەکەی بە خەتی (ثلث) نووسراوە لە کۆتاییەوە نووسیویە:

«حرر تراب أقدام المؤمنین **اللهوردی** ولد فرضعلی بک سنندجی الاصل بالاستعجال بجهة اخوی خضر آقا کوی در پانزهم شهر ذی الحجه الحرام قلمی شد سنه ١٢٣٢»

واتە: تۆزی پێکانی موسڵمانان ئەڵلاوێردی کوڕی فەرض عەلی بەگ پازدەی ذیلحەجەتولحەرامی ساڵی ١٢٣٢ بە پەلە لەبەر خاتری برای خضر ئاغای کۆیی نووسییەوە.

## قورئانی دەستخەتی محەمەدی بانەیی

٤

ئەم دەستخەتەیش شوێنەواری خۆشنووسێکی کوردە، بەڵام بەداخەوە باش هەڵنەگیراوە و وەک پێویست نەپارێزراوە، لە سەرەتاوە سوورەتی فاتیحەی تێدا نییە، دڵۆپە و تەڕبوونی زۆری پێوە دیارە، بەڵام مەرەکەبەکەی نەکوژاوەتەوە، زەخرەفە و زەڕکەفتکاریی پێوە نییە، بە مەرەکەبی رەش بە خەتی (نسخ) نووسراوەتەوە، ناوی سوورەتەکان بە مەرەکەبی سوور نووسراوە.

نووسەرەوەکەی ناوی خۆی و هۆز و تیرەی بە درێژیی نووسیوە، منیش دەقەکەی وەک خۆی دەنووسم:

«قد تم المصحف الشريف والقرآن اللطيف على يد احقر العباد وأضلّهم طريق الارشاد، محمد بن محمد مؤمن بيك بن عليقلي القلعة دزدي البانوي ولاية ومسقطا، والشافعي مذهبا، والاشعرى عقيدة، والقصيراني طريقة، والماموى عشيرة وقبيلة، في قصبة بروژة بعد العصر يوم السبت شهر ذي القعدة الحرام في مسجد الجامع. اللهم اغفر لي ولوالدي ولسائر المسلمين. في سنة ١٢٣٥ .

اللهم صل على محمد سيد الأولين والآخرين وعلى آله وأصحابه وسلم تسليما».

## قورئانی عەلی رەحمەتئابادی

٥

ئەم قورئانە بە خەتێکی (نسخ)ی جوان نووسراوەتەوە، سەرەتا و کۆتاییی ماوە، لە سەرەتاوە زەخرەفە و رازاندنەوەی تێدا نییە، بە مەرەکەبی رەش و سوور نووسراوەتەوە، ناوی سوورەتەکان و ژمارەی ئایەتەکانی بە مەرەکەبی سوور نووسراوە، چوارچێوەی جووتخەتی بۆ لاپەڕەکانی کراوە.

تەفسیری فارسیی دێر بە دێر لە ژێر دێرەکاندا بە خەتی سوور نووسراوە.

عەلی کوڕی (میر مطهری) حسەینیی رەحمەتئابادی ساڵی ١٢٤٧ک. نووسیویەتییەوە.

هەندێ شوێنی دڕاوە و پینە کراوەتەوە. هەندێ شوێنی ئاو و دڵۆپەی بەرکەوتووە.

## قورئانی شێخ سەعیدی گەورە

٦

ئەم قورئانە دەستخەتە پێوانەکەی (١٨×٢٩)ە، بەرگێکی نوێی سەوزی زەڕکەفتکراوی بۆ کراوە. لەسەر ئەو بەرگە نووسراوە: «قورئانی کەریم، دەسخەتی شێخ سەعیدی گەورە، لە دێی هەرشەل، ساڵی ١٢٥٠ی کۆچی»

ئەم دەستخەتە باش پارێزراوە و سەرەتا و کۆتاییی ماوە و شوێنەواری دڵۆپە و تەڕبوونی پێوە نییە. دوو لاپەڕەی سەرەتای زەرکەفتکارییەکی جوان کراوە، چوار دەوری ئەو دوو لاپەڕە بە گەڵا و گوڵ بەڕەنگەکانی مەرەکەب نەخشێنراوە، لەناو ئەو نەخشانەدا زنجیرەیەک دەبینرێ بە ڕەنگی شین دروست کراوە و لەناو هەر ئەڵقەیەکیدا چوار خشتی سوور دانراوە. ناوی سوورەتەکان بە مەرەکەبی سوور لەناو لاکێشی تەلاییدا دانراوە، لاپەڕەکانی تر بە چوارچێوەیەکی تەلایی و لە سەرووی ئەویشەوە بەچوارچێوەیەکی شین چواردەور گیراون. کۆتاییی ئایەتەکان بە خڕکەی تەلایی جیا کراونەتەوە. نیشانەی بەشکردنی جزم و حیزبەکان بە مەرەکەبی سوور لەناو گوڵێکی تەلاییدا نووسراوە.

کۆتاییی لاپەڕەی کۆتاییی قورئانەکە بە پینەیەکی سپیی پینە کراوە، گومانی ئەوە دەکرێت بەو پینە نووسراوێک کە لەوانەیە ناوی نووسەرە و مێژووی نووسینەوەی قورئانەکە بێ، داپۆشرابێت. لە لاپەڕەی دوای ئەوەدا بە خەتێکی جوانی نوێ بە کوردی نووسراوە:

بسم الله الرحمن الرحيم

پاش مردنی مەرحوومی حاجی مەلا محەمەدی حاجی کاکەوڵا لە ساڵی یەک هەزار و چوارسەد و دوازدەی هیجری ٢٤٩٦ی کوردی لەلایەنی عەبدولقادری کوڕی مەرحوومی حاجی مەلا محەمەد ئەم قورئانە گەڕاوە بۆ کاک شێخ مەحموودی کوڕی مەرحوومی شێخ محەمەد ئەمین.

لەبەرئەوەی ئەو هونەرە جوانە ئەو خەتە کەم نەزیرە بە دەست و پەنجەی مەرحوومی شێخ سەعیدی باپیری کاک شێخ مەحموود نووسراوەتەوە، گەڕاوە بۆ کاک مەحموودی ئەسعەدی»

## قورئانی دەستخەتی مەحموودی "برنکهانی" کوڕی ئیبراهیم بەگ

٧

ئەم قورئانە بە خەتی (نسخ) نووسراوەتەوە. زەخرەفە و ڕازاندنەوەی بۆ نەکراوە، لە سەرەتاوە چوارچێوە بە خەتی سوور بۆ لاپەڕەکانی کراوە. ناو دێرەکانیشی جۆگەلەی سووری بۆ کراوە. کۆتاییی ئایەتەکان دیاری نەکراوە.

ساڵی ١٢٦٧ مەحموودی (برنکهانی) کوڕی ئیبراهیم بەگ نووسیویەتییەوە.

لە کۆتاییەوە نووسراوە کە کاتی خۆی وەقف کراوە بە وەقفی عام، دوایی مەحموودی نووسەرەوەی وەقفەکەی هەڵوەشاندووەتەوە و وەقفی کردووە بۆ حاجی ئاغا.

لە کۆتاییەوە هەندێک شیعری فارسی بە خەتی (نستعلیق) تێدایە.

ئەم قورئانە لەلای مامۆستا شێخ محەمەدی باییەرە لە باوکییەوە بۆی ماوەتەوە، کاتی خۆی مامۆستا شێخ ئیبراهیمی باوکی لە بانە مەلا بووە، ئەم قورئانەی پێشکێش کراوە.

## قورئانی دەستخەتی ئەحمەدی هەرشەلی

### ٨

ئەم قورئانە دەستخەتە بەرگێکی پێستی قاوەیی هەیە، بە خەتی (نسخ) نووسراوەتەوە، تەرجەمەی فارسیی لە تەکدایە. ساڵی ١٢٨٥ک نووسراوەتەوە پێوانەکەی (٤٠×٢٥) لە کتێبخانەی شێخ مەحموودی ئەسعەدیدایە.

قورئانەکە زۆر شڕ و پەڕپووت و دڵۆپە لێدراوە، سەرەتا و کۆتاییی دیار نییە، زەڕکەفت و نەخشاندنی پێوە نییە. ئەو زانیارییانەی سەرەوەم لەو پێناسە وەرگرت کە بۆ پێشانگەکە بۆی نووسراوە.

بەپێی ئەو پێناسە ئەحمەدی کوڕی شێخ مەحموردی کوڕی شێخ محەمەد سەعیدی هەرشەلیی ڕۆژی شەموو ڕەمەزان ساڵی ١٢٨٥ک لە مزگەوتی کەسنەزان نووسیویەتییەوە .

## قورئانی دەستخەتی کوڕی ئیسماعیل

### ٩

ئەم قورئانە دەستخەتە پێوانەکەی (٢١×١٤)ە، بە خەتی (نسخ) نووسراوەتەوە، سەرەتا و کۆتاییی ماوە، نەخشاندن و زەڕکەفتکاریی تێدا نییە، بە مەرەکەبی ڕەش و سوور نووسراوەتەوە. ناوی سوورەتەکان و نیشانەکانی جزم و حزبەکان بە مەرەکەبی سوور نووسراونەتەوە.

ڕۆژی شەمووی سەرەتای مانگی ذیلقەعدەی ساڵی ١٢٨٥ک نووسراوەتەوە. لە سەرەتای ئەم قورئانەوە بە خەتێکی نوێ بێ مێژووی نووسین بە زمانی فارسی لاپەڕەیەک نووسراوە کە ئەمە پوختەکەیەتی بە کوردی:

> ئەم قورئانە پیرۆزە بە خەتی مامۆستا کوڕی ئیسماعیل لە ساڵی ١٢٨٥ک دا نووسراوەتەوە. لەلایەنی ڕەحمەت و محەمەد حەیدەری بۆ محەمەدی کوڕی مەحموود حەیدەری لە مەلا محەمەد ئەمین بەگی ئیمامی گوندی کانی سفیدی (کانی سپیکە)ی سەر بە دیواندەرە بە گایەک و گوێرەکەیەک هەدیە کراوە. مەحموود حەیدەریش ساڵی ٧٨- ١٣٧٧ هەدیەی کردووە بە ئەمین محەمەد زادەی برازای.
>
> داوا لە یاسینی کوڕم و میراتگرانم دەکەم کە چاودێریی ئەم شوێنەوارە بکەن و بۆ ماڵی دنیا لە دەستی نەدەن و لەو خانەوادەماندا بمێنێتەوە.

ئەمین محەمەد زادە

## قورئانی دەستخەتی ئەبولقاسمی حسەینی

١٠

ئەم قورئانەیش یەکێک بووە لە قورئانە نایاب و جواننووسراوەکان و کاتی خۆی ڕەنجێکی زۆری تێدا دراوە، نووسەرەوەکەی توانای هونەریی خۆی تێدا بەکار بردووە. بەڵام دیارە باش هەڵنەگیراوە و بایەخی زۆر بە پاراستنی نەدراوە، بۆیە شپرزە بووە و ئاو و دڵۆپەی بەرکەوتووە و، لە کۆتاییی‌یەوە لە سوورەتی (القدر)ەوەی نەماوە.

ئەم قورئانە پێوانەکەی (١٢×٧,٥)ە و بەپێی ئەوە لە پێشانگەکەدا نووسراوە ئەم دەستخەتە بە خەتی (ئەبولقاسمی حسەینی)یە.

بەرگێکی پێستی بە گوڵی ئاڵ ڕەنگێنراوی هەیە، بنەکەی دڕاوە و بە پەڕۆ چاک کراوەتەوە.

دوو لاپەڕەی پێش دەستپێکردنی قورئانەکە بە مەرەکەبی تەلایی و بە گوڵ و گەڵای جۆراوجۆر نەخشێنراون. دوای ئەوە سوورەتی (ا لفاتحة) و سەرەتای سوورەتی ( البقرة) لاپەڕەی یەکەمی بە زەرکەفتییەکی جوان کراوە و ڕەنگەکانی شین و سوور و تەلایی زاڵن بە سەریدا. ناوی سوورەتەکان بە مەرەکەبی سوور لەناو لاکێشی تەلاییدا نووسراوە. لاپەڕەکانی تری چوارچێوەی تەلاییان بۆ کراوە و، کۆتاییی ئایەتەکانیش بە خڕکەی تەلایی جیا کراونەتەوە.

نیشانە و بەشکردنی جزم و حیزبەکان لە ناو گوڵی تەلاییدا بە مەرەکەبی سوور نووسراون.

## قورئانی رووس

١١

ئەم قورئانە کاتی خۆی قورئانێکی زۆر نایاب بووە، بەرگی پێستی قاوەیی بووە، پێوانەکەی (٢٤×١٥)ە.

لاپەڕەی یەکەمی نەماوە، لاپەڕەی دووەمی زەرکەفتکارییەکی جوان کراوە، بە ڕەنگەکانی مەرەکەبی جۆراوجۆر بە ڕەنگی گەڵا و گوڵ نەخشێنراوە.

چوارچێوەی تەلایی بۆ لاپەڕەکانی و جۆگەلە بۆ دێرەکانی کراوە. کۆتاییی ئایەتەکان بە خڕکەیی تەلایی جیا کراوەتەوە. لاکێشیەکی جوان و نەخشێنراو بۆ سەرەتای سوورەتەکان کراوە، ناوی سوورەتەکەی بە مەرەکەبی تەلایی تێدا نووسراوە. نیشانەی بەشکردنی حیزب و جزمەکانی خراوەتە ناو گوڵ و گەڵایەکی جوانەوە.

بە خەتی (نسخ) نووسراوەتەوە، کۆتاییی‌یەکەی نەماوە، ناوی نووسەر و مێژووی نووسینەوەی دیار نییە.

بەم قورئانە دەوترێ (قورئانی رووس) بەهۆی ئەوەوە کاتێ لە شەڕی جیهانیدا رووس هێرشی هێناوە بۆ سەر ئێران و گەیوەتە ئەو ناوچەیە قورئانەکەی تێدا بووە- کە گوندێک لە گوندەکانی کوردستان بووە- خەڵکەکە قورئانەکەیان بردووە بە پیریی سوپاکەوە بەڵکو ڕێزی لێ بگرن و زیان

بە گوندەکە و خەڵکەکەی نەگەیەن، بەڵام ئەو کەسانە لە بری ڕێزگرتن لە قورئانەکە بە شمشێر لێیان داوە و قورئانەکەیان لە تلەلەت کردووە و، ئەو لەتبوونەی لە سوورەتی (النساء)ەوە پێوە دیارە.(*)

## قورئانی شێخ حەسەنی مەولاناوا

### ١٢

ئەم قورئانە یەکێکە لە قورئانە نایاب و بە بایەخە دەستخەتەکانی کوردستان. شێخ حەسەنی مەولاناوای خاوەنی قورئانەکە بایەخێکی زۆری پێ داوە و لە گەلێ ڕووەوە روونکردنەوەی لەسەر نووسیوە. لێرەدا پوختەیەکی ئەو زانیارییانە و ئەو خزمەتانەی بەم قورئانە کراون دەخەمە پاڵ باسی ئەو قورئانانەی کە ناوبەناو باسیان دەکەم:

ئەم قورئانە لە قەوارەی گەورەدا نووسراوەتەوە و پێوانەکەی (٦٠×٤٠)سم، ١٩١٨ لاپەڕەیە، کێشانەکەی ١٦ کیلۆیە.

لاپەڕەی (١٠) دێری تێدایە، بێجگە لە تەفسیر و حاشیە. تەفسیری دێر بە دێری بە زمانی فارسی کراوە، تەفسیرەکە بە مەرەکەبی سوور لەژێر دێرە قورئانەکانەوە نووسراوە. بەرگێکی پێستی جوانی نەخشێنراوی هەیە.

ئەم قورئانە خەتی رەسووڵی کوڕی یەحیای کوڕی زەکەریایە، ڕەسووڵ قورئانەکەی بۆ شێخ حەسەنی مەولاناوایی نووسیوەتەوە. بەشێکی تەفسیر و ئەسبابی نوزوول و باسی ناسیخ و مەنسووخ و وردەکاریی تر بە خەتی خودی شێخ حەسەنن.

مامۆستا رەسووڵی نووسەرەوە لەم بارەوە نووسیویە:

> رەسووڵی کوڕی یەحیای کوڕی زەکەریا لەبەر خاتری گەورە و مەولام و شێخی شێخان شێخ حەسەنی کوڕی شێخ مەحموودی کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ ئیبراهیمی صادقی ناسراو بە (بستی) نووسیویەتییەوە. نووسینەوەکەی لە ڕۆژی دووشەمەی مانگی (ربیع الاول)ی ساڵی ١١٢٧دا تەواو بووە.

دوای نووسراوانەی قورئانەکە شێخ حەسەن قورئانەکەی هەڵگرتووە و بردوویەتی بۆ عەرەبستان و میسر و شام و لە تەک قورئانە کۆنە دەستخەتەکانی سەرەتای ئیسلامدا بەراوردی کردووە و، لە تەک گەلێ لە زانایانی ئەو وڵاتانەدا دانیشتووە و گفتوگۆی کردووە. شێخ حەسەن لە لاپەڕە ٧٨٤ی قورئانەکەیدا لەم بارەوە نووسیویە:

> «یا من یقرأ علی مصحفي هذا بالله علیك لا تغیر ما کتبتُ ولو حرفا او حرکة، فأنه مصحح بالکرات المتعددة، وقد قوبل بتصاریف الصرف، وقواعد النحو، ونتایج القضایا، ولطایف الاستعارات، وبدایع المعاني. وحقائق أقوال المفسرین، وأرسام

---

(*) لێرەدا قورئانەکانی پێشانگەی سەقز تەواو بوون.

التجاويد، واتباع القرائن من أوله إلى آخره. فلا تحرفه جهلا منك إلا إذا كنت عالما ماهرا باصطلاح النحاة وأقاويل المصنفين، واطلعتَ على محرّف، وكررت النظر إليه، او شاورت العلماء، وفوق كل ذي علم عليم. والا فأكون خصمك يوم فصل القضاء والحساب.

وقد اجتهدت في تحصيل هذا المصحف الشريف غاية الجهد قريبا من عشر سنين. تا حق سبحانه وتعالى به فضل وكرم بى پايان خود خلعت توفيق اتمام آن بر فقير پوشانيده. ونرجو من الله سبحانه يصح ان يقال له ام القرآن في بلادنا. فمن ثم سميته بأم القرآن. فوالله ما وضعت فيه حرفا ولا حركة ولا نقطة ولا رمزا من رموز القراءة إلا بالدليل.

هذا آخر وصيتي، عليكم إخواني -وفقني الله وإياكم الى ما يحب ويرضى- واستودع الله ديني ودينكم ودنياكم، ورزقه الله لقاءكم في الجنة أجمعين. ورزقني الله وإياكم لقاءه بمنه وكرمه وفضله، وما ذلك على الله بعزيز. ربنا تقبل منا إنك أنت السميع العليم. وتب علينا إنك أنت التواب الرحيم، واهدنا إلى الحق وإلى طريق المستقيم. واغفر لنا ذنوبنا انك أنت التواب الرحيم. وسلام على المرسلين.»

جگە لەوەی شێخ حەسەن تەرجەمە و تەفسیری زۆری بە زبانی فارسی بەسەر قورئانەکەوە نووسیوە، ڕا و بۆچوونی زۆری تایبەتیی خۆیشی نووسیوە، لە دوای بۆچوونەکانی خۆیەوە نووسیویە (وێم) واتە: (خۆم) کە مەبەستی ئەوەیە ئەوەی نووسیویە بۆچوونی خۆیەتی.

شێخ حەسەن یەکێک لە مامۆستایانی دیار و ناسراوی تەجوید و قیرائات بووە. لەم بارەوە دانراوێکی بە هۆنراوە هەیە. هەر لەبەرئەوەیشە شێخ حەسەن لە پاڵ تەفسیرەکانی ئایەتەکاندا وێنەی دەم و ددان و قورگی کێشاوە و، شوێن و مەخرەجی حەرفەکانی بەپێی ئەو وێنە، هەر حەرفێ لە مەخرەجی خۆیدا، دیاری کردووە.

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەم قورئانە ئەوەیە شێخ حەسەن هەر حەوت قیرائەتەکەی قورئانی پیرۆزی لەناو قورئانەکەدا بە نیشانە و مەرەکەبی سوور دیاری کردووە.

شێخ حەسەن لەلای هەر ئایەتێکدا کە بۆ موناسەبەیێ یا دوعایێ بخوێنرێت باسی ئەوەی لە کتێبی (خواص القرآن) وەرگرتووە و لەوێدا نووسیویە:

> سێ وەقفنامە لە کتێبخانەی شێخ حەسەندا کە لە گوندی مەولاناوایە هەن، لە هەرسێ وەقفنامەکەیدا کتێبەکانی خۆی لەسەر زاناترین نێرینەی برازاکانی: شێخ ڕەسووڵ و شێخ حەیدەر و نەوەی ئەوان وەقف کردووە و، ئەوانی لە فرۆشتن یان هیبە و بەخشین یان بەکرێدانی ئەو کتێبانە مەنع کردووە. وە هەر کەسێ ئەوە بشکێنێ و بەپێچەوانەی ئەو وەقفنامەوە کار بکاتی بەر لەعنەتی خوا خستووە.

مامۆستایان مەلا ئەحمەدی وزڵەی مودەڕیسی باشماخ و، مامۆستا مەلا عەبدوللەتیفی مامۆستای گوندی (گول تەپە) و، مامۆستا محەمەد سادقی قازی و مودەڕیسی سەقز ئەو

وەقفنامەیان ئیمزا کردووە. چەندان کەسیش وەک: مامۆستا مەلا زەکەریا و مامۆستا مەلا فەتحوڵڵا و شێخ عەبدوڵڵا و حاجی حسەین بەگ و حاجی یەعقووب و حاجی مستەفا شایەتی ئەو وەقفە بوون.

ئەم قورئانە لە گوندی مەولاناوای سەر بە خورخورەی ناوچەی سەقز پارێزراوە.

شێخ حەسەن ساڵی ١٠٧٣ک ١٦٦٢ز لەدایک بووە، ساڵی ١١٣٦ک ١٧٣٢ز کۆچی دوایی کردووە.(١)

## قورئانی مەلا نەزیری تەوێڵە

### ١٣

ئەم قورئانەیش یەکێکە لە قورئانە دەستخەتە کۆنەکانی کوردستان. سەرەتا و کۆتاییی ماوە، زەرکەفتکاری و جوانکاری تێدا نەکراوە، سەرەتاکەی نەنەخشێنراوە، بە خەتێکی خۆشخوێن لە نێوان (نسخ) و (ثلث)دا نووسراوەتەوە، سەرەتای سوورەتەکان بە مەرەکەبی سوور نووسراوە. کۆتاییی ئایەتەکان بە خڕکەیەکی بچکۆلەی سوور دیاری کراوە، هەروەها نیشانەکانی تەجویدیش بە مەرەکەبی سوور نووسراون، لە کەنارەوە بەشکردنی جوزء و حیزبەکان بەهەمان شێوە.

تا کۆتاییی قورئانەکە بە یەک جۆر کاغەز نووسراوە، بەڵام دوعای خەتمی قورئان کە لە کۆتاییەوەیە لە کاغەزێکی تر و جۆرێکی تردا نووسراوەتەوە، خەتی دوعای خەتمەکەیش زۆر لە خەتی قورئانەکە دەچێت.

لە کۆتاییەوە نووسراوە:

«تم الكتاب المجيد بعون الملك الحميد بعد الظهر يوم الأربعاء في شهر ذي القعدة في قرية روان على يد أحقر الع.... ملا نذير طويلي الاصل سنة الف ومائتين وإحدى وثلاثين من بعد هجرة سيد المرسلين. هذا المصحف الثالث والثلاثون»

ئەو شوێنەی کە خاڵم تێدا داناوە دوای (الع) ئەوە دیارە بە ئاشکرا کاغەزەکەی بڕاوە و کرێنراوە، ئیتر نازانم بە چ مەبەستێک بووە، بە دووری نازانم بۆ مامۆستا مەلا نەزیر نووسرابێتەوە و خەتی خۆی نەبێت و، ئەو بەشە کرێنراوە ناوی نووسەرەوەکەی بێت، هەر لەبەر ئەمەیش نووسیم (قورئانی مەلا نەزیری تەوێڵە) و نەمنووسی دەستخەتی مەلا نەزیری تەوێڵە.

دەستخەتی تری مەلا نەزیریشم نەدیوە تا بەراوردی بکەم لە تەکیدا و بزانم خەتی خۆیەتی یان نا.

---

(١) ئەم زانیارییانەم لە مامۆستا عیرفانی پارسا وەرگرتووە.

## قورئانێکی دەستخەتی تری سیاگوێز

١٤

ئەم قورئانە دەستخەتێکی کۆنی دڕاو و چەند جار پینەکراو و سەحافیی کراوەیە. نووسەرەوەکەی- یان نووسەرەوەکانی- ناوی خۆی نەنووسیوە.

بە خەتێکی (نسخ)ی مامناوەندی نووسراوەتەوە.

لە سەرەتاوە زەخرەفە و جوانکاریی بۆ نەکراوە، لاپەڕەی یەکەمی (سوورەتی فاتیحە) کەمێک دڕاو و لۆچە. ناوی سوورەتەکان و خڕکەییی کۆتاییی ئایەتەکان بە مەرەکەبی سوور نووسراون. لە سووچی سەرەوەی لای چەپیەوە لەسەر لاپەڕەکان ناوی سوورەتەکان نووسراوە.

دوو لاپەڕەی سەرەتای سوورەتی (مریم) واتە نیوەی قورئان بە رەنگی تەلایی و رەش نەخشێنراون و جوانکاریی تێدا کراوە. لەوێیشەوە شێوەی خەتەکە دەگۆڕێت و زیاتر بەرەو (ثلث) دەچێ.

قورئانەکە لەناو پێستێکی چەرمی قاوەیی دوو سێ قاتدا دانراوە، کە کراوە بە بەرگی و پەڕۆی تێ گیراوە.

لە کۆتاییی قورئانەکەوە وەقفنامەیەک هەیە لە چەند ڕووەوە سوود گەیێنە، بۆیە بە دەقەکەی خۆی بێ هیچ دەستکاریکردنێک، جگە لە خاڵبەندی، دەینووسمەوە.

دەقەکە بە خەتی مامۆستا مەلا ئەحمەدی پاشبەردیی بانەییە. ساڵی ١٢٦٩ک ١٨٥٢ز نووسیویەتییەوە، ئەم مامۆستایە یەکێکە لە مامۆستا مەلا ئەحمەدە پاشبەردییەکان کە دەڵێن: شەش پشتیان یەک لە دوای یەک هەر مەلا بوون و ئەحمەدیشیان ناو بووە.[١]

پێنج ساڵ دوای ئەوەیش مامۆستا مەلا محەمەدی کوڕی عەبدولعەزیزی[٢] بانەیی زەردەبەنی، واتە لە ساڵی ١٢٧٤ک ١٨٥٧ز دا هەندێک شتی لە وەقفنامەکە زیاد کردووە، بەتایبەتی باسی ئەوە دەکات کە فەقێ محەمەدی باوکی فەقێ عەلی قورئانێک کە موڵکی خۆی بووە و، دیارە دەستخەتیش بووە، لەسەر فەقێ عەلی کوڕی وەقف دەکات، ئەم قورئان وەقفکردنە ساڵی ١٢٧٤ بووە، بەڵام دیار نییە قورئانەکە ئەم قورئانەیە کە باسی دەکەم و وەقفنامەکەی بە سەرەوە نووسراوە، یان قورئانێکی ترە.

قەباڵەی وەقف (وەقفنامە)[٣]

---

(١) چەندان دەستخەت و شوێنەواری بە نرخی بنەماڵەی پاشبەردی و- بەتایبەتی ئەم مامۆستا مەلا ئەحمەدەیان- لە (م، م)- المركز الوطني للمخطوطات-دا لەنگەریان گرتووە. (بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، بەرگی پێنجەم، ل: ٥٥).

(٢) بەشێکی کەشکۆڵستانیش دەستخەت و شوێنەوار و شیعری ئەم مامۆستایە. (بڕوانە: ئەلبوومی کەشکۆڵ ل: ٣٩، هەروەها بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، بەرگی سێیەم، ل: ٨٨) هەروەها بەرگی هەشتەم ل: ٣٢٩.

(٣) ئەم ناونیشانە خۆم دام نا.

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وآله وصحبه أجمعين.

أما بعد: بر حاكمان اولو العدل وقاضيان ذوى الفضل مخفى وپوشيده نباشد، كه در سنهء يك هزار دويست شصت نو از هجرة حضرت رسالتپناه در نزد چند شهود معتبر القول ومقبول الروايه وموصوف بصفات شهادت، كه اسامى ايشان در حاشيهء قباله مرقومند، فقه محمد پسرى حسن خداداد هرچند رزو املاك وزمين كه عبارتند از (رز آلاى شل) و (كانى بچوك) و (زمين آلاي شل) وخانهء وجاى خانه ودكان... همه را وقف پسرى خود فقه على نام كرده. (وقفا لا تباع ولا توهب ولا تنذر!) وفقه على قبول كرد. بعد ازان فقه محمد أملاك مضفوره وقف اولاد فقه على واولاد اولاد او بطنا بعد بطن الى انقراضهم نمود.

وفقه محمد گفت: هر وقت اولادهاى فقه على نمانند املاكهاى مذكوره وقف از مسجد سياگويز باشد (فمن بدله بعد ما سمعه فإنما إثمه على الذين يبدلونه).

اين چند كلمه قلمى شد تا عند الحاجة بكار آيد. تحريرا في سنة ١٢٦٩ .

جرى ذلك كذلك لدى الحقير أحمد الپاش بردى

مۆرەکەی (عبده أحمد)

الشهود بما فيه: محمد ابن الشيخ عبدالقادر.(٤)

أقر الفقيه الواقف المزبور فى هذا السجل بوقفه الاملاكات المرقومة على ابنه الفقيه على حسبما رقمه العالم العامل الفاضل الكامل مولانا أحمد الپاشبردى.

أنا الحقير الغريب محمد ابن عبدالعزيز الخطيب البانى الزردبنى. حررته حين الاقرار في سنهء الف ومائتين وسبعين واربع من الهجرة المباركة.

وأيضا نذر الفقيه على منافع الاملاكات المسفوره على أبيه الفقيه محمد مدة حياته في التأريخ السابق. والسلام على من اتبع الهدى.

الحقير محمد الخطيب بن الخطيب...

وأيضا وقف الفقيه محمد الواقف السابق كلام الله المصحف المجيد ملكه على ابنه الفقيه على، الموقوف عليه السابق، وعلى اولاده الذكور والفقيه على قبل الوقف.

حررته زمان الوقف سنة ألف ومائتين وسبع واربع.

الحقير محمد الغريب الخطيب البانى ابن عبدالعزيز الخطيب الزردبنى.

لە ناو سێکوچکەی ئەم نووسینەی مامۆستای زەردەبەنیدا شایەتیی مصطەفای کوڕی

---

(٤) ئەم محەمەدی کوڕی عەبدولقادرە رەنگە مامۆستای نووسەرەوەی دەستخەتی کۆمەڵە دانراوی (مەهدی نامە) و (تذكرة العوام) و (بيت الحشر)ی شەوقی و... بێت. (بڕوانە: دەقنامە).

عەبدولقادر هەیە، کە ڕەنگە برای محەمەدی کوڕی عەبدولقادر بێت کە لە سەرەوە بە شاهید نووسراوە. نووسینەکە ئاوایە:

انا حاضر السامع مصطفى ابن عبدالقادر سیاگویزیی.

هەر بۆ تۆکمەکردنی ئەم وەقفە لە ناوەڕاستی قورئانەکەدا لە کۆتاییی سوورەتی (الکهف)ەوە وەقفنامەیەکی کورتی تر لە هەمانساڵدا بە خەتێکی تر نووسراوە، ئەمەیش ئەو دەقەیە:

«بر ناظران شریف پوشیده ومخفی نماند که درینوقت حسن بن خداداد ملك خود که مسما به (یارا آلی شل) می باشد وقف صحیح شرعی نمود بر أولاد ذکور بطنا بعد بطن (لا تباع ولا تؤجر ولا توهب) والشهود بما فیه شیخ محمد وشیخ مصطفی وشیخ قادر وفقی محمد وسواره ومحمود... وسایر جماعت سیاگویزی سنه ١٢٩١»

ئەم دەقەیان بە ناوی (حەسەنی خوداداد)ەوەیە کە دەبێ بە باوکی فەقێ محەمەدی خاوەنی وەقفنامەی پێشوو. مێژووەکەی ورد نووسراوە و دڕاوە، جا ئەگەر وابێ وەک نووسیم (١٢٩١) چۆن دەبێ باوک دوای کوڕ ماڵەکەی وەقف کردبێت. دەگونجێ ئەو مێژووە هەڵەیەکی تێدابێت یان دڕاوییەکە تێکی دابێ.

نووسەرەوەی ئەم خەتە ناوی خۆی نەنووسیوە، بەڵام ئاشکرایە خەتی هیچ کام لە دوو نووسەرەوەی پێشوو- مەلا ئەحمەدی پاشبەردی و محەمەدی کوڕی عەبدولعەزیزی زەردەبەنی- نییە.

## دۆزینەوەی قورئانێکی تری دەستخەتی "محمد الجدید"(*)

### ١٥

ڕۆژی دووشەمەی ٢٠١٠/١/٤ سەر لە بەیانی کەناڵی (العربیة) هەواڵی- لەناو هەواڵەکانی ئەو ڕۆژەیدا- ئەوەی پەخش و پێشان دا کە لە ساڵی ١٩٤٧دا شوانێک لە ئەشکەوتێکدا دەستخەتێکی کۆنی تەوراتی دۆزیوەتەوە، دوایی حکوومەتی ئوردن دەستخەتەکەی لە شوانەکە کڕیوە و بووە بە بەشێک لە دەستخەتی کۆنی ئەو دەوڵەتە و لە مۆزەخانەی خۆیاندا پاراستبوویان.

دواتر کە ئیسرائیل لە شەڕی ساڵی ١٩٦٧دا دەستی گرت بەسەر بەشێک لە خاکی ئوردندا، ئەو دەستخەتە و ئەو مۆزەخانە بەشێک بوون لەوانەی کەوتنە ژێر دەستەڵاتی ئیسرائیل و، ئێستە ئەو دەستخەتە یەکێکە لەو بابەتانەی کێشەی لەسەرە لە نێوان ئوردن و ئیسرائیلدا، ئوردن دەڵێ: بەشێکی جیانەکراوەیە لە میراتی فەرهەنگی ئوردن، ئیسرائیلیش دەڵێ: تەورات کتێبی پیرۆزی ئێمەیە و مافی خۆمانە لەلامان بێ و بیپارێزین و ئوردن چ پێوەندییەکی بەو باسەوە هەیە؟.

هەر ئەو ڕۆژە و سەعاتێک دوای ئەو هەواڵە مامۆستا شێخ عومەری نیزامی بە تەلەفون هەواڵی دۆزینەوەی قورئانێکی دەستخەتی دامێ، کە جگە لە سوپاسی زۆرم بۆ مامۆستا شێخ عومەر کە

---

(*) لە ژمارە (٤١٦)ی ٢٠١٠/٣/٢٧ی هەفتەنامەی کۆمەڵدا بڵاو بووەتەوە.

منی بە یەکەم خەمخۆری ئەو بابەتە زانی و ئەو هەواڵەی پێ دام، هەواڵەکە خۆی جێگەی سرنجە و پوختەکەی لە پێش باسی دەستخەتەکە و باسی (محمد الجدید)ی نووسەرەوەی دەستخەتەکەدا دەخەمە ڕوو:

شێخ ئازادی کوڕی شێخ نەجمەدینی کوڕی مامۆستا شێخ نووری شێخ بابا عەلی تەکیەیی- کە خاڵۆزای مامۆستا شێخ عومەر بوو- پاش نەخۆشییەکی درێژخایەن بەیانیی ڕۆژی ناوبراو کۆچی دوایی کرد. خوای مەزن بە میهرەبانیی خۆی لە گوناهی شێخ ئازاد خۆش بێت و بە بەهەشتی بەرینی خۆی شاد بکا و سەبووریی کەسوکار و خانەوادەکەیشی بدا.

دوای ئەوەی شێخ ئازاد گیانی بە خوای میهرەبان دەسپێرێتەوە، تەرمەکەی دەبەن بۆ مزگەوتی شێخ بابا عەلی، باپیرە گەورەی، تا لەوێ بیشۆرن و نوێژی لەسەر بکەن و خزم و کەسوکاریش کۆ ببنەوە و تەرمەکەی بۆ ئارامگای هەمیشەیی بەڕێ بکەن.

دوای شۆردن و کفنکردنی تەرمەکە لە مزگەوت دای دەنێن و موسڵمانان لە دەوری کۆ دەبنەوە و، هەر یەکەیان- ئەوانەیان قورئانخوێن- دەست دەدەنە قورئانێک تا بە گوێرەی کات و توانا پێش بەڕێکردنی تەرمەکە قورئانی بە سەرەوە بخوێنن.

مامۆستا شێخ عومەریش یەکێک دەبێت لەوانەی کە دەست دەداتە قورئانێک بۆ ئەو مەبەستە. بێ ئەوەی دەست بگێڕێ یان بە هیچ مەبەستێک قورئانێک هەڵبژێرێت، دەست دەبات لە تاقێک لە تاقەکانی مزگەوتدا قورئانێک دادەگرێت. هەر کە دەمی قورئان دەدرێتەوە شتێکی چاوەڕواننەکراو دەبینێ! دەبینێ ئەو قورئانەی دەستی ئەو قورئانێکی دەستخەتی کۆنە و، نموونەیەکی نایابی شوێنەواری مامۆستایەکی دەسترەنگینی کوردە.

مامۆستا شێخ عومەریش- ماڵی ئاوابێت- لە تەک ئەوەی ئەو کۆستەکەوتووەی لە بەردەمدا بووە و، بە دیار تەرمی خاڵۆزای گەنجی کۆچکردوویەوە بووە، ئەو هەواڵەی دوا نەخست و بە منی گەیاند و منیش لە تەک سوپاسی زۆری چەند بارەی مامۆستا شێخ عومەردا- وەک ئەرک و پیشەی هەمیشەییی خۆم- زوو بە دەم هەواڵەکەوە چووم و، ئەم قورئانە دەستخەتەیشم بە کتێبخانەی کوردی و مێژووی خۆشنووسانی کورد ناساند، بەهیوای ئەوەی گەلێ هەواڵی تری ئاوا و لەمە خۆشترمان دەست بکەوێ.

## ئێمەی کورد و شوێنەواری زانایانمان

مەبەستم لە بەستنەوەی هەواڵی دۆزینەوەی قورئانە دەستخەتەکەی مزگەوتی شێخ بابا عەلی بە هەواڵەکەی (العربیة)وە، ئەوە بوو کە ئەوە بۆ چەندەمین جارە بیڵێمەوە: گەلانی جیهان دەمێکە لە کۆکردنەوەی شوێنەوار و کەلەپوور و میراتی فەرهەنگی خۆیان بوونەتەوە و، لە جێگەی باشدا پاراستوونیان و فیهرەست و بیبلیۆگرافیایان بۆ کردوون و، بە گەورەترین سامانی نەتەوایەتیی خۆیانیان دادەنێن و، بە شوێن شتگەلێکیاندا دەگەڕێن کە- بەشێوەیەک لە شێوەکان لەبەر هەر هۆیەک- ئاوارەی وڵاتانی تر بوون، تا بیاندۆزنەوە و بیانگەڕێننەوە بۆ وڵاتی خۆیان و، بۆ ئەم

مەبەستەیش یاسای نێودەوڵەتیی هەیە بۆ دادوەرییکردن لەو کێشانەدا کە لەم ڕووەوە سەر هەڵدەدەن و، ئەو کێشانەیش کەم نین و گەلێ جار لەبارەیانەوە دەبیستین و دەخوێنینەوە.

بەڵام ئێمەی کورد، وەک گەلێ جار نووسیومە، ئەگەر لە ڕووی قەوارەی خۆمانەوە، دەوڵەمەندترین گەلی جیهان نەبین لە ڕووی سامانی کولتووری کەلەپووری- و بە تایبەت- دەستخەتەوە، ئەوە یەکێکین لە گەلە هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهان لەم بارەوە. بەڵام مخابن و سەد مخابن تا ئێستە شوێنێکمان نییە- وەک گەلانی خوا پێداوی جیهان- ئەو گەنجینە و سامانە بەنرخەی تێدا بپارێزین و، وەک گەلانی جیهان ئێمەیش شانازی بە شارستانیەتی خۆمانەوە بکەین و، بە دەوری خۆمان بەشداری زانایانی پێشوومان لە خزمەتکردنی ڕۆشنبیریی جیهانیدا بە جیهان رابگەیەنین.

نەک هەر ئەوە بگرە خەمساردیمان لەم بوارەدا لە ئاستێکدایە تا ئێستەیش هیوای دەرکەوتنی خەمخۆرێکی دەستڕۆیشتوو و بە توانامان لە ئاسۆوە دیار نییە و، هەر بە داخ و کەسەری ئەوەوە دەتلێینەوە کە ڕۆژانە دەبینین بەشانێک لەو سامانەمان یان لە بەین دەچێت، یان بە دەستی نەزانان و ناحەزان و دژ بە کولتوور و مێژوومان ئاودیو و ئاودیواودیو دەکرێن و بەرەو ئاوارەیی و چارەنووسی نادیار دەبرێن.

## قورئانە دەستخەتەکەی مزگەوتی شێخ بابا عەلی

خودی ئەم هەواڵە بەڵگەیەکی گەورە و ڕوونە لەسەر کەمتەرخەمیکردن و بایەخ نەدانمان بەو سامانە. ئەگەر ئێمەیش لەم ڕووەوە لاسایی گەلانی جیهانمان بکردایەتەوە دەبوو ئەو شوێنەوارە و هاوشێوەکانی لە شوێنی قایم و ئەمیندا لە چوارچێوەی زێڕیندا بۆ تەماشاکەران بنوێنرایەن.

داخ و کەسەر زۆرە و ئەمە هەر وەک بیرخستنەوە دەنووسم و لەمە زیاتر لە سەری نارۆم و ئەم هەواڵەیش دەخەمە پاڵ هەواڵی دزرانەوەی قورئانەکەی ئەحمەد ئاوا کە لە ژمارە (٤٠٣)ی ڕۆژی ٢٠٠٩/١٢/٢٦ی هەفتەنامەی کۆمەڵدا بڵاوم کردەوە، بەڵکو ساجارێک بەرچاوی خەمخۆرێک و دڵسۆزێک بکەون و، غیرەتی پارێزکردن لە سامانی نەتەوایەتی لە ناخیاندا بجووڵێنێ و، ئەوەی کە دەبوو دەمێ ساڵ لەمەوبەر لای لێ بکەینەوە، بخرێتە بواری خەم لێخواردن و کۆکردنەوە و بووژاندنەوەوە.

وەک گوتم خودی ئەم هەواڵە بەڵگەی کەمتەرخەمی و بایەخ نەدانمانە بە شوێنەواری زانایانمان؛ چونکە جگە لەوەی ئەم قورئانە دەستخەتە چەند وەختە کەس ئاگای لێی نییە، ئەی ئەو قورئانانەی تر کە ئەم مامۆستا بەڕێزە نووسیونیەوە لە کوێن؟ یان وەک لە وتاری پێشوودا باسیم کرد مامۆستایەکی ترمان ٣٢ قورئانی بە خەتی خۆی نووسیوەتەوە- ڕەنگە زۆر لەو ژمارەیش زیاتری نووسیبێتەوە- ئێمە تەنیا هەواڵی ئەو قورئانەیان دەزانین کە بۆ مامۆستا مەلا نەزیری گەورەی تەوێڵەی نووسیوەتەوە.

ئەمەیش تەنیا لە تەک دەستخەتی قورئاندا نییە، بەڵکو بۆ شوێنەواری هەموو زانایانمان

هەروەها کەمتەرخەمین؛ چونکە کێمان ئاگای لە نوسخەی دەستخەتی دیوانی نالی، یان سالم، یان کوردی، یان وەفایی و...، کێ و کێی تر لە شاعیرانمان هەیە کە بە خەتی خۆیان لە دەستدابن؟ بەبێ دوودڵی و وەستان دەڵێم: کەسمان ئاگامان لە دیوانی کەسیان نییە و، دیوانی کەسیان بە خەتی خۆی شتێکە جێگەی باس نییە. ئەمەیش بۆ شوێنەواری زانا گەورەکانمان هەر هەمان شێوەیە و، مەگەر لە سەدان کەس بە دەگمەن نموونەی خەتی کەسێکیانمان لەلا بێ.

## ئەم قورئانە دەستخەتەی "محمد الجديد"

دوای تەواوبوونی تەعزیەی شێخ ئازاد چووم بە سەردەمی قورئانە دەستخەتەکەوە و، ویستم لە نزیکەوە بە خزمەتی بگەم و، بە وردی لە سەری بنووسم، بەڵام ئەوانەی کە سەرپەرشتی قورئانەکەیان گرتبووە ئەستۆ بە دەنگمەوە نەهاتن و ماوەی بینینی قورئانەکەیان نەدام، وەک بەوەیش رازی نەبوون خۆیان چەند لاپەڕەیەکم بۆ سکان بکەن تا نموونەی لێ بخەمە بەر دیدی خوێنەران. بەوە باش بوو ئەو کاتەی بە قورئانەکەیان زانیبوو چەند کەسێک بە موبایل چەند وێنەیان لەبەر گرتبووەوە، هەرچەند وێنەکان جوان دەرنەچوون، بۆ من سوودی ئەوەیان هەبوو کە ناوی نووسەرەوەی و مێژووی نووسینەوەکەی و هەندێ شتی لێ وەربگرم.

### باسێکی دەستخەتەکە

لە وێنەکانەوە دیارە و- وەک بۆیشیان باس کردم- قورئانەکە باش پارێزراوە و سەرەتا و کۆتایی ماوە و هیچی لێ لەناو نەچووە.

دوو لاپەڕەی سەرەتای قورئانەکە- واتە سوورەتی فاتیحە و لاپەڕەی یەکەمی سوورەتی البقرة- زەڕکەفتکارییەکی زۆر جوان کراوە، رەنگەکانی رەش و سوور و شین و سەوز و پیرۆزەیی و تەڵایی تێدا بەکار هێنراوە. ناوی سوورەتەکان و ژمارەی ئایەتەکان بە مەرەکەبی سوور لەناو جێگەی تەڵایی بۆ ئەوە بڕدراودا نووسراوە.

هەموو لاپەڕەکانی لەناو چوارچێوەی تەڵایی و لە سەرووی ئەوەیشەوە چوارچێوەیەکی شین نراون. نیشانەکانی تەجوید و سەجاوەندیی بە مەرەکەبی سوور جیا کراونەتەوە. کۆتایی ئایەتەکان بە خڕکەییەکی تەڵایی دیاریی کراون. لە کۆتاییەوە دوعایەکی درێژی (ختم القرآن)ی تێدایە، دوای ئەوە مامۆستای نووسەرەوە ناوی خۆی و مێژووی نووسینەوەی قورئانەکەی دیاری کردووە، کە لێرەدا دەقەکەی وەک خۆی و بێ چاککردنی هەڵەی زمانی عەرەبی دەنووسم:

«... وانا الحقير المذنب كثير التقصير، الراجي المحتاج الى عفو الملك الكبير محمد الذي بالجديد معروف وشهير، بن رسول، بن فقه سليمان في قرية عزيز كند، في سنة ١٢٨٩ في شهر ذي القعدة الحرام في يوم الجمعة، وهذا مصحف الثالث والعشرون من المصفحات التي كتبت بيدي. اللهم بحرمة النبي الذي انزلت عليه القرآن ان تغفر لي وترحمني، والحقني بالرفيق الاعلى، وان تغفر لوالدي ولأقاربي ولمن وصاني بالدعاء

ولجميع المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات ولمن يذكرني بدعاء الخير في الحياة وبعد الممات. آمين والحمد لله رب العالمين وصلى الله على خير خلقه محمد وآله واصحابه- اجمعين برحمتك يا ارحم الراحمين»

واتە: منی بێچارە و هەژار و گوناهبار- نووسەرەوەی ئەم قورئانە- نیازمەند و داواکاری لێخۆشبوون لە خوای گەورە و میهرەبان، محەمەدی ناسراو بە (الجدید) کوڕی رەسووڵی کوڕی فەقێ سولەیمان لە گوندی (عەزیزکەند) لە رۆژی جومعەی مانگی ذیلقەعدەی ساڵی ۱۲۸۹دا نووسیمەوە. ئەمەیش قورئانی (۲۳) هەمە لەو قورئانانەی کە بە دەستی خۆم نووسیومنەوە.

**مامۆستا محەمەدی نووسەرەوەی ئەم قورئانە**

بەداخەوە لە ژیان و بەسەرهاتی ئەم مامۆستا خۆشنووسەی کورد- وەک زۆربەی مامۆستایانی ترمان- شتێکی ئەوتۆمان لە دەستدا نییە و سەرچاوەکانمان لە عاستی ژیانی و هونەرە گەورەکەیدا بێدەنگن. خۆشبەختانە ئەوە بوو من پێشتر بە خزمەت قورئانێکی دەستخەتی تری ئەم مامۆستا گەیشتم و هونەرەکەیم بە مێژووی خۆشنووسانی کورد ناساند[1]. کە ئێستەیش ئەم باسە کورتە لەسەر ئەم قورئانە دەنووسم یەک دوو خاڵی ترمان لە ژیانی مامۆستا (محمد الجدید) بۆ روون دەبێتەوە:

یەکەم: قورئانەکەی پێشووی ساڵی ۱۲۸٤ک نووسیوەتەوە. ئەم قورئانەیشی ساڵی ۱۲۸۹ک. نووسیوەتەوە.

دووەم: لەم مێژووەی سەرەوەوە دەردەکەوێ کە ئەم مامۆستا بەرێزە لە نووسینەوەدا زۆر بە دەست و پل بووە، چونکە لە ماوەی (٥) ساڵدا (۷) قورئانی نووسیوەتەوە، کە رەنگە لەو ماوەدا چەند شتی تریشی نووسیبێتەوە، چونکە لە دوای نووسینەوەی قورئانی (١٦)میەوە نووسیویە (۲۰) دەلائیلیشم نووسیوەتەوە.

سێیەم: قورئانی پێشووی لە گوندی (بغدەکندی) لە دەوروبەری تورجان نووسیوەتەوە. ئەم قورئانەیشیانی لە گوندی (عەزیز کندی) هەر لەو دەوروبەرە نووسیوەتەوە.

چوارەم: لەوانەیە ئەم مامۆستا بە تەمەن بووبێت و تەمەنی درێژ بووبێت و، دوای ئەم قورئانەیش قورئانی تریشی نووسیبێتەوە، چونکە بەلای کەمیەوە ساڵی یەک قورئانی نووسیوەتەوە، ئەگەر زیاتری نەنووسیبێتەوە.

لەوانەیشە نووسینەوەی قورئان رێگەیەک بووبێت لە رێگەکانی بژێو پەیداکردنی شەرەفمەندانەی خۆی، چونکە قورئانە شازدەمەکەی لەلایەنی محەمەد ئەمینی دارۆغەی کوڕی ئەبوبەکر ئاغاوە وەقف کراوە، کە دەشێت داوای لە مامۆستا (محمد الجدید) کردبێ تا ئەو قورئانەی بۆ بنووسێتەوە و ئەمیش بۆ خێری خۆی و کەسوکاری وەقفی کردبێ.

---

(۱) بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغی، بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی چوارەم، ل: ۲۲۱

## قورئانە دەستخەتەکەی ئەحمەد ئاوا بچووکترین قورئان لە کوردستاندا(*)

١٧

مێژووی نووسینەوەی قورئانی پیرۆز و ئەو هەوڵ و کۆششانەی لەو پێناوەدا دراون مەیدانێکی بەرینە و، من بزانم تا ئێستە کارێکی وای بۆ نەکراوە سووچێکی ئەو رەنجە و وێنەیەکی ئەو خزمەتە گەورە بە قورئانی پیرۆز کراوە بخرێتە بواری ناساندن و نواندنەوە.

یەکێک لەو نموونانە کە من بە چاوی خۆم دیومە ئەوەیە: لە سەردانێکی کتێبخانەی مەلیک عەبدولعەزیزدا لە شاری مەدینەی پیرۆز لیستی ئەو قورئانە دەستخەتانەیان پێشاندام کە لەو کتێبخانەدا پارێزراون و، دوایی بە خزمەت چەند دانەیەکی جۆراوجۆری زۆر نایابی ئەو قورئانانە گەیشتم.

تەنیا لەو کتێبخانەدا زیاد لە (١٧٨٠) قورئانی دەستخەت هەیە بە گەلێ خەت و شێوەی نووسینی جیا جیا، چونکە لە سەردەمانی پێشوودا، بە درێژایی مێژووی ئیسلام، کەسانی خێرخوا قورئانی دەستخەتیان لە وڵاتانی خۆیانەوە بردووە و کردوویانە بە وەقفی رەوضە و مزگەوتی پێغەمبەر (د. خ) و ئەو دەستخەتانە ئێستە لەوێ پارێزراون.

لە بیرم نییە بچووکترین قورئانی دەستخەتی ئەو کتێبخانە لە چ ئەندازە و پێوانەیەکدا بوو، بەڵام زیارەتی گەورەترین قورئانی دەستخەتیانم کرد کە کێشەکەی (١٥٥) کیلۆگرام بوو.

ئەگەر یەکێک بیەوێ باسی نایابیی ئەو قورئانانە و شێوەی خزمەتی موسڵمانان بۆ قورئان بکا نموونەی نایاب و بێ وێنەی وەها دەبینێ جێگەی سەرسامی و سەرسوڕمانە، هەر بۆ نموونە یەکێک لەو قورئانە دەستخەتانە خۆشنووسێکی ئەیووبیی- کورد- پێش ٢٥٠ ساڵ نووسیویەتییەوە، ئەو مامۆستا کە ئەو قورئانەی نووسیوەتەوە لە کۆتاییەوە نووسیویە: گومان نابەم کەس پێش من کاری وەهای کردبێ، بڕوایش ناکەم کەسی تر بتوانێ کاری وەها بکا.

بە درێژی باسی ئەم قورئانە دەستخەتە ناکەم کە لە شێوەی نووسینەوە و رازاندنەوە و جوانکارییدا کەموێنەیە. تەنیا باسی یەک لایەن لەو لایەنانە دەکەم کە جێگەی سەرنجی تایبەتییە، مامۆستای نووسەرەوەی، کە قازی زادەی ئەیووبییە، دەفەرمووێ: دوای پرس و را و مەشۆرەت بە دۆستان و خۆشەویستانم لە ڕۆژی عاشووورادا دەستم بە نووسینەوەی کرد، لە ڕۆژی لەدایکبوونی پێغەمبەردا (د. خ) شەوی دووشەمەی هەمان ساڵ، واتە لە ٦٢ ڕۆژدا ئەو کارە پیرۆزەم ئەنجام دا.(١)

ئەمە نموونەیەکە لە دەیان نموونەی جێگەی سەرنجی یەک کتێبخانەی جیهانی ئیسلامی، خۆ

---

(*) لە ژمارە (٤٠٢)ی ٢٠٠٩/١٢/٢٦ی هەفتەنامەی کۆمەڵدا بڵاو بووەوە.

(١) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی دەستخەتەکانیانەوە، محەمەد عەلی قەرەداغی، بەرگی هەشتەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٩، ل: ٢٨ .

ئەگەر سرنجی بەشێک لەو کتێبخانانە بدرێت ئەوە نموونەکان ئەوەندە زۆر دەبن- کە هەر یەکەیشیان تایبەتمەندیی خۆی هەیە- خوێنەر دەگاتە ئەو بڕوایە کە تەنیا قورئانە ئەو هەموو خزمەتەی کراوە و، ئەو هەموو توانا و وزانە خۆبەخشانە ئەو کارە شایستانەیان ئەنجام داوە.

من کە زۆر کەم گەڕاوم و وڵاتانی دەرەوەم نەدیوە نازانم چی لە دنیادایە، وەک دەڵێن- بە چاوی موشتەری- سرنجی یەک دوو کتێبخانەی بەغدام- المركز الوطني للمخطوطات و، مكتبة الاوقاف المركزية و، مكتبة الحضرة القادرية- داوە هەر یەکێکیان ئەوەندەی کاری نایاب و جێگەی سرنج تێدایە بەشی کتێبێکی گەورە دەکەن ئەگەر شارەزایەک لەسەریان بنووسێ.

جا ئەگەر بەری ڕەنجی خۆشنووسان و بلیمەتانی جیهانی ئیسلامی- ئەوەی کە ماوە- بەسەر بکرێتەوە و، ئەو خزمەتانەی لە بواری نووسینەوەی قورئانی پیرۆزدا کردوویانن کۆبکرێنەوە و نموونە (زۆر) نایابەکانیان یەک بخرێن و نمایش بکرێن و دەست و چاوی موسڵمانان و غەیری موسڵمانان بیانگاتێ و بیانبینێ، ئەوسا دەزانرێت خوای مەزن چی بۆ ئەو قورئانە پیرۆزە کردووە و چ کەسانێکی بۆ خزمەتکردنی ڕەخساندووە.

**من لێرەدا ئاواتی ئەوە دەخوازم:**

خۆزگە سایتێکی جیهانی بۆ قورئانی پیرۆز دەکرایەوە و، بەروبوومی ڕەنجی سەدان ساڵەی بلیمەتانی گەلانی موسڵمان لە بواری نووسینەوەی قورئانی پیرۆز و نواندنی هونەری جۆراوجۆر لەو کارەدای تێدا نمایش دەکرا و، ئەو سایتە ئازاد و بێ ماف و مزد دەبوو.

لەم خاڵەوە دەگەڕێمەوە بۆ لای ئەو مەبەستەی کە ئەم وتارە کورتەم بۆ ئامادە کردووە، ئەویش ناساندنی کارێکی نایابی سەربازێکی نەناسراوی لە بواری نووسینەوەی قورئانی پیرۆزدا بەجۆرێکی سرنجڕاکیش. بەڵام دووبارە وەک بیرخستنەوەی خزمەتی بلیمەتانی گەلی کورد بە قورئانی پیرۆز ناوی چەند کەسێکیان دەکەم بە دەستپێکی ئەم بابەتە، دەبێ ئەوەیش بڵێم: مەبەستم هەموو ئەو قورئانانە نییە کە لە کوردستاندا یان خۆشنووسانی کورد نووسیونیانەوە، بگرە تەنیا نموونە لە وردەکاریی نایاب دێنمەوە:

١- یەکێک لەو بلیمەتانەی گەلی کورد- کە من ناویم لە یەکەمەکانی جیهاندا دانا-[٢] مامۆستا محەمەد تاهیری کوردیی خۆشنووسی شاری مەکەی پیرۆز و جیهانی ئیسلامە. کارە ورد و پڕ بایەخەکانی ئەم مامۆستا ئەوەندە نایاب و جێگەی سرنجن لەوانەیە کە بە چاوی خۆیشت بیانبینی هێشتا بڕوا نەکەیت. بۆ نموونە:

أ- لەسەر هێلکەیەکی مریشک دوای ئەوەی خاڵیی کراوەتەوە جزمی (عم)ی، چەند سوورەتێکی کەمی نەبێ، نووسیوەتەوە.

ب- لەسەر یەک دەنکە گەنم ئەم ئایەتانەی نووسیوە:

---

(٢) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل: ٣٧٣ .

«ان المتقين في جنات وعيون، ادخلوها بسلام آمنين، ونزعنا ما في صدورهم من غل اخوانا على سرر متقابلين».

ج- لەسەر دەنکە گەنمێکی تر نووسیویە:

«واوحى ربك الى النحل ان اتخذي من الجبال بيوتا ومن الشجر ومما يعرشون، ثم كلي من كل الثمرات فاسلكي سبل ربك ذللا. يخرج من بطونها شراب مختلف ألوانه فيه شفاء للناس، إن في ذلك لآية لقوم يتفكرون».

د- لەسەر دەنکە گەنمێکی تر سوورەتی (لايلاف قريش) و سوورەتی (قل هو الله أحد)ی لە تەک (بسم الله الرحمن الرحيم)ی هەردووکیاندا نووسیوە.[٣]

من خۆم بە خزمەت دوو دەنک برنج گەیشتووم کە لە (المركز الوطني للمخطوطات) لە بەغدا پارێزراون، لەسەر هەر یەکێکیان سوورەتێکی تەواوی قورئانی پیرۆزی نووسیوە.

جگە لەمانە دەیان شاکاری کەموێنەی لێ بەجێ ماوە.

٢- خۆشنووسێکی ترمان مامۆستا مەلا ئیبراهیمی (مووری)یە کە قورئانێکی نووسیوەتەوە بە لێوردبوونەوەیەکی کەمێک بە سرنجەوە دەردەکەوێت ئەوە جگە لە (اعجاز)ی قورئان شتێکی تری نییە و، ئەم نووسەرەوە و خۆشنووسە ئەو یادگارەی بەو ئیعجازە دوای خۆی بەجێ هێشتووە، دیارە ئەم شێوە نووسینەوەی قورئانی پیرۆزە- لە تەک شێوەکانی تردا- لە کوردستاندا باو بووە و من لە خزمەتی دوو پەڕەی تردام کە هەر یەکێکیان پاشماوەی قورئانێکی دەستخەتی نایابی خۆشنووسێکی کوردە کە ئەو شێوە ئیعجازەیان تێدا نواندووە.[٤]

٣- هەر لەو بوارانەدا کە خۆشنووسان و زانایانی کورد خزمەتیان بە قورئانی پیرۆز کردووە خۆشنووسی وامان هەبووە دەیان جار قورئانی پیرۆزی بە خەتی خۆی نووسیوەتەوە، لەوانە بە خزمەت قورئانێک گەیشتم کە مامۆستایەک بۆ مامۆستا مەلا نەزیری گەورەی تەوێڵەی نووسیوەتەوە، لە کۆتاییەوە نووسیویە: ئەمە (٣٢)یەمین قورئانە نووسیومەتەوە.[٥]

٤- هەروەها (محمد جديد) لە کۆتاییی قورئانێکی دەستخەتییەوە دەڵێ: ئەمە شازدەمین قورئانە نووسیومەتەوە.[٦]

٥- لە خزمەتی قورئانێکی دەستخەتی خۆشنووسی گەورەی کورد مامۆستا شێخ محەمەدی شێخ یووسفدام لە کۆتاییەوە دەفەرمووێ: ئەمە یازدەمین قورئانە نووسیومەتەوە.[٧]

---

(٣) بڕوانە: في رحاب أقلام وشخصيات كردية، محمد علي القرداغي، بنکەی ژین، ٢٠٠٧، ل: ٩٧

(٤) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، بەرگی دووەم، ل: ٢٤٤ .

(٥) بە یارمەتی خوا لە بەرگی نۆیەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایاندا- کە ئێستە لە ژێر چاپدایە- بڵاو دەبێتەوە.

(٦) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، بەرگی چوارەم، ل: ٢٢١ .

(٧) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، بەرگی حەوتەم، ل: ٣٧ .

ئەم ڕێگە خۆشکردنەم بۆ ئەوە کرد هەواڵی دۆزرانەوەی قورئانێکی دەستخەتی نایاب بخەمە پاڵ ئەو هەواڵانەی تر کە لەم بوارانەدا ڕادەگەیەنرێن[8].

## پوختەی هەواڵەکە ئاوایە

بنەماڵەی وەستا فەرەج لە گوندی ئەحمەد ئاوا پشتاوپشت لە باپیرانیانەوە قورئانێکی دەستخەتیان بۆ ماوەتەوە.

وەک دەگێڕنەوە قورئانەکە بۆ پیرۆزی و تەبەڕوک- نەک بۆ خوێندن و دەور تێداکردنەوە- سوودی لێ وەرگیراوە، وا باو بووە کە هەر کەسێک نەخۆش بووبێت و نەخۆشییەکەی درێژەی کێشابێ وتوویانە: بچن دوعاکەی- قورئانەکە-ی ماڵ وەستا فەرەجی بۆ بهێنن.[9]

ئەم قورئانە لەناو سێ پێستی یەک لەناو یەکدا وەک جانتای بە تەڵی پێست دووراو پارێزراوە.

---

(٨) وەستا فەرەجی ئاسنگەر کە قورئانە دەستخەتەکە ئێستە لەلای نەوەکانی ئەو پارێزراوە. لە دەوروبەری ساڵی ١٨٩٠ز. دا لە گوندی دزڵی لەدایک بووە. ئەم بنەماڵە پێشتر لە پاوەدا بوون و بە بنەماڵەی (شەفیعی) بەناوبانگن.

حاجی وەستا فەرەج بەشداریی چەکداریی لە تەک شێخ مەحموودا لە بزووتنەوەکانیدا کردووە. هەروەها لە تەک مەحموود خانی دزڵیدا ڕووبەڕووی دەستەڵاتی پەهلەوی بووەتەوە. دوای ئەو ڕووبەڕووبوونەوە و شەڕێکی سەخت بنەماڵەکەی لە دزڵی هەڵکەنراون و ڕوویان کردووەتە ئەحمەد ئاوا و بە یەکجاری لەوێ نیشتەجێ بوون.

حاجی وەستا فەرەج پیاوێکی دەسترەنگین و سنعەتکار بووە و، بە بەری ڕەنجی خۆیشی دەستەڵاتدار و خاوەن سامان بووە. بەو ماڵ و سامانەی کە بوویەتی یارمەتیی خەڵکی داوە و نانبدە و دەست و چاو تێر بووە.

وەستا فەرەج ساڵی ١٩٥٦ سەردانی ماڵی خوای کردووە و فەریزەی حەجی بەجێ هێناوە. ساڵی ١٩٦٤ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی بیلال لە ئەحمەد ئاوا بە خاک سپێرراوە.

دەگێڕنەوە حاجی فەرەج زۆرجار ئەو کیفەی قورئانەکەی تێدا بووە لای خۆی و لە گیرفانیدا هەڵی گرتووە.

(ئەم زانیارییانەم لە کاک عەبدورەحیمی کوڕەزای حاجی فەرەج وەرگرت، لە تەک ئەوەدا قورئانە دەستخەتەکەیشی بۆ هێنام زیارەتیم کرد و ئەو زانیارییانەی سەرەوە کە لەبارەی قورئانەکەوە نووسیمن لێیم وەرگرت).

(٩) تەبەڕوک بە قورئان و کتێبخانە لە کوردستاندا کۆنە و نموونەیشی کەم نییە. من خێزانم کچی مامۆستا شێخ جەمیلی موفتییە و لە نەوەی شێخ عەبدوڵلای خەرپانین، لە ساڵانی ١٩٧٠وە لە تەک ئەو بنەماڵەدا تێکەڵاویم هەیە بەتایبەتیی لە تەک کتێبخانەی شێخ عەبدوڵلادا ئاشنایەتیم پەیدا کردووە و یەکەم بەرهەمی نووسینیشم لەسەر دەستخەتەکانی ئەو کتێبخانە بوو. ئەو کتێبخانە نیمچە عەیادەیەک بوو بۆ نەخۆشانی هەڵەبجە و دەوروبەری و، گەلێ جار دیوەمە شێت و نەخۆشیان دەهێنا دەیانبردن لە ژووری دەستخەتەکاندا دایان دەنان و دوای ماوەیەک دەیانبردنەوە و بە زۆریش چاک دەبوونەوە.

دوای ساڵانی ١٩٧٩ و وێرانکردنی ئەو گوندانە بە بۆنەی شەڕی عێراق- ئێران و سیاسەتی چەپەڵی ڕێژیمی بەعسەوە، بنەماڵەی وەستا فەرەجیش وەک ئەو هەموو خەڵکەی تر لە زێدی خۆیان هەڵدەکەنرێن و گوندە کاولکراوەکەیان بەجێ دێڵن و ئاوارە دەبن.

دوای رووخانی ڕێژیمی بەعس و گەڕانەوەی خەڵک بۆ سەر زێدی باو و باپیرانیان ئەمانیش دەگەڕێنەوە بۆ گوندی ئەحمەد ئاوا. ئیتر ئەمانیش وەک دەڵێن: سەردەرکە ماڵ دەبێتەوە. ڕەنگە کاتێ گوندەکە وێران کراوە بە جۆرێ رایان کردبێ سەر گەلێ شتیان نەپەرژابێت و، یەکێک لەو شتانەی فریای دەرکردنی نەکەوتوون ئەو قورئانە دەستخەتە بووبێت و ئیتر دوایی هەر لە بیریان چووبێتەوە.

دوای ڕاپەڕین و دوای کشانەوەی دەستە و دایەرەی بەعسیش کە خەڵک گەڕاونەتەوە بۆ سەر گوندەکانیان نەوەی وەستا فەرەج دەستەلاتی ئەوەیان نەبووە هەموو کەلاوەکان تێک بدەن و سەرلەنوێ خانووەکانیان دروست بکەنەوە و، لە سەرەتاوە ئەوەندەیان لەو خانووانە کردووەتەوە کە جێگەی خۆیانی تێدا بکەنەوە، تا ئەمساڵ-٢٠٠٩- لە مانگی (١١)دا کاک عەبدورەحمانی کوڕی وەستا حەمە سەعید ویستوویەتی لە نزیکی خانووەکەی ماڵی باپیریەوە- دیارە شوێنەکە کەلاوە بووە- خانوویەک بۆ خۆی دروست بکا. لە کاتی تێکدانی کەلاوەکە و دەرهێنانی دار و پەردووی کۆندا کیسەیەک، یان توورەکەیەک دەرکەوتووە، ئەویش لە سەرەتاوە هیچ بایەخیکی پێ نەداوە و بە شرووپڕەی کۆنی زانیوە، دوایی دەستی داوەتێ بزانێ چی تێدایە و چییە، کە کردوویەتییەوە جزدانێک یان جانتایەکی پێست دەرکەوتووە، جزدانەکەی کردووەتەوە تەماشا دەکات جزدانێکی تری لەناودایە، ئەو جزدانەیشی کردووەتەوە دەبینێ شتێکی بچکۆلەی نووسراوی تێدایە کە دەبێتە کرۆکی ئەم هەواڵە.

دەبێ من لێرەدا ئەوە بنووسم کە ئەو ساڵەهای ساڵە ئەو جزدانە پێستە وەک شتێکی پیرۆز و مایەی شیفای نەخۆشی ماڵە و ماڵی پێ کراوە و، ئەم نەخۆشە و نەخۆش براوە و هێنراوەتەوە، کەس نەیکردووەتەوە و تەماشای ناوەکەیان نەکردووە، چ جای ئەوەی وەک قورئان دەوری تێدا بکرێتەوە یان تێیدا بخوێنرێ، چونکە قورئانەکە ئەوەندە ناسکە و پەڕەکانی ئەوەندە تەنکن کەسی زۆر شارەزا و لەسەرخۆ نەبێت کە زۆر بە پارێزەوە دەستی بداتێ و پەڕەی هەڵداتەوە بە دوو سێ جار کردنەوە لە بەین دەچێت. کەچی ئەم قورئانە جگە لەوەی (٣٠) سی ساڵ لە شوێنێکی کوێستان و تەڕ و بەفراویدا لەناو کەلاوە و لەژێر دار و پەردوودا بووە، ئێستەیش حاڵەتی پەڕە و پێست و بەرگ و پارێزراویی زۆر باشە.

ئەوەی جێگەی باسە لێرەدا ئەوەیە: من بە حوکمی کارکردنم لە تەک دەستخەتدا و گەڕان و هەوڵدانم بۆ ئەوەی بەروبوومی ڕەنجی خۆشنووسانی کورد لە ڕێگەی نووسینەوەی قورئانی پیرۆزدا بزانم و بیاندۆزمەوە، بە خزمەت گەلێ قورئانی جۆراوجۆر گەیشتووم و، لە بەرگەکانی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کوردا باسی زۆریانم کردووە و، لە خزمەتی چەند دەستخەتی جۆراوجۆری گەورە و بچووکی قورئانی پیرۆزیشدام، بەڵام ئەم قورئانە دەستخەتە یەکەمین قورئانە

بەو حەجم و کێش و قەوارە لە بچووکیدا بە خزمەتی بگەم.

ئەوەی لێرەدا دەمەوێ بە سەریدا نەڕۆم ئەوەیە بیستوومە لە بەغدا لە (المركز الوطني للمخطوطات)دا قورئانێکی دەستخەتی زۆر بچووک هەیە، بەڵام من بە خزمەتی نەگەیشتبووم. بۆ ئەم مەبەستە بە تەلەفوون پێوەندیم بە بەڕێوەبەری گشتیی ئەو شوێنەوە کرد هەواڵەکەی تەئکید کردەوە و وتی: ئەو دەستخەتەی لای ئەوان لەسەر پێستی مار نووسراوەتەوە و هەشت گۆشەیە و قوطرەکەی یەک ئینجە و، مێژووی نووسینەوەی دیار نییە.

**باسێکی دەستخەتەکە**

ئەم قورئانە بەپێچەوانەی زۆربەی قورئانی دەستخەتەوە، کە یان لە شێوەی چوارگۆشە یان لاکێشی (موستەطیل) دان، لە شێوەیەکی خڕی هەشتگۆشەییدا نووسراوەتەوە و لە شێوەی قەوارەی (٢٥٠) فلسییەکی ئاسنی ئەوسادایە. لە پێنج سەنتیمەتر بە پێنج سەنتیمەتردا نووسراوەتەوە. مێژووی نووسینەوە و ناوی نووسەرەوەی پێوە نییە، گومان بۆ ئەوە دەچێت ئەوانە لە لاپەڕەیەکدا بن کە کەوتبێ.

لاپەڕەکانی سەرەتا و کۆتایی بە ڕەنگی گوڵ و گەڵای جوان و ئاوی تەڵا زەڕکەفتکاری کراون. لاپەڕەکان بە جۆگەلەی ئاوی تەڵا قەراخ گیراون. دێرەکانی هەموو خراونەتە ناو جۆگەلەی تەڵاییەوە. لە ناوەوە لە چەند شوێنیدا هەڵە و لەبیرچوون هەیە بە خەتێکی تر ئەو هەڵانە چاک کراون.

قورئانەکە بە خەتێکی (نسخ)ی جوان نووسراوەتەوە. کاغەزەکەی زۆر تەنکە و وەک کاغەزی سیغار و تەنکتریش وایە. کۆتاییی ئایەتەکانی. جیا کراونەتەوە. ناونیشانی سوورەتەکان بە مەرەکەبی سوور نووسراوە.

پێوانەی قورئانەکە وەک وتم (٥) پێنج سەنتیمەترە و قلختکەیشی (سمک) و ئەستوورییەکەی نزیکی پێنج سەنتیمەترە. (٢٤٠) لاپەڕەیە.

بەرگێکی پێستی قاوەیی هەیە، جزوبەندەکەی لە ناوەڕاستدا پساوە. سەرەتا و کۆتاییی ماوە.

لە ناوەوە لە چەند شوێنیدا کون هەیە وەک ئەوە وایە مۆرانە لێی دابێ. گومان بۆ ئەوە دەچێ کۆتاییەکەی تێدا چووبێت و کەسێکی تر تەواو و نوێی کردبێتەوە.

**شێخ حەیدەری کوڕی شێخ عەلی تەوێڵەیی خۆشنووسێکی تری کورد**

**١٨**

یەکێکی تر لە و خۆشنووسە کوردانە- لەگەڵ ئەوەدا کە ماوەیەکی زۆر نییە کۆچی دوایی کردووە- کە شوێنەوارەکانی تێدا چوون و هەواڵێکی ئەوتۆمان لێیان نییە، مامۆستا شێخ حەیدەری تەوێڵەییە کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریم پوختەیەکی ژیانی تۆمار کردووە.

لەسەر لاپەڕەی یەکەمی نووسراوە:

«الأدلة الواضحة على المثالب الفاضحة، لمولانا العلامة الشيخ علي سنجاري، شكر الله سعيه الجميل».

وێنەی لاپەڕەی کۆتاییم لە دەستدا نییە.

٢٢٤ لاپەڕەیە.

دانراوێکی تری مامۆستای مەلا عەلی تاجەدینی سنجاری

هەر لە (مكتبة الحرم المكي الشريف)دا دانراوێکی تری ئەم مامۆستا هەیە بە ناوی:

(منايح الكرم في أخبار مكة والبيت وولاة الحرم). ئەم دەستخەتە بە ژمارە (٣٩٠٤) (خاص) و بە ژمارەکانی (٣٥٣٥- ٣٥٣٧) عام پارێزراوە. کتێبەکە سێ بەرگە.

لە سەرەتای ئەم دەستخەتەوە لەبارەی نووسراوە:

ناوی عەلی کوڕی تاجەدینی کوڕی تەقیەدینی سنجاریی حەنەفیی مەکییە، ئیمام و خەتیبی (البلد الحرام) بووە. ساڵی ١١٢٥ کۆچی دوایی کردووە، شێخ مستەفای نەحاسی شاعیری میصر دەربارەی کۆچی دوایی ئەم مامۆستا وتوویە:

لما قضى المولى المفضل نحبه
وسرى وصار مجاور الغفار
أرخت: بالله هب ولك البقاء
وارحم فناء على السنجاري

سەرەتاکەی:

«الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد خاتم النبيين وعلى آله وصحبه أجمعين. أما بعد: فهذه زبدة من منايح الأخبار، ونبذة من روايح العلماء الأخيار. التقطتها».

**روضة المريدين في آداب الصوفية**

ئەم کتێبە دانراوی مامۆستا خەلیلی قادری کەرکووکییە.

لە (مكتبة الحرم المكي الشريف)دا پارێزراوە و هیچ سەرچاوەیەکم نەدی باسی ئەم مامۆستای کردبێت.

دەستخەتەکە ٧٦ لاپەڕەیە. سەرەتاکەی ئاوایە:

«هذا كتاب روضة المريدين في آداب الصوفية وأحكامهم وطريقتهم وأحوالهم وأخلاقهم. وفي ترتيب تلقين الذكر وإعطاء البيعة والإلباس، وسلسلة أهل التوحيد. تأليف شيخنا المرشد الكامل السيد خليل القادري الكركوكي- رحمه الله ونفعنا به».

دوای ئەم ناونیشانە و دوای لاپەڕەیەک لە سەرەتای دانراوەکە زنجیرەی ئیجازەی شێخانی

تەریقەتی قادری دێت و تێیدا ئیجازە دەدرێت بە حاجی محەمەد عەبدوسەتاری کوڕی عەبدولوەهابی حەنەفی، ئەو کەسەی کە ئیجازەکەی داوە بە حاجی محەمەد عەبدوسەتار دەڵێ: ئیجازەم لە شێخ عەبدولڕەحمانی کەرکووکی وەرگرتووە، ئەویش لە شێخ ئەحمەدی تاڵەبانی باوکی، ئەویش لە شێخ مەحموودی کوردستانی، ئەویش لە شێخ ئەحمەدی هیندیی لاهووری، ئەویش لە شێخ محەمەد حسەینی ئەزمیرانی، ئەویش لە شێخ محەمەد مەعسوومی مەدەنی... بەو شێوە دەستاو دەست تا شێخ یەحیای بەسری و، شێخ عوسمانی جەلیلی و، شێخ عەبدولڕەزاقی کوڕی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و، ئەویش لە باوکی، تا دەستاو دەست دەگاتە خزمەتی حەزرەتی (محمد المصطفى) - صلى الله عليه وسلم-..

دەستخەتەکە دوای باسکردنی هەندێ ڕێبازی تەریقەت و فەرمایشتی پێغەمبەر (د. خ) و هەندێ شتی پێوەندیدار بەو باتەوە، تا لاپەڕە (٣٨) واتە لاپەڕە (٧٦) دەڕوات، من وێنەی هەموو دەستخەتەکەم لا نییە، بەڵام لەو ئەندازەدا کە لای منە جگە لەو ناوی سەرەتایە ناوی شێخ خەلیلی کەرکووکی نابینرێ.

١٠٢٥- ئەم ژمارەیە بۆ دەستخەتێک دانراوە کە وێنەی چوار لاپەڕەی لای من هەیە، لە سەرەتاوە فیهرەستی بۆ کراوە بەم شێوە:

١- ثبت أحمد بن عبداللطيف

٢- الإمداد في علو الإسناد

٣- مناقب سالم بن عبدالله سالم البصري.

٤- سند من عابدين محمدأمين.

٥- ثبت محمد أبوطاهر بن إبراهيم الكردي. وفيه إجازة السيد أحمد محمد مقبول الأهدل.

٦- ثبت إبراهيم بن محمد الزمزمي. كما في السجل.

ئەو چەند لاپەڕەی وێنەکەیانم لایە خەتەکانیان جیاوازە. لە کۆتاییی لاپەڕەکانی ٩، ١٠ەوە [کە لە سەرەوەیشی ١٢٤، ١٢٥ نووسراوە] نووسراوە:

«...نفعه الله بالعلم وجعله من أهله، قال ذلك نجلاء كتبه وجلا العبد الفقير المعترف بالتقصير، محمد أبوطاهر بن إبراهيم الكردي، المدني المولد والمنشأ الشافعي، غفر الله له ولوالديه وأحسن إليهما واليه، سائلا من المجاز أن لا ينساني وذريتي من صالح دعوات تنتج حسن الختام، والفوز بالجنة وجواره في دار السلام. آمين. وفرغت من كتابتها عصر يوم الخميس المبارك ٢٦رجب الفرد١١٥٣بمنزلي بظاهر المدينة المنورة، على مشرفها أفضل الصلاة وأزكى التحيات بكرة وعشية آمين.».

(ئەم مامۆستا خاوەنی کتێبی (منتخب كنز العمال)ە کە باسی دەستخەتی دانراوەکەیم لە بەرگی چوارەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایاندا کردووە[1].

---

(١) بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ل: ٢٦٠ .

ئەم دەستخەتە کۆمەڵێک دانراوی تێدایە، لەسەر لاپەڕەی یەکەمی بەم شێوە ناونیشانیان نووسراوە:

فهرس المجموعه ١٠٤

١- رسالة في التوحيد- خالد النقشبندي.

٢-رسالة عن الطريقة النقشبندية - خالد النقشبندي

٣- آداب الذكر - خالد النقشبندي

٤- سلسلة - خالد النقشبندي

٥- رسالة الشيخ مصطفى مستقيم نيازي- أعجمية.

٦- رسالة أخرى بالأعجمية.

سەرەتای دانراوی یەکەم ئاوایە:

«الحمدلله فاطر السماوات والأرض وخالق العباد وما يعملون، الذي إذا أراد شيئاً أن يقول له كن فيكون.».

کۆتاییەکەی:

«إقتصر الخيالي منها على عدم جريان بعض الأدلة فيما سواه، الحمدلله رب العالمين.

اثر خامهء أضعف العباد إبراهيم النقشبندي الخالدي».

دانراوی دووەم:

«الحمدلله وسلام على عباده الذين اصطفى، من العبد الفقير المستهام خالد النقشبندي المتمسك باتباع سنة خير الأنام...».

کۆتاییەکەی:

«وصلى الله على سيدنا أفضل الانام، وعلى آله وأصحابه الكرام، أضعف العباد خالد النقشبندي القادري المجددي. ٢٦ / - / ١٢٣٨».

نامیلکەی سێیەم:

سەرەتاکەی:

«الحمدلله وكفى، والسلام على عباده الذين اصطفى. أما بعد: فهذه فائدة في بيان آداب الذكر وغيره عن السادات النقشبندية- قدس أسرارهم العلية-».

کۆتاییەکەی:

«قال الجنيد: إذا رأيت الصوفي ولم يكن على يمينه التفسير، وعلى يساره الفقه، وعلى قدامه الحديث فإنه لص الشيطان. من لبس الصوف على الصفا، ورمى الدنيا وراء القفا، وطعم نفسه طعم

الجفا، فهو على شريعة المصطفى».

أثر خامهء إبراهيم القريمي غفرالله له ولوالديه وأحسن اليهما. سنة ١٢٤٢».

ناميلكەی چوارەم.

سەرەتاکەی:

«سلسلهء خواجگان - قدس الله تعالى أسرارهم. بسم الله الرحمن الرحيم.

اللهم يا حي يا قيوم يا بديع السموات والأرض، ويا مالك الملك، ويا ذا الجلال والإكرام. إني أسألك بمحبوبية قطب الإرشاد السائر في الله الراكع الساجد ذي الجناحين. حضرة ضياءالدين مولانا خالد- قدس سره-».

کۆتاییيەکەی:

«ولا تعاملنا بالعدل، وتتوب علينا توبة نصوحاً، وترزقنا العافية في الدنيا والآخرة، ووالدينا والمؤمنين والمؤمنات، إنك قريب مجيب الدعوات، وصلى الله على سيدنا محمد المبعوث رحمة للعالمين، وعلى آله وصحبه أجمعين».

ص: ٥٢

**منتخبات شهنامه**

ئەم دەستخەتەیش یەکێکە لە دەستخەتەکانی کتێبخانەی (الحرم المكي الشريف)، ئەو ناونیشانەی لەسەر نووسراوە. بەڵام ناوەڕۆکی دەستخەتەکە کە شیعری فارسییە لەوە ناچێت (هەڵبژاردەی شانامە) بێت، بگرە لەوە دەچێت دانراوێک بێت بە شیعر لە پەند و ئامۆژگاریدا، ئەمەیش هەندێک لەسەر باس و ناونیشانەکانی ناو دەستخەتەکە:

باب یکم در توحید باری عز اسمه

باب دوم در نعت نبی علیه السلام

باب سوم در بحث چهار یار گزین

باب چهارم در تضرع مناجات

باب پنجم در دعا و نیاز

باب ششم در ستایش خرد و دانش

باب دوازدهم در صدق و راستی

باب بست سوم در اظهار حال دردمندی

باب سی و پنجم در صفت محبوب

باب سی و ششم در صفت رستم جنگ او

باب سی و نهم در نصح و پند

باب چلم ابیات شتی

بەم چل بابەیش دانراوەکە تەواو دەبێت.

لە کۆتاییشیەوە نووسراوە:

کتبه الفقير الحقير المذنب الحاج شيخ محمود أفندي برزنجي زاده غفرالله تعالى على والدين ولى أستاذيه تمت.

## الرياض الأنيقة في بعض مناقب الصديقة

ئەم کتێبە دانراوی (أبو القاسم ابن إبراهيم ابن قاسم ابن حيدر ابن رسول البرزنجي)یە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

«المنة لمن فتق رتق الوجود برمته من نوره الأسنى، وشق ينابيع المضوعات بضرب تجلي أسمائه الحسنى، وتقدس فياضا امتن بواسع جوده الباهر لإظهارهم من سرحة الغيوب لأنور المسالك.».

کۆتاییەکەی:

«واغفر اللهم لجامع هذه الرياض الأزهرية، والطف به عند حلول سهام المنية، وكذا والديه والأصحاب والذرية، ما أصغت أذن لسما ع ذكر الكمل الأعلام، وفاز محب بركوب جواد البدء والختام».

لەسەر لاپەڕەی یەکەمیشی نووسراوە:

«الرياض الأنيقة في بعض مناقب الصديقة، لمولانا السيد الأجل الراجي عفو ربه الكريم المنجي، أبو القاسم ابن إبراهيم إبن القاسم إبن حيدر إبن رسول البرزنجي، غفرالله له ولوالديه، وجعله من كمل المحبوبين لديه. آمين آمين، تمت.».

دەستخەتەکە دوازدە لاپەڕەیە.

### مجموعة رسائل نفيسة

ئەم دەستخەتەیش ئەو ناونیشانەی سەرەوەی بۆ دانراوە. ئەو کۆمەڵە نامە و دانراوەیش کە لە دەستخەتەکەدان ئەمانەن:

١- مجموعة رسالة نفيسة أبو السعود. بە تورکی ٢٤پەڕەیە.

٢- رسالة دعاء مجربات شيخ شهاب الدين السهروردي بە زمانی عەرەبیی ٩پەڕەیە.

٣- هذا كتاب جزري. هۆنراوەیەکە لە تەجویددا. ئەمەیش ٦پەڕەیە. محەمەد عەلی ساڵی ١٠٥٣ نووسیویەتییەوە.

٤- دوای ئەو نامیلکەیە لە باسی (علوم القرآن)دا. لە پەڕەی پەنجادا بێ ئەوەی ئەم تەواو بێت هۆنراوەیەکی تر دێت و دوای ئەوە وەک کەشکۆڵ کۆمەڵێک شیعر دێت، لە پەڕەی ٥٨دا تەواو دەبێ. شیعری شێخی سەعدی و چەند شاعیری تری تێدایە.

إفاضة الأنوار على أصول المنار

دانراوی (علاء الدين الحصكفي) (م ١٠٨٨ك)، (٦٥ پەڕە)، (١٤٩٦/٢٠٥٤).

سەرەتاکەی:

«حمداً لك يا من نورت منار الشرع الشريف بكتابك المعجز المنيف، وصلاة وسلاماً على من خصصته بكل كمال وتشريف. وعلى آله وصحبه ما نعت بأما بعد في كل تأليف. فيقول المفتقر إلى ذي اللطف الخفي محمد علاء الدين بن علي بن الحصكفي، المفتي بدمشق الشام الحنفي..»

کۆتاییەکەی:

«قد وقع بلطف الله تعالى الفراغ من تأليف هذا الشرح المختصر المسمى بافاضة الأنوار على أصول المنار، على يد جامعه علاء الدين بن علي الأمام بجامع بني أمية بدمشق المحمية، بعد أذان الثلث بمنارة الجامع المزبور ليلة الجمعة أواسط شهر ذي الحجة الحرام، سنة أربع وخمسين وألف، وكنت شرعت فيه أوايل شهر ذي القعدة تلك السنة، فكانت مدة تأليفه مدة المواعدة بلا ريب، وذلك بفضل الله يؤتيه من يشاء، وعنده مفاتح الغيب...»

## إجازه الحافظ العراقى لأبن حجر

وێنەی دوو لاپەڕەیم لایە لە سەرەتای لاپەڕەیەکیانەوە نووسراوە:

«وجدت في آخر الأربعين العشارية ما نصه:

قرأت جميع هذه الأربعين العشارية، تخريج الحافظ زين الدين العراقي على شيخنا الإمام الأوحد المحدث المتقن الضابط المفيد، أبو عبدالله محمد الحجازي الشعراني الشافعي الواعظ، بمجالس بجامع المؤيد بمصر المحروسة، وأجازني بكل مروياته بحق إجازته بالأربعين المذكورة عن عدة مشايخ منهم الشهاب ابن يشبك...».

لە سەرەتای لاپەڕەکەی تریشەوە نووسراوە:

«العشاريات لأبن حجر العسقلاني.

يقول راجي العفو والرضا محمد مرتضى الحسيني الزبيدي- رحمه الله تعالى-: أروى العشاريات عن شيخنا أبي عبدالله محمد بن الطيب وعبدالخالق بن أبي بكر، كلاهما عن أبي الأسرار...». بەم شێوە رشتەکەی دەڕوات تا دەگاتە سەر «الشيخ عبدالرؤف المناوي، عن القطب الشعراوي عن الشيخ الإسلام عن المؤلف...».

دوای ئەوەیش نووسراوە:

«اطلعت على الأربعين العشارية للحافظ زين الدين العراقي بخط تلميذه الحافظ شهاب الدين ابن حجر أتمه كتابة وسماها».

**ورد الكوثر لمحيا فضايل صديق الأمه الأكبر للبرزنجي المدني.**

دانراوی: محەمەد زەینەلعابدینی کوڕی محەمەد هادیی بەرزنجی.

دوای پێشەکییەک دەڵێ:

«أما بعد: فيقول المفتقر الى الفيض الإلهي والمدد النبوي، محمد زين العابدين بن محمد الهادي البرزنجي الحسيني الموسوي: هذه نفحات قدسية ولمحات أنسية، ورياض زاهرة، وحياض زاخرة.».

کۆتاییەکەی:

«وكان الفراغ من نقلها يوم الجمعة أول رجب الفرد الأصم الحرام. سنة ١٣٠٧ في مكة المعظمة، بمقابلته على اصل النسخة، بقلم الفقير الراجي غفران الذنب من ربه الخفى تاج الدين عبدالستار الصديقي أبو الفياض الحنفي غفر له ولمشايخه ولمن له حق عليه آمين آمين».

(٦پەڕە) ، (٢٨٨٧/٤٠٩٧).

**الرحمة الهابطة في ذكر الرابطة**

دانراوی مامۆستا حسەینی کوڕی ئەحمەدی دووسەریی

سەرەتاکەی:

الحمدلله الذي رفع لواء السنة السنية، وجدد أمر الملة المحمدية، وأيد الشريعة الحنيفية، بظهور أهل المزية، وبروز أولي الخصوصية، ووجود الطائفة المهدية، الزمرة التقية النقية...

کۆتاییەکەی:

وقد وقع الفراغ من كتابة هذه النسخة في يوم السبت قبيل العصر، خامس شهر ربيع الآخر لسنة أربع وستين ومائتين وألف من هجرة من له العز والشرف. وذلك بمكة المكرمة، حرسها الله تعالى وزادها شرفاً وتكريماً.».

ئەم دانراوە بەشێکە لە دەستخەتێک کە چەند دانراوی تێدایە بەم شێوە:

١- آداب المريدين للشيخ أبي نجيب ضياءالدين عبدالقاهر السهروردي. قدس الله سره العزيز. ونفعنا به آمين.

٢- الرحمة الهابطة في ذكر الرابطة. تا لاپەڕە ٧٣.

٣- صورة مكتوب لمولانا خالد. ١٣٧.

٤- صورة مكتوب آخر لمولانا خالد- أيضا. ١٤٧.

٥- صورة مكتوبين من مكاتيب الإمام الرباني. ١٥٠.

٦- معرفة من المعارف اللدنية للإمام الرباني ١٥١.

٧- رسالة في بيان المقامات المجددية. ١٥٧.

٨- ترجمة رسالة الاشتغال بذكر اسم الجلال للشيخ عبدالله الدهلوي، مسماة بالفيوضات الأحدية في المراقبات الأحمدية. أصلها بالفارسية، للشيخ أحمد الدهلوي. ١٧٠.

٩- رسالة التوحيد للصدر القنوي. ١٧٧.

١٠- ترجمة تكملة النفحات. ١٩٤.

١١- رسالة في تمثيل الموجودات بالأشياء النورية للسيد الجرجاني - ٢٠٧.

١٢- ترجمة شرح بيت لمولانا الرومي - ٢١٥.

١٣- رسالة في وحدة الوجود - ٢٢٠.

١٤- رسالة مسماة بالمرشدة للشيخ محمد البكري - ٢٥٦.

١٥- رسالة موسومة بالعروة الوثقى، ترجمة كلام القطب الأحدى الخواجه أحرار- قدس سره- ٢٣٧

ئەم دەستخەتە لە کتێبخانەی ساڵح ئەفەندیی عەترچی مامۆستای (حەرەمی شەریف)دا بووە و، ئەو وەقفی کردووە بۆ کتێبخانەی حەرەمی مەکیی.

ئەم دەستخەتە محەمەد ساڵحی کوڕی محەمەد ئەمینی نەقشبەندیی موجەدیدیی قادریی ئیسلامبوولی ساڵی ١٢٦٤ ک. نووسیویەتییەوە.

تێکڕای دەستخەتەکە ٢٦١ لاپەڕەیە، وەک لە ناونیشان و سەرباسەکانیشیەوە دیارە ناوەڕۆکی بابەتەکان- بەزۆریی- تەسەووفە.

دوا نامیلکە ناوی (مرشدة)یە، نووسەرەوەکەی لە کۆتاییشیەوە نووسیویە: (تمت المرشدة بعون الله وکرمه).

مامۆستای دووسەریی وەک نووسەر بووە شاعیریش بووە. پارچەیەک شیعری لە دەستخەتی ژمارە [٢/ ٢٥٣٨٠ مجامیع]ی کتێبخانەی مەرکەزیی ئەوقافی بەغدادا پارێزراوە.

بە سەرچاوەکانی بەردەستماندا گەڕام شتێکم لەبارەی ژیانی دەست نەکەوت، ئەوەندە هەیە لە پێشەکیی دانراوەکەی (الرحمة الهابطة)وە دەردەکەوێ کە سەردانی بەسرە و بەحرەینی کردووە، ئیتر دیار نییە دوای ئەوانە بۆ کوێی تر چووە.

مامۆستا عەبدوڵڵا جبووریی لە فیهرەستی کتێبخانەی ئەوقافدا، ساڵی ١٢٤٧ک بۆ کۆچی دواییی ئەم مامۆستا دیاریی کردووە، بەڵام سەرچاوەی دیاریی نەکردووە.

لە فیهرەستی کتێبخانەی (مکتبة الحرم المكي الشريف)دا دەڵێ: ساڵی ١٢٣٧ک لە ژیاندا بووە.

لەمانە زیاترم لەبارەی ژیانی دەست نەکەوت.

**الروضة الريا فيمن دفن بداريا من الصحابة والتابعين**

ئەم کتێبە دانراوی مامۆستا عەبدوڕەحمانی کوڕی محەمەدی کوڕی محەمەدی عیمادییە.

سەرەتاکەی ئاوایە (دوای الحمدلله و صەلات و سەلام):

«وبعد: فيقول الفقير الى لطف ربه الخفي، وبرّه الوفي، عبدالرحمان العمادي الحنفي: إن زيارة الصالحين من أقرب القربات. وهي لاستمطار سحايب البركات من الأمور المجربات، وقد أمرنا بالتعرض للنفحات، ولا شك أن مواطنهم من أكبر مظان إجابة الدعوات.

ثم لما كان من أعظم مزارات الشام الموصوفة مزارات داريا الكبرى، القرية المعروفة، جمعت هذه النبذة في شأنها...»

كۆتاييیەكەی:

«الحديث السابع: روى المسند أبو البقا محمد بن عمار بقرية داريا عند ضريح أبي مسلم بسنده إلى عايشة- رضى الله عنها- قالت: سمعت رسول الله لحسان بن ثابت: روح القدس لا يزال يودك ما نافحت عن رسول الله.

انتهت الرسالة بحول الله وقوته في اليوم الثاني من شهر ربيع الأول سنة أربع وستون ومائة وألف.».

دەستخەتەكە ٢٦ لاپەڕەیە، بە مەرەكەبی ڕەش و سوور بە خەتی (نسخ) نووسراوەتەوە.

لاپەڕەی ١٧ دێری تێدایە، پێوانەی ٢١× ١٤سم.

بەژمارە ١/٢٨١٨/٤٠٠٦ تراجم پارێزراوە.

* دەستخەتی ژمارە ٢٩٧٩ (٢١٩٣عام) دانراوێكە بە ناوی (نقد الدرر حاشية على الدرر والغرر لملا خسرو) دانراوی محەمەدی كوڕی مستەفای[1]. وانیی (م ١٠٠٠ك)ه.

بەپێی فیهرستی كتێبخانەی (الحرم المكي) ٢٨٨ لاپەڕەیە، من وێنەی سەرەتا و كۆتاییەكەییم لەلایە، سەرەتاكەی ئاوایە:

«الحمد لوليه، والصلاة على نبيه، ، وآله وصحبه أجمعين.

وبعد: فلما قرأ علي الولد الأعز أعني موهبة الله تعالى من لطفه الرباني، پير محمد بن محمد الواني، كتاب الدرر والغرر درسا فدرسا، حررت ما لاح في قلبي وجال في خلدي شيئا فشيئاً، من دفع الشبهات، وبيان المبهمات، مع الإشارة إلى ما فيه من ذلك الشارح، وخلل الناسخ، فقبل إتمام نقله إلى بياض الأوراق، انتقل المرحوم إلى رحمة الملك الخلاق، فالمأمول من كرم من نظر فيه أن يستغفر له ولوالديه ولجميع المؤمنين والمؤمنات، الأحياء منهم والأموات، إنه مجيب الدعوات...».

كۆتاييیەكەیشی ئاوایە:

«قوله: وليس بمولى عليه، أي على التصرف من جهة مولاه الذي يتصرف عليه، وهذه المقدمة مما يحتاج إليها في بيان ثبوت الأهلية...».

ئەمە لە لاپەڕە (٢٢٧) دایە، بەڵام دیارە تەواو نییە.

دیارە ئەم كتێبەیش شوێنەواری مامۆستایەكی كوردە كە كتێبەكەی لە ئەنجامی دەرزوتنەوەی بە

---

(١) گومان بۆ ئەوە دەچێ ئەم مستەفای وانییە دانەری كتێبی (الأظهار) بێت.

کوڕێکی خۆیدا وتووه، بەڵام دەستی قەدەر کوڕەکەی لێ وەرگرتووەتەوە و جوانەمەرگ بووه.

* دەستخەتی ژمارە (٣٨٣٢عام) ٤٧١٠ کتێبێکە بە ناوی (غرر الحکم ودرر الکلم من کلام علی إبن أبي طالب).

دانراوی: عەبدولواحیدی کوڕی محەمەدی کوڕی عەبدولواحیدی ئامودیی (م: ٥٥٠ک)ە.

سەرەتاکەی دوای (الحمدلله و صەلات و سەلام) ئاوایە:

«وبعد: فإن الذي حداني على تخصيص فوائد هذا الكتاب وتعليقها، وجمع كلمه وتنميقها، ما تبجّح به أبو عثمان الجاحظ عن نفسه، وعدده وزبره في طرسه، وحدده من المائة الحكمة الشاردة عن الأسماع الجامعة أنواع الانتفاع التي جمعها عن أمير المؤمنين علي بن أبي طالب...».

کۆتاییەکەی کە لاپەڕە ٨٦١ی دەستخەتەکەیە ئاوایە:

«ينبغي عاقل إذا علّم أن لا يعنف، وإذا عُلِّم أن لا يأنف. تم والحمدلله أولا وآخرا وباطنا وظاهرا، والصلاة على رسوله الله محمد وآله طيبا وطاهرا...».

ئەم مامۆستا دانراوێکی تریشی ناوی زانراوە کە:

(جواهر الكلام في شرح الحكم والأحكام من قصة سيد الانام عليه السلام)ە.

بەڵام دەبێ دانراوی تریشی هەبێت و تێداچووبن یان هەواڵیان نەزانین، چونکە ئەو بەو هەموو لەخۆڕاپەرموونەوە بەرانبەر بە (جاحظ) بەو شێوە بدوێ دەبێ چ کەڵەزانایەک بووبێت؟[1]

## دانراوێکی "قوام الدين الكاكي السنجاري"

ئەم مامۆستا یەکێکە لە مامۆستا دێرینەکانی کورد و، یان مێژوو لە عاستیدا بێدەنگە، یان ئەوەی مێژوو لەبارەی نووسیویەتی دەست ئێمە نەکەوتووە، سا یا تێدا چووە، یان هێشتا دوورە دەستی لێکۆڵەرەوانە.

هەرچۆن هەبێ بەهۆی هەندێک لە دانراوەکانییەوە کە ڕەنگە کاتی خۆی، زۆر لەوانەی ئێستە زانراون، زیاتری هەبووبێت، ناوی لەسەر لاپەڕەکانی مێژووی زانایانی ئیسلام زیندە ڕاگیراوە. لە سەرچاوەکانی لای خۆماندا شتێکی ئەوتۆی لەسەر نەنووسراوە.

ئەم مامۆستایش یەکێکە لەو مامۆستایانەی بەشێک لە شوێنەوارەکانی گەیشتووەتە (مكتبة الحرم المكي الشريف) و منیش بەو هۆیەوە لێرەدا یادێکی دەکەمەوە و ناوی شوێنەوارەکانی تریشی دەخەمە پاڵی.

لە (كشف الظنون)دا ناوی چەند دانراوی هاتووە بەم شێوە:

یەکەمیان: (عيون المذاهب الأربعة الكاملي) کە دانەری (كشف الظنون) دەڵێ: خۆم دوو نوسخەم لەم کتێبە دیوە، یەکێکیان ساڵێ دوای دانانی نووسراوەتەوە و، بە ناوی سوڵتان (محمد ملك

---

(١) بڕوانە: معجم المؤلفين ٦/٢١٣ .

هەروەها فیهرەستی (مكتبه الحرم المكی الشريف) ج / ٣ / ١٢٧٧ .

المظفر)ەوە دای ناوە. دووەمیانی ساڵێک دوای ئەو نووسیوەتەوە بە ناوی (شعبان إبن محمد الملك الكامل)ەوە ناو ناوە.

مامۆستای دانەری (كشف الظنون) جێگەی بۆ ئەم جیاوازیەیش کردووەتەوە.

دووەمیان : (جامع الأسرار شرح منار الأنوار).

سێیەمیان: (معراج الدراية الى شرح الهداية).

جێگەی سەرنجە مامۆستای کاکی لە سەرەتای ئەم کتێبەیدا- وەک خاوەنی (كشف الظنون) نووسیویە- نووسیویە کە- دیارە لە ژیانی خۆیدا- دانراوەکانی ون بوون و، ویستوویەتی بەوەی لەم کتێبەیدا کۆی کردووەتەوە جێگەی بەشێک لە کتێبە ونبووەکانی بگرێتەوە.

چوارەم: (بنيان الوصول في شرح الأصول) ئەمەیشیان لە(معجم المؤلفين)دا نووسراوە.

ئەوەی هێنامیە ناو ئەم باسە دەستخەتی ژمارە (٢٧٥٤)ی (مكتبة الحرم المكي الشريف)ە، کە نوسخەیەکی کتێبی (عيون المذاهب الأربعة الكاملي)یە. ئەم نوسخە (٢٤٤) لاپەڕەیە و، ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی کوردیی لە (ربيع الأول)ی ساڵی (٨٥٩)دا نووسیویەتییەوە.

جگە لەمانەیش خاوەنی (معجم المؤلفين) دەڵێ: شەرعزان و ئوسوولیی بووە، چووەتە قاهیرە، دوایی ماردین و لەوێ بووە بە موفتیی و مامۆستا و، تا کۆتاییی ژیانی لەوێ بووە و ساڵی (٧٤٩ک ١٣٤٨ز) لەوێ کۆچی دواییی کردووە.[1]

لە سەرەتای ئەو دەستخەتەوە کە لە (مكتبة الحرم المكي الشريف)دا پارێزراوە نووسراوە:

«كتاب عيون المذاهب المظفري. مؤلفه الإمام الكبير قوام الدين محمد الكاكي إمام جليل القدر، قدم إلى قرم ثم إلى قاهرة، فأقام بجامع الماردانى، يؤم به، ويدرس به للطائفة الحنفية سنة تسع وأربعين وسبعمائة. وتفقه بترمه على الإمام عبدالعزيز شارح الأخكنى، وسأله أن يضع كتابا على الهداية، واسمه محمد بن محمد بن محمد البخاري الكاكي. والكاك بلغتهم بايع الكعك. وقال السمعاني: أظنها قرية من قرى بخارى يقال: كاكي. له هذا الكتاب وشرح المنار وكنوز المطالب. رحمه الله رحمة واسعة.».

سەرەتای کتێبەکە:

«الحمدلله باسط الأرض ورافع السماء، وباعث الرسل والأنبياء، صلوات الله عليهم خصوصاً على سيدنا محمد زبدة الأصفياء وإمام الأتقياء. وعلى آله وأصحابه الطاهرين القامعين للأعداء. وسلم تسليماً كثيراً. وبعد: فإني لما رأيت علم الفقه أعظم...».

کۆتاییەکەی:

«والحمدلله على التمام. وقع الفراغ منه سلخ شهر ربيع الأول من شهور سنة تسع وخمسين وثمان

---

(١) بڕوانە: (الفهرس المختصر لمخطوطات مكتبة الحرم المكي الشريف) و (معجم المؤلفين ١١/١٨٢) و (كشف الظنون ٢/١١٨٧ ، ١٨٢٤ ، ٢٠٢٣).

ماية على يد أفقر عبادالله وأحوجهم إلى رحمة الله الحاج إبرهم عرف بابن الكردي القادري غفرالله الكريم له ولوالديه وأحبابه ومشايخه ولكل المسلمين أجمعين. والصلاة والسلام على سيد المرسلين محمد صلى الله عليه وسلم وعلى آله وصحبه أجمعين- والحمدلله رب العالمين.».

دەبێ لە کۆتاییی ئەم کورتە نووسینەوە لا لە دوو وشە بکەینەوە:

یەکەم: کە دەڵێ: (البخاري) وا بزانم ئەمە هەڵەی نووسەرەوەیە و، لە نێوان (سنجاري) و (بخاري)دا نزیکیی و لە یەکچوون هەیە و، ڕەنگە نووسەرەوەیەک ناوی (سنجار)ی نەبیستبێ و بە هەڵەی زانیبێ و کردبێتی بە (بخاري) و ئیتر وا ڕۆیشتبێ.

دووەم: کە ئەمە زانرا ئەو مانایش بۆ (کاکی) کراوە، کە گوایە کێکیان دروست کردووە یان فرۆشتووە، بێ مانا دەمێنێتەوە و، هەر لە (کاکە)ی کوردانەوەیە و، لەوانەیشە لەو سەردەمەدا لە ناوچەی (سنجار) گوندێک بە ناوی (کاک) یان (کاکە) یان شتێکی وا بووبێت. ئەمەیش لە خۆمەوە ناڵێم و، لە هەندێک لە سەرچاوەکاندا هەر (سنجاري) نووسراوە.

هەروەها بەسەر ئەوەیشدا نارۆم کە زانایەکی ترمان هەیە بە ناوی (قوام الدين الحسني) و ئەمیش گەلێ دانراوی هەیە. بەڵام ئەم وەک مامۆستای سنجاری کۆن نییە.[1]

چوار نوسخەی تری ئەم کتێبە لە کتێبخانەی ئەوقافی موسڵدا هەیە، بە ژمارەکانی:

أ- (١٨/١٢٤ مجموع) پارێزراوە لەناو (مجموع)ەکەدا ژمارە (١٣)یە.

ب- (٩/٣٨).

ج- (١١/٢).

د- (٩/٢٢)[2]

هەروەها نوسخەیەکی لە کتێبخانەی ئەوقافی بەغدادا بە ژمارە (١٦٠٥)[3]

دوو نوسخەیشی لە کتێبخانەی ئەوقافی قادریە لە بەغدادا هەیە.[4]

**ئەو دانراوانەی لە فیهرستەکاندا ناویان هاتووە:**

١- الحاشية الإلهامية السليمة (حاشية على الجزء التاسع والعشرين والثلاثين من تفسير البيضاوي). (٥٥١/١٤٢) (م؟).

دانراوی عەلی کوڕی محەمەدی کوڕی عەلی ئامودی، (١٩٨ پەڕە).

٢- رسالة في مخارج الحروف. دانراوی محەمەدی کوڕی حەسەنی ئامودی، (٤١٥/٣٩١- ١٩ پەڕە).

(١) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد... بەرگی پێنجەم، ل: ٢٨١ .

(٢) بڕوانە: فهرس مخطوطات مكتبة الأوقاف العامة في الموصل، سالم عبدالرزاق، الجزء الثامن، ص: ١٩٧ و الجزء الرابع ص: ٨٠ . والجزء الخامس، ص: ١٧٥ . والجزء الأول ص: ٩٤ .

(٣) بڕوانە: فهرس المخطوطات العربية في مكتبة الأوقاف العامة في بغداد ج ١/ ص: ٤٨٦ .

(٤) بڕوانە: الآثار الخطية في مكتبة القادرية. ج ١/ ص: ١٦٣و ج ٢/ ٩٤ .

٣- رسالة في الفرق بين موضوع العلم الإلهي والكلامي. دانراوى مەحموودى كوڕى ئەبوبەكرى كوڕى ئەحمەد (م ٦٨٢ك) ئورمەويى، (٣٨١١/٦٣٢١ عام) (٤ پەڕە).

٤- مختصر المنتهى، دانراوى ئیبنولحاجیب عوثمانی کوڕی ئەبوبەکر (م٦٤٦ ک)، (١٥٢٦/٢١٤٤). (٩٢پەڕە).

٥- وفيات الأعيان في أنباء أبناء الزمان، دانراوى ئیبنوخەلەكان، ئەحمەدى كوڕى محەمەدى كوڕى ئيبراهيم (م ٦٨١ك).

(٤٠٩٨ /٣٥٤٩). (٣٤٥پەڕە).

٦- الأربعون التساعية (تساعية ابن جماعة) دانراوى عەبدولعەزيزى كوڕى ئيبراهيمى كەتانيى. (م ٧٦٧ك). (٧٩٣/٩٦٤). (٨ پەڕە).

٧- تحرير الأحكام في تدبير جيش الإسلام. دانراوى ئيبنوجەماعە محەمەدى كوڕى ئيبراهيم (م٧٣٣ ك)، (٣٨٠٠/٢١٩٧). (٤٦ پەڕە).

٨- نجاة الهلك في فهم معنى مالك الملك، دانراوى محەمەدى كوڕى رەسوولّى بەرزنجيى (م ١١٠٣ك) (١٤٥٦/١٩٢٢) (٧ پەڕە).

٩- أ- جالية الكرب بأصحاب سيد العجم والعرب. دانراوى جەعفەرى كوڕى حەسەنى كوڕى عەبدولكەريمى بەرزنجيى. (م ١١٨٧ك). (٤٣٤٠/٣٥٦٣) (٢٠ پەڕە).

ب- مولد البرزنجي. (٢٧٣٣/٣٦٩٩) (٣١ پەڕە).

ج- الجنى الداني في مناقب الجيلاني. (٢٨٠١ /٣٩٧٩) (٣٤ پەڕە).

د- مناقب حمزة سيد الشهداء (إتحاف السعداء بمناقب سيد الشهداء) (٢٨٨/٤٠٧٥). (٢٠ پەڕە).

هـ- مناقب عبدالقادر الجيلاني. (٢٣٩٧/٤٠٧٨) (١٣ پەڕە).

١٠- جالية الأرب في نظم جالية الكرب بأصحاب سيد العرب والعجم. دانراوى زەينەلعابيدينى كوڕى محەمەد (م١٢٤٢ ك)، (٢٦٢٨/٣٥٦٢). (٢١ پەڕە).

١١- ئەم مامۆستاى لێرەدا ناوى چەند دانراوێكى دەنووسم كە لە كتێبخانەى (الحرم المكي الشريف)دا لەنگەريان گرتووە لە سەرچاوەكاندا بە چەند شێوە ناوى نووسراوە، لەوانە: (محمد البركلي، محمد البرقلعي، محمد البركوي) ئەوەيش كە من دەربارەى دۆزيمەوە لە يەكێك لە دەستخەتەكاندا نووسەرەوەيەك سەر و بۆرى بۆ كردووە و نووسيويە: (بەركێويى) وەك وتم ئەم دانراوانەى لەو كتێبخانەدا لەنگەريان گرتووە:

أ- الدر اليتيم في علم التجويد. (م ٩٨١ك) (٤ پەڕە).

ب- أربعون حديثا. (١٠ پەڕە).

ج- شرح الأربعين حديثا. (٨٧ پەڕە).

د- رسالة في العقائد (٣٣ پەڕە).

هـ- شرح الكلام البركوي في التوحيد (١٥ پەڕە).

و- ذخر المتأهلين والنساء في تعريف الاطهار والدماء (١٢ پەڕە) (٣٧٥٩/٢٦٠٩).

ز- معدل الصلاة، (١٩ پەڕە) (٢١٣٩/٢٩٠٢).

ح- إنقاذ الهالكين. (١٨ پەڕە) (٢٤٢٩/٤٥٦٣).

ل- إيقاظ النائمين وإفهام القاصرين (٢١ پەڕە) (١٧٩١/٤٥٦٦).

ي- جلاء القلوب. (٦٣ پەڕە) (٢٤٤٧/٤٥٩٥).

ك- الطريقة المحمدية (١٤٨ پەڕە) (٢٤٨٣/٤٦٨٩).

ل- مفتاح الفلاح، (٢٦ پەڕە) (٤٧٩٦/ ٢٣٨٤) .

م- إظهار الأسرار في النحو، (١٩ پەڕە) (٢٩٤٦/٥٣٣٠).

ن- إمتحان الأذكياء في شرح لب الألباب للبيضاوي (١٥١ پەڕە) (٢٩٦٩/٥٣٦٨).

س- شرح لب الألباب في علم الإعراب. (١١٦ پەڕە)، (٣٩٢١/٥٥٢٨).

ع- العوامل في النحو (٥ پەڕە) (٣٠٦٧/٥٥٥٠).

ف- إمعان الأنظار فى شرح المقصود فى الصرف (٢٦ پەڕە)، (٢٩٧٢/٥٦٩٥).

ص- كفاية المبتدى في التصريف (٥ پەڕە)، (٣١٧١/٥٧٦٥).

١٣- الجامع الوجيز المشهور بالفتاوى البزازية. دانراوی محەمەدی کوڕی شەهابی کوڕی یوسفی کوردیی (م ٨٢٧ ک) (٥٨٦ پەڕە)، (٢٠٠٤/٣٢٦٤).

١٣- إفاضة الأنوار على شرح منار الأنوار. دانراوی محەمەدی کوڕی عەلی کوڕی محەمەدی حەصکەفی. (م ١٠٨٨ ک) (٦٥ پەڕە) (١٤٦٩/٢٠٥٤).

١٤- تعليق على حاشية مصلح الدين اللارى على شرح القاضي مير على هداية الحكمة.

دانراوی حەیدەری کوڕی ئەحمەدی سەفەویی حەریریی (حەیدەری) (م ١١٢٩ک) (٣٨٨٨/٦٢٤٤) (٢٠٤ پەڕە).

١٥- فك الأشتباك عن معاني تشريح الأفلاك. دانراوی ئیبراهیم فەصیحەدینی کوڕی صیبغەتوڵڵای حەیدەری (م١٢٩٩ک)، (٣٦٢١/٦٦٦١). (١٣٦ پەڕە).

١٦- أ- رسالة في إثبات الواجب. دانراوی جەلالەدینی محەمەدی کوڕی ئەسعەدی سیدیقی دەوانیی (م٩١٨ ک) (١٢٧١/١٥٢٨). (٤٧ پەڕە).

ب- رسالة في أفعال العباد، (١٣٩٧/١٥٣٩). (٤ پەڕە).

ج- رسالة في محصل التوحيد، (١ پەڕە)، (١٣٤٤/١٦١٩).

د- الزوراء (نبذة من الحقائق وزبدة الدقائق) (٣ پەڕە)، (١٣٤٤/١٦٤٧).

هـ- شرح ديباجة طوالع الأنوار للبيضاوي. (٥ پەڕە)، (٤١٤٦/١٦٧٦).

و- شرح الزوراء، (٢ پەڕە)، (١٣٤٤/١٦٧٩).

ز- شرح العقائد العضدية، (٥٨ پەڕە)، (١٣١٤/١٦٩٦).

ح- شرح هياكل النور، (٦٩ پەڕە)، (١٣٩٧/١٧٣٠).

ط- حاشية الدواني على حاشية الجرجاني على شرح الإيجي لمختصر المنتهى (٦٠ پەڕە) ، (١٤٩٢/ ٢٠٨١).

ي- رسالة في تشييد الصلاة على النبي بالصلاة على إبراهيم (٢ پەڕە)، (٣٩٢٩/٤٩٧٥).

ك- حاشية الدواني على شرح مسعود الشرواني لآداب الفاضل شمس الدين السمرقندي. (١,٥ پەڕە)، (٤١٤٤//٥١٥٢).

ل- شرح تهذيب المنطق والكلام (٤١ پەڕە)، (١٣٧١/٦٣٤٧).

م- شرح رسالة الجواهر المفارق المسمى بالعقل الكل لنصير الطوسي (٦ پەڕە).

ن- دقائق على رسالة إثبات الجوهر الطوسي (٤ پەڕە)، (٣٩٠٩/٦٤١٦).

س- انموذج العلوم (٢٩ پەڕە)، (٣٧٩٩/٦٦٩٥).

١٧- حاشية على فتح الوهاب شرح منهاج الطالبين. دانراوی عەلی کوڕی یەحیای زیادیی. (م ١٠٢٤ك)، (١٦٦٢/٣٠٦٨). (٢٠٤ پەڕە).

١٨- حاشية السكتاني على شرح السنوسية. دانراوی عیسای کوڕی عەبدوڕەحمانی سکتانیی. (م ١٠٦٢ك)، (١٣٢٢/١٤٣٥)، (١٤٠ پەڕە).

١٩- آداب المريدين. دانراوی عەبدولقاهیری کوڕی عەبدوڵڵای سووڕەوەردی (م ٥٦٣ك). (١٢٨٥/ ٤١٢٠). (٣٦ پەڕە).

٢٠-أ- أجوبة أسئلة في التصوف. دانراوی شەهابەدین عومەری کوڕی محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای سووڕەوەردی (م ٦٣٢ك)، (٢٤٩٧/٤١٢٢)، (٢ پەڕە).

ب- تعليقة في قوله -ص-: (ازهد فيما عند الناس يحبك الناس).(٤١٨٥ / ٢٤٩٧) (٢ لاپەڕە).

ج- الرحيق المختوم لذوي العقول والفهوم (٢٤٩٧/٤٢٣٣)، (٦ پەڕە).

د- رسالة في الحث على اتخاذ الشيخ ذي البصيرة. (٢٤٩٨/٤٢٧٦)، (٢پەڕە).

ه- رسالة في السلوك (٢٤٩٧/٤٢٨٠)، (٢ پەڕە).

و- رسالة في السير والطير (٢٤٩٧/٤٢٨٣)، (٢ پەڕە).

ز- رسالة في الفقر والغنى (٢٤٩٧/٤٢٨٥)، (پەڕە و لایەک).

ح- عوارف المعارف (٢٤٩٧/٤٣٧٩). (٢٤٧ پەڕە).

ط- وصية شهاب الدين السهروردي (٣٨٨١/٤٨٤٧)، (٤ پەڕە).

ي- إعلام الهدى وعقيدة أرباب التقى. دانراوی عومەری کوڕی محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای سووڕەوەردی (م٦٣٢ ك)، (٢٤٩٧/١٣٣٠)، (١١ پەڕە).

٢١- قصيدة السهروردي. (دانراوی ئەبولفەتووح شەهابەدین یەحیای کوڕی (حبيش) کوڕی

(امیرک)ی سوورەوەردی (م ٥٨٧ک)، (٤٠٨٥/٥٨٩٥)، (یەک لاپەڕە).

٢٢-أ- الفية العراقي في أصول الحديث. دانراوی زەینەدین عەبدوڕەحیمی کوڕی حسەینی کوڕی عەبدوڕەحمانی عێراقی. (م ٨٠٦ک) (٧٣٩/٩٧٦) (٤٤ پەڕە).

ب- تخريج أحاديث إحياء علوم الدين. (٨٨٧/١٠٠١)، (٢٦٢ پەڕە).

ج- ثبت بشيوخ العراقي (٣٨٧٥/١٠٢٠)، (٢٦ پەڕە).

د- شرح ألفية العراقي (٧٧٠/١٠٩٤)، (١٦٩ پەڕە).

هـ- نظم الدرر السنية في السيرة الزكية (٢٧٤٢/٣٧٠٤)، (٥٦ پەڕە).

٢٤- مبرز المعاني في شرح قصيدة حرز الأماني. دانراوی محەمەدی کوڕی عەمری کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەدی عیمادیی (٧٦٢ک)، (٤٣٤/٤٣٨)، (٢٢٩ پەڕە).

٢٥- رسالة في المسح على الخفين. دانراوی محەمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی مستەفای عیمادی. (م٩٨٢ک)، (٣٨٢٣/٢٢٧٨)، (١٠ پەڕە).

٢٦- رسالة مصباح الفلاح في دعاء الاستفتاح. دانراوی حامیدی کوڕی عەلی کوڕی ئیبراهیمی عیمادی، (م ١١٧١ک)، (٣٧٩٩/٢٢٨١)، (٦٩ پەڕە).

٢٨- أ- إجازة لعبدالستار عبدالوهاب الدهلوي. محەمەدی کوڕی عەبدولکەبیری کوڕی محەمەدی کەتانی (م١٣٢٧ک) ئیجازەکەی داوە پێی. (٧٥٤/١٢٣٢)، (یەک پەڕە).

ب- ثبت محمد عبدالحي بن عبدالكبير الكتاني. (٧٩١/١٠٢٩)، (٣٥ پەڕە).

٢٩- جملة من أسانيد محمد بن جعفر بن إدريس الكتاني. (م١٣٥٥ك) عەبدوسەتاری کوڕی عەبدولوەهابی دەهلەوی کۆی کردۆتەوە. (٧٥٤/١٠٣٤). ( ٩ پەڕە).

٢٩- تراجم أبواب البخاري. دانراوی عومەری کوڕی ریسلانی کوڕی نەسری کەتانی (م ٨٠٥ک). (٢٧٧٩/٣٩٤٩)، (٤٦ پەڕە).

٣٠- أ- فتح القدير باختصار متعلقات نسك الأجير، دانراوی محەمەدی کوڕی سولەیمانی مەدەنیی کوردی (م ١١٩٤ک). (١٠٦٦/٨١٨)، (٨ پەڕە).

ب- رسالة في بيان جواز اقتصار ركعتين قبل صلاة العصر. (٤٦٢٧/٢٢٤٩)، (٦ پەڕە).

ج- رسالة في شروط الوضوء مقتبسة من منهاج الطالبين للنووي. (١٦٤٣/٣٠٨٠). (٢٠ پەڕە).

٣١- تعليقات على حاشية أبي الفتح السعيدي الأردبيلي على شرح محمد الحنفي على آداب عضدالدين. دانراوی عەبدوڵلای کوڕی حەیدەری حەیدەریی (م؟). (٣٩٣٦/٥١٤٣)، (٥٠ لاپەڕە).

٣٢- الرد على أبي حامد الغزالي (المنخول). دانراوی (شمس الأئمة) محەمەدی کوڕی عەبدوسەتاری کوردی (م٦٤٢ک). (٢٢٦٧/٢٠١٨)، (٥٢ پەڕە).

٣٣- حيرة الفقهاء. دانراوی عەبدولغەفاری کوڕی لوقمان (م ٥٦٢ک). (کردي) (٢٠٩٢/٢٥٦٦)، (١٠ پەڕە).

٣٤- بيان مشكلات شرح الكافية لعبدالرحمن الجامي. دانراوی ئیبراهیمی کوڕی سولەیمانی کوردیی حەلەبی. (٧ پەڕە) (م؟)، (٥٣٧٦/٢٩٧٤).

٣٥- شرح أبيات المتوسط. دانراوی عوسمانی کوڕی عەبدوڵەلیکی کوردی. (م ٧٣٨ك). (٣٠٢٦/ ٥٤٨٩)، (٦١ پەڕە).

٣٦- الكوثر الجاري على رياض البخاري. (م٨٩٣ ك)، (٦٥٠ پەڕە) دانراوی ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی گۆرانی. (١١٨٣/٨٤٨)، (٦٥٠ پەڕە).

٣٧- أ- تعليق على ثلاثة أبيات من كتاب منازل السائرين الى الحق المبين لعبدالله بن محمد الأنصاري، دانراوی یووسفی کوڕی عەبدوڵڵای گۆرانی (م ٧٦٨ ك) (١ لاپەڕە)، (٣٨١٩/ ٤١٨٣)، (١ پەڕە).

ب- كتاب بيان اسرار الطالبين في التصوف (بيان أسرار فيما يحتاج اليه الأبرار) (٥٧ پەڕە)، (٢٣٥٥/٤٤٣٠).

٣٨- ثبت محمد بن إبراهيم بن حسن الگوراني الكردي. دانراوی محەمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەسەنی کوردی. (م ١١٤٥ك) (٥ پەڕە)، (٤٢٥٦/١٠٢٥).

٣٩- أ- إرشاد الفارض إلى كشف الغوامض في الفرائض. دانراوی محەمەدی کوڕی محەمەدی ماردینی (م ٩٠٧). (١٣٧ پەڕە) (٤٠٤٧/٣٤٠٢).

ب- شرح مختصر على المقدمة الرحبية. (٣١ پەڕە). (٢٢٥٧/٣٤٤٥).

٤٠-البحر المواج في شرح المنهاج. دانراوی محەمەدی کوڕی فەخرەدین عوسمانی ماردینی (م ٨٧١ك)، (٢٣٤ پەڕە)، (١٦٣٨/٣٠٣١).

٤١- شرح خلاصة في الحساب (شرح الرسالة البهائية)، دانراوی عومەری کوڕی ئەحمەدی جەلیی مائیی. (م؟) (٥٥ پەڕە)، (٣٦٥١/٦٤٦٥).

٤٢- شرح اللمع في الحساب. دانراوی (بەدرەدین) محەمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی ئەحمەد (م ٩٠٧ك) (٢٥ پەڕە)، (٣٦٦٢/٦٤٦٨).

٤٣- شرح لارجوزة في الجبر والمقابلة. دانراوی شەهابەدین ئەحمەد (م؟) (٢ پەڕە)، (٢٩٣٦/ ٦٤٨٣).

٤٤- أ- حاشية ملا خسرو على تفسير البيضاوي. دانراوی مەلا خەسرەو، محەمەدی کوڕی فەراموزر. (م ٨٨٥ك) (٢٨٩ پەڕە)، (٥٨١/١٦٤).

ب- مرآة الأصول في شرح مرقاة الوصول. (٢٥٣ پەڕە)، (١٥٢٧/٢١٤٥).

ج- مرقاة الأصول الى علم الأصول. (١٦ پەڕە)، (١٥٢٤/٢١٤٨).

د- كتاب الوصية. (١٠٠ پەڕە)، (٣٨٧٢/٢٣٤٥).

هـ- الأستخلاف للخطبة. (١ لاپەڕە) (٣٨٢٣/٢٤١٧).

و- تعليقات على غرر الأحكام. (٧ لاپەڕە)، (٣٨٦٨/٢٤٩٧).

ز- درر الحكام في شرح غرر الأحكام. (٣٩٩ پەڕە)، (١٨٥٦/٢٥٩٣).

ح- رسالة في بيان أحكام الولاء. (٣ پەڕە)، (٣٨٨٥/٢٦٢٧).

ط- حاشية على المطول. (١٤٦ پەڕە)، (٣٣٦٣/٥٨٣٠).

٤٥- أ- رسالة حفظية للأمور النفسية. دانراوی مەلا زادە محەمەدی کوڕی مەلا ئەبوبەکری کوردی (م؟) (١١ پەڕە)، (٣٧٣٢/١٥٠٧).

ب- رسالة مرقاة العلوم والسّر المكتوم (٤ پەڕە)، (٤١٠٤/٦٧١٣).

٤٦- نقد الدرر حاشية على الدرر والغرر لملا خسرو، دانراوی محەمەدی کوڕی مستەفای وانی (م. ١١٠٠ک) (٢٨٨ پەڕە)، (٢١٩٣/٢٩٧٩).

# دەستخەتەکانی کتێبخانەی مەلیک عەبدولعەزیز لە شاری مەدینە

٥٤٦

دوور نەڕۆیشتووم ئەگەر بڵێم: کتێبخانەی مەلیک عەبدولعەزیز دەوڵەمەندترین کتێبخانەی وڵاتی سعوودییەیە بە نیسبەتی شوێنەواری مامۆستایانی کوردەوە"، چونکە بەشێک لە دەستخەتەکانی ئەو کتێبخانە دەستخەتەکانی کتێبخانەی (عارف حیکمەت)ە کە بە یەکێک لە دەوڵەمەندترین کتێبخانەی دەستخەت دادەنرێت کە شوێنەواری مەلای کوردی زۆر تێدابێ.

بەڵام بەداخەوە تا ئێستە ئەم کتێبخانە فیهرەستی بۆ نەکراوە و بە دروستیی ناوەڕۆکەکەی نازانین. تەنیا بەشی (الحدیث الشریف وعلومە)ی کاری تێدا کراوە، ئەم بەشە ناوی چەند زانایەکی کورد و شوێنەواریانی تێدایە، لەم هەلەدا ناویان تۆمار دەکەم و چاوەڕوان دەبم بەڵکو بەشەکانی تریشی کاریان بۆ بکرێت و، بەشی زانایانی کورد لەوانیشدا بزانین.

مامۆستایانی کورد لە زانستی حەدیسدا- وەک زانستەکانی تر- خزمەتی گەورە و دیار و بەرچاویان هەیە. بەڵام ئێمە ئەو مامۆستا کوردانە هەموویان ناناسین و، نیشانەیەکی دیار نییە کە کوردایەتی ئەوانی پێ بزانین ئەوە نەبێ کە بەشێکیان ناوی خۆیان گێڕاوەتەوە بۆ لای زێدی باو و باپیرانیان و بەوە ڕەسەنی خۆیان پاراستووە، بەڵام گەلێکی تریان ئەوەیان نەکردووە و نایانناسین، بەڵکو بەشێکی زۆریان دوای ئەوەی گەیشتوونەتە شوێنانێکی تر ئیتر ناوی ئەو شوێنانەیان لە خۆیان ناوە و بەوەیش ناوی شوێنی باوباپیرانیان بزر بووە.

وەک کەسانی وایشیان هەیە لە پاڵ ناوی زێدی باو و باپیرانیاندا ناوی شوێن و گەلی وایان پێوە نراوە گومانی لە عاستی زێد و ڕەسەنیاندا دروست کردووە، وەک دەنووسن فلانی خەرپووتیی رۆمیی، یان دیاربەکری تورکیی... منیش لەبەر ئەمانە گەلێ ناوم بواردووە و لەناو ئەو ئاڵۆزییەدا ئەمانەی خوارەوەم هەڵبژاردووە.

أ- الأسفار عن أصل إستخارة اللیل والنهار. دانراوی ئیبراهیمی کوڕی حەسەنی گۆرانیی شارەزووری. (٣٧ پەڕە)، (ع،ح. ٢/٣١٣).

ب- الأمم لإیقاظ الهمم (٤٩ پەڕە)، (٢٠٦/٢٥٩ آل الصافي).

ج- حاشیة علی نزهة النظر شرح نخبة الفکر (١٨ پەڕە)، (٧/٢٥/٨٧٤).

د- مسالك الأبرار إلی أحادیث النبي المختار (٧٦ پەڕە)، (٣٣/١٦٤٣).

ه- مسلسلات الگوراني. (١٠٥ پەڕە)، (٢/٣٧٦/١٦٥٤).

و- المسلك الوسط الداني إلی الدر الملتقط للصغاني، (٣٠ پەڕە)، (٤/١٠٢٣/١٦٥٥).

ز- نظام الزبرجد في الأربعين المسلسلة بأحمد، (١٣ پەڕە)، (١/٣١٣/١٨٨٧).

٢- الكوثر الجاري الى رياض أحاديث البخاري. دانراوی (شەهابەدین) ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی گۆرانی، (م ٨٩٣ک)، (٦٥٧ پەڕە)، (٤٧٩/١٤٩٢ ع، ح).
(بەخەتی دانەرەکەی)

٣- أ- الصافي عن الكدر فيما جاء عن سيد البشر في القضاء والقدر. دانراوی محەمەدی کوڕی عەبدوڕەسووڵی بەرزنجی (م ١١٠٣ک) (٥٤ پەڕە)، (٤٤٨/١٢٤٨).

ب- القول المختار في حديث «تحاجت الجنّة والنار»، (٦ پەڕە)، (٤٤٨/١٤٦١).

٣- أ- الأربعون حديثا. دانراوی (محیدین) محەمەدی کوڕی پیرعەلی بەرکێوی. (م ٩٨١ک)، (٢ پەڕە)، (٢/١٣٧/٧٧، ع، ح).

ب- رسالة في أصول الحديث. (٦ پەڕە)، (٤٣١/٩٧٩).

ج- شرح الأربعين حديثا. (٣٩ پەڕە)، (١٣٣/١٠٨٣).

د- شرح الحديث الأول من الأربعين حديثا. (٢٤ پەڕە)، (١٣٣/١١١٩).

هـ- شرح سبعة أحاديث من الأربعين. (٥٤ پەڕە). (٧٧٩/١١٢٤).

٤- المستفاد من مبهمات المتن والإسناد. دانراوی ئەبوزەرعە ئەحمەدی کوڕی عەبدوڕەحیمی عێراقی. (م ٨٢٦ک). (٥٩ پەڕە). (٥٠٣/١٦٤٩ ع، ح).

٥- أحاديث القصاص. دانراوی (تقي الدين) ئەحمەدی کوڕی عەبدولحەلیمی ئیبنو تەیمیەی حەڕڕانی. (م ٧٢٨ک)، (٢ پەڕە)، (٢٦٢١/٤١ ).

٥- المنتقى من الأحكام عن خير الأنام- عليه الصلاة والسلام- دانراوی (مەجدەدین) عەبدوسەلامی کوڕی عەبدوڵڵای حەڕڕانی، ئیبنوتەیمیە. (م ٦٥٢ک)، (٣٣٥ پەڕە). (١٧٥/١٧٩٣، ع، ح).

٦- زوال الترح بشرح منظومة ابن فرح، دانراوی (عزالدين) محەمەدی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی جەماعەی کەتانی. (م ٨١٩ک)، (٥ پەڕە)، (٦٦/١٠١٥، ع، ح).

٧- دانراوی ئەبولفەزل عەبدوڕەحمانی کوڕی ئیبراهیمی خەرپووتی. (م ١٢٥٩ک) (١٤ پەڕە)، (٣٩١/٤٧٨).

٨- أ- التبصرة والتذكرة (ألفية الحديث) دانراوی (زەینەدین- ئەبولفەزل) عەبدوڕەحیمی کوڕی حسەینی عێراقی (م ٨٠٦ک). (٥٧ پەڕە)، (٢٧٨/٣٣٧).

ب- تقريب الأسانيد وترتيب المسانيد (١٠٦ پەڕە)، (٢٩٤/٤٠٩، ع، ح).

ج- التقييد والإيضاع لما أطلق وأغلق من كتاب إبن الصلاح (١٢٠ پەڕە). (٢٩٨/٤٢١).

د- شرح ألفية الحديث. (٢١٠ پەڕە)، (٣٣٧/١١٠٩).

هـ- المغني عن حمل الأسفار في الأسفار في تخريج ما في الأحياء من الأخبار. (٢٢٦ پەڕە)، (٣٢٦٦/١٧٧٣).

و- ثبت بشيوخ العراقي: (٢٦ پەڕە)، (٣٨٧٥/١٠٢٠).

٩- مسلسل العيدين وغير ذلك، دانراوی عەبدولعەزيزی کەتانی، (م ٤٦٦ك)، (٨ پەڕە)، (/١٨٠ ١٦٥٢، ع، ح).

١٠- علوم الحديث. دانراوی (تەقیەدین) ئەبو عەمر عوثمانی کوڕی عەبدوڕەحمانی شارەزووری (ئیبنوصەلاح)، (م ٦٤٣ك)، (٨٨ پەڕە)، (٣٣٩/١٢٦٧، ع، ح).

١١- ثبت عمر النعيمي. دانراوی عومەری کوڕی ئەحمەدی خەرپووتی (م ١٢٩٩ك)، (١٤ پەڕە)، (٣٩١/٤٨١).

١٢- أ- رسالة في ذكر الكتب الحديثية. دانراوی ئەبو عەبدوڵڵای محەمەدی کوڕی جەعفەری کەتانی. (م ١٣٤٥ك)، (٢٥ پەڕە)، (٨٥/٩٩٠).

ب- الرسالة المستطرفة لبيان كتب السنة المشرفة. (٥٣ پەڕە)، (٨/٤/٩٩٣).

١٣- إجازة محمد ومحمد عبدالحي الكتانيين من محمد بن سالم السري. ئەو دوو محەمەدە ئیجازەیان لە محەمەدی کوڕی سالم وەرگرتووە، محەمەدی کوڕی عەبدولکەبیر (م ١٣٢٧ك)، محەمەدی کوڕی عەبدولحەی (م ١٣٨٢ك). (٢١ پەڕە)، (٣٩٤/٢٨).

١٤- مسند أبي حنيفة. دانراوی مووسای کوڕی زەکەریای کوڕی ئیبراهیمی حەسکەفیی (م ٦٥٠ك)، (١٤٨ پەڕە)، (٢٣٢/١٥٧/١٦٦٥، ع، ح).

رسالهٔ اعتقادیه برای شرح حدیث شریف جبرائیلیه
از حضرت شیخ مولانا خالد قدس سره العلیه

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله الذی انعم علینا وهدانا الی الاسلام وجعلنا
من امة سید الانام علیه وعلی آله الصلوة والسلام
باید دانست که حضرت حق سبحانه وتعالی منعم علی
الاطلاق است اگر وجود است از جناب قدس او تعالی
موهوب است واگر بقا است هم از آن حضرت عطا
است واگر صفات کامله است هم از رحمت شامله اوست
سبحانه وتعالی زندگی وتوانائی ودانائی وبینائی
وشنوائی وگویائی هم از آن حضرت جل شانه مستفاد
است وانواع نعم وصنوف کرم که از حد وعد بیرون
است هم از جناب اقدس او تعالی مفاض ازالهٔ عسر
وشدت او میفرماید تعالی واجابت دعوت ودفع بلا
او مینماید سبحانه رزاقست که از کمال رأفت خود را
ارزاق عباد را بعلت گناهشان منع نکند ستار است که

# فەتوا لە کوردستاندا

٥٤٧

وەک گەلێ لایەنی مێژووی زانیاری و بوارەکانی تری کوردستان نادیارە، مێژووی (فەتوا) و (ئیفتا)یش بەشی خۆی لەو نەزانراوی و مێژوو و نییە هەیە.

ئەوەی کە دیارە و کارەساتە سەختە مێژووییەکان نەیانتوانیوە بیسڕنەوە بوونی چەندان بنەماڵە و خانەوادەیە لە کوردستاندا بە ناوی (موفتی)یەوە ناسراون، ڕەنگە ئەگەر بیشمانەوێ ناوی ئەو خانەوادانە بژمێرین و ناونووسیان بکەین زۆری بوێت و لە ئەنجامیشدا پەی بەناوی گشتیان نەبەین. کە بۆ ناوی موفتییە کۆنەکانی کورد و ناو کوردستان بگەڕێین لەوانەیە لە دەرەوەی کوردستانەوە دەست پێ بکەین باشتر بە مەبەست بگەین و زیاترمان لە موفتیانی دێرین چنگ بکەوێت. پێش ئەوەی بێمە سەر ناونووسکردنی هەندێک لە موفتییەکانی کوردستان دەبێ پەنجە بخەمە سەر ئەوە کە دەکرێت، وەک بابەتبەندیی موفتییەکانی کوردستان بکەم بە دوو بەش:

بەشی یەکەم:

ئەو موفتییانەی بە ڕەسمی و فەرمی فەرمانی فەتوایان لە دەوڵەتەوە بۆ دەرچووە. ئەمانە بریتین لە کۆمەڵێک زانا و کەسایەتی و، دواتریش کۆمەڵێک بنەماڵە و موفتی و موفتیزادە.

ئەم بەشە لە بەشی دووەم کەمتر و دیارترن.

بەشی دووەم:

ئەو مامۆستا و زانایانەی کوردستانن کە بە فەرمی فەرمانی فەتوایان بۆ دەرنەکراوە، بەڵام خۆیان زانا بوون و پلەی خوێندەوارییان بەرزبووە و، جێگەی ڕێز و متمانەی خەڵک بوون، بۆ کێشەی کۆمەڵایەتی و کاروباری ئاینی و فەتوا لە مەسئەلە شەرعییەکاندا پەنایان بۆ براوە و ئەوانیش بێ هیچ مەرج و مز و داوایەک بە دەنگ کێشەکانی خەڵکەوە چوون.

بەشی یەکەم هەرچەند لە بەشی دووەم زۆرتر و زیاترن ئەمانیش بۆ خۆیان ئەوەندە زۆرن ئەگەر کەسێ- یان کەسانێ- کی شارەزا بە پشووی قووڵەوە لەسەرخۆ بکەونە تۆمارکردنی ناویان و نووسینی هەندێک لە مێژووی ژیانیان، ئەوە دەتوانێ کتێبێکی گەورە و پڕ لە زانیاری و جێگەی شانازی لە ناوی ئەو کەڵەزانایانە پڕ بکاتەوە، کە نەک تەنیا کوردستان، بگرە لە وڵاتانی جیهانیشدا ناو و شۆرەتیان دەنگی داوەتەوە و خزمەتی دیاریان بە موسڵمانانی ئەو ناوچانە کردووە. من لە بابەتێکی وا کورتدا تەنیا بەوەدا دەگەم چەند نموونەیەکیان لێ بهێنمەوە و بە ناوی

پیرۆزیان ئەم بابەتە برازێنمەوە". بەڵام پێش ئەوە دەبێ ئاماژە بۆ یەک زانیاریی کورت و پێویست بکەم:

مەرج نییە موفتی زاناترین کەسی کوردستان بووبێت و لە ناوچەی خۆیدا کەس لەو زاناتر نەبووبێت، بگرە هەندێ جار وابووە مامۆستایەک بۆی رێککەوتووە چووەتە ئەستەمبوڵ و لە تاقیکردنەوەدا دەرچووە و بووە بە موفتی و ئەوەی بۆ ئەو گونجاوە بۆ کەسانی تر- با لەویش خوێندەوارتر بووبن- نەلواوە.

ئەم بابەتەیش یەکێکە لەو بابەتانەی من بزانم کاری بۆ نەکراوە و بابەتێکی زۆر دەوڵەمەند و ئاسۆفراوانیشە، تەنیا کارێک- من پێی بزانم- لەم بوارەدا کرابێت ئەوەیە کە خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس کردی و سێ بەرگی بە ناوی (جواهر الفتاوی)وە لە فەتوای مامۆستایانی کورد کۆ کردەوە، بەڵام مامۆستایش تەنیا لایەنی کۆکردنەوەی فەتواکانیانی گرتبووە ئەستۆی خۆی و ئەوەی نەکردبوو هەر مامۆستایەک لەو مامۆستایانەی لە کتێبەکەیدا ناوی هێنابوون شتێکی- با کەمیش بێ- لەسەر ژیانیان نووسیبا.

ئەمەیش من لێرەدا دەیکەم هەر بیرخستنەوە و خستنە بەرچاوی ئەم چینەیە لە زانایانی کورد، کە دەکرێ وەک بابەتێکی زۆر دەوڵەمەند پڕۆژەیەکی گەورەی لێ پێک بێت و لایەنێکی مێژووی گەورەزانایانی کوردی تێدا ڕۆشن بکرێتەوە.

من لەم هەلەدا لە خزمەت چەند مامۆستایەکی سلێمانی و دەوروبەریشدا دەوەستم کە هەندێ زانیاریم لەسەر فەتوا و ژیانیان هەیە، ئەمەیش ڕەنگە وەک نموونە هێنانەوە زیاتر بچێ تا مێژووی موفتییەکان و موفتییەکانی کوردستان لەوە زیاترن من بتوانم هەر ناویشیان لێرەدا تۆمار بکەم.

دەبێ کە باسی موفتییە کوردەکان دەکەم بەسەر ئەوەیشدا نەڕۆم- وەک لەم باسەدا دەیبینی- زانایانی کورد ئەوانەیان لە کوردستان دەرچوون بە زۆری لەو شوێنانەدا کە تیایانا نیشتەجێ بوون بە زۆری بوون بە موفتی، یان دەتوانین بڵێین: بە زۆری زانایانی کورد- با لەو شوێنانەدا غەیری موفتیشیان هەبووبێت- لە هەر شوێنێکدا بووبن پلە و توانای زانستییان وای لێ کردوون - تا ئەوان بووبن- کەم کەسی تر شیاوی ئەوە بوون پلەی فەتوا و ئیفتایان بدرێتێ، ئەمەیش لە بەغدا و مەکە و مەدینە و دیمەشق و شوێنانی تریشدا ئاشکرا و دیارە.

## زانایانی کورد و فەتوا

دەتوانین بڵێین لە مێژووی دێرینی کورددا دەستەڵاتی زانایانی کورد ئەگەر لە دەستەڵاتی میر و فەرمانداره کوردەکان باڵاتر نەبووبێ ئەوا شان بەشانی دەستەڵاتی ئەوان لە کاروباری ئاینی و کۆمەڵایەتیدا ڕۆڵی خۆی بینیوە.

لەبەرئەوە خەڵکی کوردستان پابەند بوون بە ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە و لادان و دەرچوون لە ڕێبازی ئەو ئاینە بە تاوانی گەورە ژمێرراوە، خەڵکی کوردستان لە کاروباری ڕۆژانەیاندا ئەگەر کێشەیەکیان بووبێ پەنایان بۆ لای مامۆستای گوند و ناوچەکانیان بردووە و لەلای ئەو شەرعیان

کردووه و، هەرچی شەرع بۆی دانابن سەرپێچییان لێ نەکردووه. لێرەوه فەتوا لە کوردستاندا هەر لە کۆنەوه دامەزراوه، هەر مامۆستایەک- بەپێی توانا و رۆڵ و دەرەتانی خۆی- موفتییەک بووه بۆ خۆی.

وەک باسی دەکەم مەرجیش نییه ئەو مامۆستایه بە فەرمی کرابێت بە موفتی، بەڵکو ئەوانەی بە فەرمی موفتی بوون لە چاو ئەوانەدا کە فەرمانی فەتوایان نەبووه زۆر زۆر کەم بوون.

لە باسی زانایانی کورددا -وەک لەمەولایش ئاماژەی بۆ دەکەم- دەکرێ ئەگەر بمانەوێ تۆزێک لق و پۆپی بچووک لەم باسە بکەینەوه ناوی ئەو زانا کوردانە ببەین کە لە دەرەوەی کوردستان و لە شارە گەورەکان و پایەتەختە دیارەکاندا موفتی و قازی و مامۆستای گەورە و دیار بوون دەست پێ بکەین. بەڵام ئەمەیش زۆری دەوێ و لێرەدا ناوی چەند کەسێکیان دەبەم و بە کورتیش لەسەر چەند کەسێکی تریان دەنووسم:

١- ئیسماعیلی ئامودی قازیی مەدینەی مونەووەرە.

٢- محەمەدی وانیی ناسراو بە وانقولیی، قازیی مەدینەی مونەووەرە.

٣- مەلا چەلەبیی دیاربەکریی قازیی قازییەکان (قاضي القضاة).

٤- محەمەدی گۆرانی قازیی حەلەب.

٥- عوسمانی کوردیی دادوەر لە قاهیرە.

٦- ئەحمەدی گۆرانی قازی و موفتیی لە قوستەنتەنیە.

٧- عەلی کوڕی قاسمی شەهرەزووری. قازیی واسیط و مووسڵ.

٨- محەمەدی کوڕی قاسمی کوڕی موزەفەری شارەزووری، قازیی جزیرە و شام.

٩- حسەینی کوڕی عەلی کوڕی قاسمی شارەزووری قازیی حەریمی (دار الخلافة) لە سەردەمی (المستنجد بالله)دا.

١٠- ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی قاسمی شارەزووریی قازیی مووسڵ.

١١- محەمەدی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی قاسمی شارەزووری، قازیی رەحبە و مووسڵ.

١٢- محەمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی قاسم قازیی قازییەکان[١]

١٣- محەمەدی کوڕی سولەیمانی کوردی- یان گەردیی- مەدینەیی. خاوەنی چەندان کتێب و فەتاوا. ١١٢٧- ١١٩٤ک ١٧١٥- ١٧٨٠ز[٢]

١٤- جەعفەی کوڕی حەسەنی کوڕی عەبدولکەریمی کوڕی محەمەدی کوڕی عەبدورەسووڵی بەرزنجی موفتیی شافیعی لە مەدینەی مونەووەرە.[٣]

---

(١) بڕوانە: محمد فيضي الزهاوي، محمد علي القرداغي، ص: ٨، ٩ . و شهرزور السليمانية، عباس العزاوي، ص:١٤٠ و ١٤٢ .

(٢) بڕوانە: معجم المؤلفين: ١٣٧/٣ و ٥٤/١٠ .

(٣) م: ١١٨٧ک ١٧٦٤ز.

### مەلای گۆرانی

زانای پایەبەرز ئەحمەد - شەمسەدینی- کوڕی ئیسماعیلی کوڕی عوسمانی گۆرانی

لە دەوروبەری (٨٩٩ک ١٤١٦ز)دا لە شارەزوور لەدایک بووە. لە کوردستاندا خوێندوویە، دوایی چووەتە قاهیرە و، قورئانی پیرۆزی بە هەر دە قیرائەتە بەناوبانگەکە خوێندووە، هەروەها زانستەکانی حەدیس و تەفسیری خوێندووە، زانایانی چەرخی خۆی ئیجازەیان داوەتێ. بەتایبەتیی ئیبنوحەجەر ئیجازەی حەدیسی داوەتێ و، زانایانی ئەو سەردەمە شایەتیی بە توانایی و زانایی و پلە و ڕێزی زۆریان بۆ داوە.

لە قاهیرە لەلای (ظاهر جقمق) پایەی بەرزی بەدەست هێناوە. دوایی لای سوڵتان موڕادی دووەم لە دەوڵەتی عوسمانیدا پلەی بەدەست هێناوە و، بووە بە مامۆستای سوڵتان محەمەد فاتیح و، لە ڕزگارکردنی (قسطنطنیە)دا بەشدار بووە و، لەو سەردەمەدا قازیی عەسکەر بووە. بەهۆی هەندێ نیگەرانییەوە چەند ئەمسەرە و سەری نێوان قاهیرە و ئەستەمبوڵی کردووە، لە هەردوو لایاندا جار لە جار زیاتر جێگەی ڕێزی دەستەڵاتدارانی هەردوو لا بووە.

ساڵی (٨٨٥ک- ١٤٨٠ز) بووە بە شێخولئیسلام و هەشت ساڵ شێخولئیسلام بووە لە ئەستەمبوڵ تا کۆچی دوایی لە (٨٩٣ک- ١٤٨٨ز)دا. ئەم زانا مەزنە جگە لەوەی لە گەلێ بواردا دەستی باڵای هەبووە و دانراوی تێیاندا بووە. کاری گەورەی لە زانستی تەفسیر و حەدیسدا هەبووە:

١- لە زانستی تەفسیردا کتێبێکی گەورەی داناوە بە ناوی: (غاية الأماني في تفسير السبع المثاني) ئەم کتێبە تەفسیرێکی گەورەیە و نووسخەی نایابی لە کتێبخانەکانی ئەستەمبوڵدا هەیە.

٢- لە زانستی حەدیسیشدا کتێبێکی گەورەی بە ناوی (الكوثر الجاري على رياض البخاري) داناوە. کە یەکێکە لە شەرحە ناسراوەکانی سەحیحی بوخاری.

جگە لە مانەیش مەدرەسەی تایبەتیی خۆی هەبووە بە ناوی مەدرەسەی گۆرانی و خۆی دەرزی تێدا گوتووەتەوە و، دوای خۆیشی تا ساڵی (١٣٣٧ک- ١٩١٨ز) بەردەوام بووە و جێگەی زانست بووە.(١)

### موفتییە عیمادییەکان - ئەبو سعوودی عیمادی

محەمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی مصطەفای عیمادی، ساڵی (٨٩٦ک- ١٤٩٤ز) لەدایک بووە، ساڵی (٩٨٢ک- ١٥٧٤ز) کۆچی دوایی کردووە.

لای گەلێک لە زانایانی چەرخی خۆی خوێندوویە، ئیجازەی لە شێخ عەبدوڕەحمانی ناسراو بە شێخ زادە وەرگرتووە. دوای ئیجازەوەرگرتنی لە چەند مەدرەسە لە مەدرەسە گەورە و

---

(١) بڕوانە: تأريخ مؤسسة شيوخ الإسلام في العهد العثماني ٨٣٨- ١٣٤١هـ ١٤٢٥- ١٩٢٢م. تأليف: أحمد صدقي علي شقيرات، الجزء الأول، الطبعة الأولى، أربد- الأردن ١٤٢٣هـ- ٢٠٠٢م. ص:٣٢٨ .

بەناوبانگەکانی تورکیادا دەرسی گوتووەتەوە.

ساڵی ٩٥٢ک- ١٥٤٥ز بووە بە موفتی، نزیکەی سی ساڵ لەو پۆست و پلەدا بووە، جاری وا بووە لە یەک ڕۆژدا وەڵامی (١٠٠٠) هەزار پرسیاری داوەتەوە. وەڵامەکانی جێگەی بایەخی زانایان بوون، جگە لە تەفسیرە بەناوبانگە ناسراوەکەی بە تەفسیری (أبي السعود) و جگە لە کۆمەڵە فەتاواکەی چەندان دانراوی بە نرخی لێ بەجێ ماوە.[١]

چەند دانە لە دانراوەکانی لە (م، و)دا پارێزراون لەوانە:

١- قانوون نامە. دوو دانەی هەیە بە ژمارەکانی (١١٥٥٤/٤) و (١٢٢٣٩/٢).

٢- فرائض أبی السعود (١٢٢٣٩/١).

**مفتي الفريقين وبركة الخافقين عبدالرحمن أفندي العمادي:**

ئەم مامۆستا کوڕی محەمەدی کوڕی محەمەدی عیمادی دیمەشقی ساڵی ١٠٥١ک- ١٦٤١ز کۆچی دوایی کردووە.

ئەم مامۆستا دانەری کتێبی (الروضة الريا فيمن دفن بداريا من الصحابة والتابعين)ە.[٢]

ئەم کتێبە نوسخەی لە (مكتبة الحرم المكي الشريف) و (م، و)دا هەیە.

لە (مكتبة الحرم المكي)دا بە ژمارە (/٢٨١٨ تراجم) پارێزراوە. لە (م، و)یشدا بە ژمارە (١١٥٧١) پارێزراوە.[٣]

**شێخ مستەفای موفتیی بەرزنجەیی**

ئەم زاتە کوڕی شێخ بابا ڕەسووڵی بچووکی کوڕی شێخ تەهای کوڕی شێخ ڕەسووڵی بایەزیدی کوڕی شێخ ئیسماعیلی کوڕی بابا ڕەسووڵی گەورەیە.

ساڵی ١٢٣٥ک - ١٨١٩ز لە گوندی بەرزنجە لەدایک بووە، لە سەردەمێکی زێڕینی زانستدا لە سلێمانی دەستی کردووە بە خوێندن و دوای هەندێ خوێندنی سەرەتایی لای موفتیی زەهاوی خوێندوویە، کاتێ موفتی زەهاویی سلێمانی بەجێ هێشتووە ئەمیش چووە بۆ سابڵاخ و لای مەلا چاکەکانی ئەوێ درێژەی بە خوێندن داوە، هەر لەوێ ئیجازەی زانستی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی لە مزگەوتی عەبدوڕەحمان پاشا- کە ئێستە بە مزگەوتی سەید حەسەن ناسراوە- بووە بە مامۆستا.

دوایی پلەی فەتوایشی بە فەرمی و فەرمان لەلایەنی دەوڵەتی عوسمانییەوە بۆ هاتووە. مامۆستای موفتی کارەکانی فەتوا و تەدریسی شان بەشانی خزمەتی موسڵمانان بەڕێوە بردووە و

---

(١) بڕوانە: عقود الجمان، ٦٣٥ .

(٢) بڕوانە: فهرس مخطوطات مكتبة الحرم المكي الشريف. ١١١٢/٣ .

(٣) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی دووەم، ل: ٩٢ پێشتریش لەم بەرگەدا باسی ڕابورد.

لە ژیانیدا شوێنده‌ستی دیار بووه‌ و جێگه‌ی ڕێزی موسڵمانان بووه‌.

ئه‌م مامۆستا به‌ڕێزه‌ له‌ ته‌ک ئه‌و توانایه‌یدا ئه‌دیبێکی به‌ توانا و هه‌ڵکه‌وتوویش بووه‌ و به‌ عه‌ره‌بی و فارسی و کوردیش شیعری جوانی هه‌بووه‌.

له‌سه‌ر ئه‌و خزمه‌ت و پله‌ و ڕێزه‌ ده‌وامی کردووه‌ تا له‌ ساڵی ١٣٠٢ک - ١٨٨٤ز دا کۆچی دوایی کردووه‌.[١]

## مه‌لا ئه‌حمه‌دی موفتیی چاومار

ئه‌م مامۆستا کوڕی مه‌لا مه‌حموودی کوڕی مه‌لا ئه‌حمه‌دی کوڕی مه‌لا محه‌مه‌دی ناسراو به‌ مه‌لا محه‌مه‌دی گه‌وره‌ی پیر حه‌سه‌نییه‌.

ئه‌م مامۆستا ساڵی ١٢٢٠ک ١٨٠٥ز له‌ شاری سلێمانی له‌دایک بووه‌، له‌ مه‌دره‌سه‌ی خانه‌واده‌که‌ی خۆیاندا که‌ پشتاوپشت مه‌لا و مه‌لازاده‌ بوون، سه‌ره‌تای خوێندنی ده‌ست پێ کردووه‌، دوایی له‌لای شێخ مه‌عرووفی نۆدێیی و مامۆستا مه‌لا عه‌بدوڵڵای ره‌ش و مامۆستایانی تری شاره‌که‌ خوێندوویه‌تی، دوای ئه‌وه‌ که‌ خوێندنی ته‌واو کردووه‌ و ئیجازه‌ی مه‌لایه‌تی وه‌رگرتووه‌ بووه‌ به‌ مامۆستای مزگه‌وتی موفتی له‌ سلێمانی، فه‌قێی زیره‌ک و به‌ توانا نموونه‌ی موفتی زه‌هاوی و مه‌لا عه‌بدوره‌حمانی پێنجوێنی له‌ خزمه‌تیدا کۆبوونه‌ته‌وه‌ و سوودیان له‌ زانیاری و توانای به‌رزی بینیوه‌. ئه‌م مامۆستا نموونه‌یه‌ک بووه‌ له‌ زیره‌کی و بلیمه‌تی و توانای به‌رز و که‌م وێنه‌. هه‌ر له‌به‌ر ئه‌و زیره‌کییه‌ی ناوبانگی به‌ (موفتی چاومار) ده‌رکردووه‌.

دوای کۆچی دوایی شێخ مه‌عرووفی نۆدێیی له‌ ساڵی ١٢٥٥- ک ز بووه‌ به‌ سه‌رۆکی زانایانی سلێمانی و ده‌وروبه‌ری و، له‌سه‌ر ڕێبازی زانا گه‌وره‌کانی کوردستان له‌ ته‌ک پله‌ی موفتێتیا خزمه‌تی مامۆستایان و خه‌ڵکی شاره‌که‌ی کردووه‌.

پله‌ی ئیفتایش له‌ خۆیه‌وه‌ گوێزراوه‌ته‌وه‌ بۆ مه‌لا محه‌مه‌دئه‌مینی کوڕی و دوای ئه‌ویش بۆ مه‌لا عه‌بدولعه‌زیزی کوڕه‌زای.

ئه‌م مامۆستا به‌ڕێزه‌ دوای ته‌مه‌نێکی پیرۆزی پڕ له‌ خزمه‌تی زۆر و به‌ پیت ساڵی ١٢٨٨ک - ١٨٧١ز کۆچی دوایی کردووه‌.[١]

## مامۆستا مه‌لا ئه‌حمه‌دی دێلێژه‌یی

گه‌لێک له‌و مامۆستایانه‌ی من له‌م هه‌له‌دا ناویان دێنم و له‌ ریزی موفتییه‌کانی کوردستاندا، هه‌ر یه‌که‌یان، ماوه‌یه‌کی که‌م له‌ خزمه‌تیاندا ده‌ژیم، شیاوی ئه‌وه‌ن نامیلکه‌ و کتێب و باسی تێروته‌سه‌لیان له‌سه‌ر بنووسرێ و ناویان و مێژووی ژیانیان و به‌رهه‌مه‌کانیان به‌ نه‌وه‌کانی خۆیان له‌ کوردستان و زانایانی جیهان له‌ جیهاندا بناسێنرێن. به‌ڵام به‌داخه‌وه‌ من کات و بواری ئه‌وه‌م

---

(١) بڕوانه‌: علماؤنا في خدمة العلم والدين. ص: ٥٦٦ .

(١) بڕوانه‌: علماؤنا في خدمة العلم والدين. ص: ٧٦ .

نییە ئەو کارە ئەنجام بدەم و، ئەوەی لێرەدا پێم دەکرێ ئەوەیە ئەم باسە بە ناوی ئەو مامۆستا بەڕێزانە پیرۆز دەکەم و، بە چەند دێڕێک بۆ هەر یەکێکیان یادیان زیندە رادەگرم، بەڵکو خوا بک لەمەولا کەسانی بە ئەمەک و لێهاتوو لە من زیاتریان بۆ ئەو مامۆستایانە پێ بکرێ.

دەبێ بەسەر ئەوەیشدا نەڕۆم زۆر لەو موفتی و زانایانە هەوڵی کۆکردنەوەی فەتواکانی خۆیان نەداوە، دیارە یەکێکیش خۆی خەمی خۆی نەخوات کەسانی تر- هەرکەسێ بێ- لە خۆی دڵسۆزتر نابن بۆ ئەوەی ئەو کارەی ئەو ئەنجامی نەداوە ئەمان ئەنجامی بدەن. لەبەر ئەم هۆیەش دەبینین شوێنەوار و فەتوای ئەو زانایانە پەرتەوازە و بێ ناز و لە بەردەم گەلێ هەڕەشە و مەترسیی گەورەدا لەملاولا بەرەو لەناوچوون دەڕۆن.

یەکێک لەو مامۆستایانەی لەم نەریتە باوەی ناو زانایانی کورد لای داوە و، پێڕەوی ڕێبازێکی دروست و بەسوودی بۆ خۆیی و مێژووی زانایانی گەلەکەی کردووە مامۆستا مەلا حەمە سەعیدی کوڕی مامۆستا مەلا ئەحمەدی دێلێژەیە. ئەم مامۆستا بەڕێزە بەشێک لە فەتواکانی باوکی لە تەک کۆمەڵێک فەتوای زانایانی ئەو سەردەمەدا کۆ کردووەتەوە و پێکەوە جزوبەندی کردوون و باش پارێزراون، ئەگەر بگونجێ و کەسی خۆی هەبێت شیاوی ئەوەن- وەک: یادگارێکی مەزنی ئەو مامۆستا- چاپ بکرێن و جێگەی خۆیان لە کتێبخانەی کوردستان و موسڵمانان‌دا پڕ بکەنەوە.

بەڵام دووبارە داخ و کەسەری ئەوە دەچێت بە دڵی ئەو کەسانەوە بە پەرۆشی زانینی مێژووی ئەم زانایانەوەن کە خۆیان لە پاڵ فەتاواکانیاندا شتێک- با کورتیش- یان لەسەر ژیانی خۆیان نەنووسیوە، هەروەها- وەک وتمان کە خۆیان هیچیان بۆ خۆیان نەکردووە- نەوەکانیان و مامۆستا و ڕۆشنبیرانی هاوچەرخیشیان کارێکیان بۆ نەکردوون.

ئەوەی لەبارەی ئەو مامۆستا بەڕێزەوە- مامۆستا مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی- نووسراوە و زانراوە زۆر کەمە و بە هیچ کلۆجێک لە ئاستی پلە و ڕێزی ئەو مامۆستادا نییە. بەڵام کە لەوە زیاتر لە دەستدا نەبێ ناچارین لەم هەلەدا پوختەی ئەوەی لەسەری نووسراوە بخەینە دامێنی باسی فەتواکانی:

**مامۆستا مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی**

ئەم مامۆستا بەڕێزە ساڵی ١٢٥٠ک - ١٨٣٤ز لە گوندی دێلێژەی سەر بە قەرەداغ لەدایک بووە، لە حوجرە و مزگەوتەکانی قەرەداغ و سلێمانی درێژەی بە خوێندن داوە تا سەرکەوتووە و هەڵکەوتووە و بووە بە زانایەکی گەورەی چەرخی خۆی.

وەک مامۆستا گەورەکانی ئەو سەردەمە دەستی کردووە بە دەرزوتنەوە و پێگەیاندنی فەقێیان و ئیجازە پێدانیان. یەکێک لەو زانایانەی لە بەردەستی ئەودا پێگەیشتوون زانای پایەبەرز مامۆستا مەلا حەمە سەعیدی کوڕی بووە، کە دواتر بە مامۆستا مەلا حەمە سەعیدی مزگەوتی خومخانە ناسرا.

مامۆستا مەلا ئەحمەد زانایەکی بلیمەت و خاوەنی بیرێکی تیژ و هۆشێکی کەموێنە بووە، لە

تەک مامۆستایانی سەردەمی خۆیدا گفتوگۆی زانستییانە و موناقەشەی فەتاوا و مەسەلە ئاینییەکانی زۆر بووە، بەتایبەتی لە تەک مامۆستا مەلا عەبدورەحمانی پێنجوێنیدا.

ئەم مامۆستا بەرێزە پەراوێز و تەعلیقاتی بەسەر کتێبە شەرعەکانەوە هەیە، دوو دانراوی لە شوێن بەجێ ماوە:

١- الرسالة الكلامية.

٢- رسالة الفتاوى الفقهية.

هەردووکیان دەستخەتن و لە کتێبخانەی خوالێخۆشبوو مەلا حەمە سەعیدی کوڕیدان تا ئێستە چاپ نەکراون.

مامۆستا مەلا ئەحمەد ساڵی ١٣١٨ک-١٩٠٠ز لە شاری سلێمانی ماڵئاوایی لە دنیا کردووە.[١]

تا ئێرە پوختەی وەرگێڕراوی ئەوەیە کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریم لە (علماؤنا في خدمة العلم والدين)دا لەسەر ئەم مامۆستا نووسیویە.

منیش لە پەراوێزی نووسینەکەی مامۆستاوە دەڵێم:

ئەو کتێبەی کە مامۆستا دەفەرمووێ (الرسالة الكلامية) دیارە هەر ئەوەیە کە ناوی (رسالة وجود الواجب)ە و ساڵی ١٣٥٤ک- ١٩٣٥ز لە چاپخانەی سلێمانی چاپ بووە و، لە خزمەت نوسخەیەکی دام.

دووەم: ئەو کتێبەی کە مامۆستا دەفەرمووێ (رسالة الفتاوى الفقهية) دوور نییە ئەو کۆمەڵە فەتاوا بێت کە نەوەکانی مامۆستا مەلا حەمە سەعیدی کوڕی مامۆستای دێلێژەیی شەرەفی ئەوەیان پێ رەوا بینیم کە ئەم کتێبەم پێشکێش بکەن بۆ ئەوەی لە ڕێگەی کتێبی «بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی...» وە کارێکی بۆ بکەم. لە تەک سوپاسی زۆرمدا بۆ ئەو بەرێزانە لێرەدا ئەوەندەی ئەم کتێبە و بەرنامەکەی جێگە و ڕێگە بدا ئەم یادگارە مەزنە بە مێژووی زانایانی کورد دەناسێنم. بەڵام پێش ئەوەی بێمە سەر باسی دەستخەتەکە و فیهرەستەکەی بنووسم دەڵێم: دێمەوە سەر ئەو باسەی گەلێ جار نووسیومە ئەویش فەوتان و تێداچوونی شوێنەواری زانایان و مامۆستایانی کوردە. ئەم مامۆستا مەزنە مامۆستا مەلا حەمە سەعیدی کوڕی لە هەوڵی ئەوەدا بووە شوێنەوارەکانی باوکی کۆ بکاتەوە و وەک بینیمان فەتاواکانی کۆ کردووەتەوە، بەڵام مامۆستا مەلا ئەحمەد کتێبێکی نایابی لە شەرحی ئادابدا بۆ بەرپرسێکی ئەو سەردەمەی بەغدا کە ناوی ئەحمەد سدقی ئەفەندی بووە نووسیوە. نوسخەی کتێبەکەی لە بەغدا پارێزراوە[٢]، نوسخەکەیش بە خەتی مامۆستای دێلێژەیی خۆیەتی، کەچی نەوەی مامۆستای دێلێژەیی ئاگایان لەم باسە نییە و بە بیریاندا نایەت مامۆستا مەلا ئەحمەد دانراوی وەهای بووبێت، بۆیە بە دووری ناگرم دانراوی تریشی بووبێت، بەڵام یان لەناوچوون یان ئێمە- ئێستە- شوێنیان نازانین.

---

(١) بڕوانە: علماؤنا في خدمة العلم والدين، ص: ٨٢ .

(٢) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، بەرگی ٣ ل: ٣٤٧ .

ئەم دانراوە لە بەغدا لە کتێبخانەی (المركز الوطني للمخطوطات)دا پارێزراوە، بە خەتی دانەرەکەیەتی و ساڵی ١٢٨٤ک نووسیویەتییەوە.

باسی دەستخەتەکە:

ئەم دەستخەتە کتێبێکە تێکڕا ٣٧٤ لاپەڕەیە. جزوبەند کراوە، بەرگی تێ گیراوە، باش پارێزراوە، خەتی دوو سێ نووسەرەوەی تێدایە، بەشێکی خەتی نووسەرەوەیەکە لەوانەیە فەقێی مامۆستا مەلا حەمە سەعید بووبێت" چونکە بۆ ئەوی نووسیوەتەوە، ناوی محەمەد ئەفشاری- هەوشاری- یە، ئەم نووسەرەوە دوا مێژووی نووسینەوەی ساڵی ١٣٥١ک -١٩٣٢ز بووە. وەک گوتم خەتی چەند کەسی تریشی تێدایە.

لە کۆتاییەوە بە قەڵەمی (ڕەصاص) فیهرەستێک بۆ ئەم دەستخەتە کراوە، ئەو فیهرەستە وەک خۆی دەنووسم، دوای ئەوە خۆیشم چاوێک بە دەستخەتەکەدا دەخشێنمەوە و چی شتی بە بایەخی تێدا بخوێنمەوە بە کورتی ئاماژەی بۆ دەکەم.

فیهرەستی دەستخەتەکە:

١٨- آيات في فضل العلم ............ ٥٨

١٩- الباب الأول في الاصطلاحات ............ ٦٠

٢٠- الباب الثاني في الكتب المعتمدة ............ ٦٢

٢١- الباب الثالث في جواز التقليد ............ ٦٤

٢٢- الباب الرابع في شروط التقليد ............ ٦٧

٢٣- خاتمة شروط نقض حكم القاضي ............ ٦٩

٢٤- ما حقيقة الرؤيا ............ ٧٣

٢٥- رسالة في- الافتاء برفع التحليل لملا قادر البيارەیی ............ ٧٤

ئەو فیهرەستەی بۆ دەستخەتەکە کراوە لێرەدا بە ناتەواوی ماوەتەوە، واتە ئەو کەسەی ویستوویەتی ئەو فیهرەستە بکا لێرەدا- لەبەر هەر هۆیەک- دەستی لێ هەڵگرتووە. من لێرەوە تەواوی دەکەم.

٢٦- چەند فەتوایەک ............ ٨١

٢٧- جواز التحكيم قزڵجی ............ ٩٢

٢٨- چەن فەتوای نۆدێیی و نۆتشی و مزووری و، پێنجوێنی ............ ١٠١

٢٩- لە لاپەڕە ١٠٣دا نووسیویە:

«يحيى المزوري. كتبت حين استماع إيقاع القي بالسليمانية. وكنت خائفاً من فراق إخوان السليمانية بموتنا أو بموتهم آخ من الفراق. في سنة ١٣٢٢»

٣٠- لە دوای چەند فەتوا لە لاپەڕە ١١٤دا نووسیویە:

«كتبته بعد المراجعة من... پينجوين وحين وصول المراسلة في نحو محمد أفندي زرداو في قرية سيتك وإخباره بأنه قد توفي من سليمانية بعلة الوباء خمسون شخصاً اللهم احفظ أحبابنا جميعاً خاصة كريم أفندي. في سنة ١٣٢٢ شهر جمادي».

٣١- چەند فەتوا و هۆنراوە، (أداة التعليق)ی دانراوی پێنجوێنی ١٢٣

٣٢- لە دوای چەند فەتوای ترەوە لە لاپەڕە ١٣٢دا نووسیویە:

«كتبت حين كنت عاجزاً من موت قوة ظهري وكبدي وباعث حياتي ملا عزيز بعلة الوباء شهر جمادي الأولى عشر الأول سنة ألف وثلاثمائة واثنان وعشرون من هجرة النبوية عليه وآله ألف سلام وتحية آخ من...»

نووسەرەوەی ئەم فەتوانە کە باسی مردنی مەلا عەزیز دەکات و ئێمەیش نازانین مەلا عەزیزی کۆچکردوو کێیە.. ئەمیش ناوی مەلا عەزیز بووە و لە شوێنێکدا نووسیویە:

«بيد عزيز حين التعجيز بموت عزيز آخ ألف آه»

٣٣- لە دوای چەند فەتوای ترەوە کە دواییینیان فەتوای پێنجوێنییە نووسیویە:

«كتبه بيده حقير محمد علي ١٣٢٢» ل: ١٤٧ .

٣٤- كۆمەڵێكی زۆر فەتوای جیا جیای زانایانی جیا جیا، هەر فەتوایەكیان لاپەڕەیەك كەمتر یان زیاتر تا لاپەڕە ٢٢٣ لەوێدا لە پەڕاوێزدا نووسیویە:

«كتبه عزيز قبيل الغروب بجامع وسطه حاج فتح الله الپينجويني حين كنت متفكراً من تلطفات كريم أفندي وفراقه، اللهم أوصل الينا(!) ولو في المحشر آمين.»

٣٥- دوای ئەوەیش چەند فەتوایەكی مامۆستایانی وەك نۆدشی و پێنجوێنی و نۆدێیی و چەند كەسی تر نووسراوە تا لاپەڕە ٢٤٥ . لەوێدا نووسیویە:

«قد حرر العزيز بپينجوين بأمانة ملا محمد خواهر زاد، وقد كنت متأسفاً من الوباء الواقعة بالسليمانية وخائفاً من فراق أصحابنا في العمل والتحصيل، خاصة منهم كريم أفندي. اللهم احفظهم عميماً خاصة ميرزا كريماً لازال أعطاؤه علينا جديداً وقديماً آمين بحرمة محمد في سنة ١٣٢٢ آخر (٢٧) شهر جمادي الأولى.»

٣٦- دوای ئەمەیش تا لاپەڕە ٢٥٧ چەند فەتوای مامۆستایانی كورد هەیە، لە لاپەڕە ٢٥٧دا نموونەیەكی نایابی ڕێزی نێوان مامۆستایان و زانایانی پێشوومان هەیە، شیاوی ئەوەیە بنووسرێ و بزانرێ بۆ ئەوەی پەیڕەوی بكرێ. لەسەر فەتوایەك نووسویە:

«هذا ما قاله المتبحر النودشي- رحمه الله- حين المناظرة مع الفاضل القزلجي-رحمه الله- أيضاً بعد مراجعته من قرية الطويلة بترجان كما تراه بعيد ذلك».

لە دوای ئەو فەتواوە كە ئاماژەی بۆ كردووە مامۆستای نۆدشی نووسیویە:

«مولاي وسيدي، هذا هو الذي يخطر بقلبي في جعل قول الكردي المذكور صريحاً. وإنما القبول والرد إلى جنابكم، فإن تلقاه طبعكم المحقق المدقق النقاد بالقبول فهو غاية المأمول. ونهاية المسؤل، وإلا فأنا أخس تلميذ ومتجرع قطرة من جرّتكم، فأين السهى من القمر، واللؤلؤ من المدر؟! أحمد النودشي النودي»

٣٧- لەوێیشەوە تا لاپەڕە ٢٨٩ كۆمەڵێكی تر فەتاوای مامۆستایانی كوردستانە، كە بە زۆری باسی نیكاح و تەڵاقن، لە كۆتایی دوا فەتواوە مامۆستا مەلا عەبدولقادری كانی كەوەیی ناڕەزایی لە بارودۆخی مامۆستایان دەردەبڕێ و دوعایان لێ دەكا و دەفەرمووێ:

«نعوذ بالله من إفتاء بعض علماء زماننا وإفتائهم ليس الأغواء (!) فقد ضلوا وأضلوا أصلح الله حالهم أو قتلهم ليستريح الناس من إفسادهم والله أعلم. المدرس ببياره عبدالقادر».

٣٨- نامیلكەیەك لە باسی تەقلیددا دانراوی پێنجوێنی. ل: ٢٩٠

٣٩- لە لاپەڕە ٢٩٥یشەوە كۆمەڵێك فەتاوا نووسراوە بە زۆری فەتاوای مامۆستای پێنجوێنین لە كۆتاییانەوە نووسیویە:

«كتبته حين وصول المراسلة من نحو محمد أفندي زرداو وإخباره بنا بأنه قد توفي خمسون بل ستون شخصاً كل يوم من السليمانية بالقيء. اللهم احفظ أستاذنا وملاذنا ملا محمد أمين

وأحبابنا وأصحابنا جميعاً، خاصة كريم أفندي. بحرمة من بشر بشارة وإنذاراً. آمين يارب العالمين. آه من الفراق آه ولا حول ولا الخ...» ل: ٣٤٦

٤٠- لێرەیشەوە تا کۆتایی چەند فەتوای تر نووسراوە بە زۆری-دووبارە- فەتوای مامۆستای پێنجوێنین و فەتوایەکی مەلا ڕەسووڵی زەکی و چەند کەسی تری تێدایە. لە تەک باسێکدا لەسەر خواردنی سەربڕراوی دەستی جوولەکە. لە کۆتاییەوە محەمەدی ئەفشاری (هەوشاری) دەڵێ: لەبەر خاتری مامۆستا مەلا محەمەد سەعید ئەفەندیی ساڵی ١٣٥١ک ز نووسیمەوە. ل: ٣٦٩.

٤١- دوای ئەوەیش چەند فەتوایەکی تر نووسراوە. کۆتاییی دەستخەتەکە لاپەڕە ٣٧٣یە.

واتە نووسینەوەی ئەم دەستخەتە یان کۆکردنەوەی بابەتەکانی ناوی لە ١٣٢٠وە تا ١٣٥١، ٣٠ساڵی زیاتر پێ چووە.

ئەگەر چاوێکی تر بە لاپەڕەکانی ئەم دەستخەتەدا بگێڕین دەبینین لە مێژووی جیا جیادا چەند کەس بەشدارییان لە نووسینەوەیدا کردووە. لەوانە: محەمەد ساڵح ساڵی ١٣٢٠.

وەک بینیمان عەزیز ناوێکیش بەشی زۆری ئەم دەستخەتەی نووسیوەتەوە، ئەمیش لە ساڵی ١٣٢٢دا بووە. هەروەک بینیمان محەمەدی ئەفشاری- هەوشاری- ش ساڵی ١٣٥١ کاری لە نووسینەوەیدا کردووە.

**مامۆستا مەلا حەمە سەعیدی خومخانە**

مامۆستا مەلا حەمە سەعید کوڕی مامۆستای بەناوبانگ مامۆستا مەلا ئەحمەدی دێلێژەییە.

ئەم مامۆستا بەڕێزە لە دەوروبەری ساڵی ١٣٠٤ک دا لە شاری سلێمانی هاتووەتە دنیا، لای باوکی بەڕێزی خوێندوویە و، دواتریش لە حوجرەکانی کوردستان وەک باوی ئەو سەردەمە خوێندوویە. زیرەکییەکی باش و توانایەکی کەموێنەی تێدا بووە. دوای تەواوکردنی زانستە باوەکانی ئەو سەردەمەی کوردستان و دوای وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی و دەرزوتنەوە، لە مزگەوتی (خومخانە) بووە بە مامۆستا و قوتابی و فەقێی زیرەک و شەیدایانی زانستی باڵا لە هەموو لایەکەوە هاتوونەتە خزمەتی و لە دەوری دەرز و مەدرەسەکەی کۆبوونەتەوە و لە خزمەتیا بە پەرۆشەوە خوێندوویانە.

لەناو زانایانی سلێمانیدا جێگەی ڕێز بووە و قسە و فەتوای ڕەوا بووە. لە دوا دوایی تەمەنیدا تووشی شەلەل بووە، بەڵام بەو نەخۆشییەشەوە هەر خەریکی خزمەتی زانست بووە و کۆڵی نەداوە. تا لە دەوروبەری ساڵی ١٣٦٥ک- ١٩٤٩ز دا کۆچی دوایی کردووە.(١)

ئەم مامۆستایش گەلێ فەتوای هەبووە، بەڵام بەداخەوە کە فەتواکانی باوکی و زانا گەورەکانی کۆ کردووەتەوە ئەو بایەخەی بە فەتواکانی خۆی نەداوە و فەتواکانی پەرتەوازە بوون و تێدا چوون.

ئەوەی من بزانم لە شوێنەواری مابێتەوە نامیلکەیەکی بچکۆلەیە بە ناونیشانی «رسالة فتح

---

(١) بڕوانە: علماؤنا في خدمة العلم والدين، ص: ٨٢ .

الرحمن في الرد على منكر الطلاق الثلاث وطلاق السكران» ساڵی ١٣٦٨ک- ١٩٤٩ز له سلێمانی چاپ بووه.

تەقریظ و بە باڵابرینی ماموستایان: مەلا حسەینی پیسکەندی و شێخ نووری شێخ بابا عەلی و سەید عەبدولغەفوور و سەید ئەحمەدی کوڕی سەید عەبدورەحمانی عازەبانی بەسەرەوەیە.

ماموستا مەلا حەمە سەعید نامیلکەیەکیشی بووه له فەرائیضدا، دەڵێن چاپ کراوه، هەوڵم دا نوسخەیم دەست نەکەوت.

ماموستا مەلا حەمە سەعیدی خومخانە لەو مزگەوتەیدا خزمەتی زانایانی کردووه و فەقێی باشی پێ گەیاندووه تا له خزمەتیدا بوون به مەلا چاک و ئیجازەی تەدریسی داونەتێ. دەتوانین لەو ماموستایانەی ماموستا مەلا حەمە سەعید پێی گەیاندوون ناوی ئەم چەند بەڕێزە ببەین کە بێگومان ئەمانە بەشێکی کەمن لەبەری رەنجی (٥٠) ساڵ خزمەتی ماموستا مەلا حەمە سەعید له رێگەی پێگەیاندنی ماموستایاندا:

١- دوکتۆر مستەفا زەڵمی.

٢- دوکتۆر فازیل عەبدولواحید.

٣- مەلا عەبدولعەزیم.

٤- مەلا قادری کۆکۆیی.

٥- مەلا سەعیدی شانەخسەیی.

٦- مەلا مەحموودی گرگاشەیی.

٧- مەلا محەمەدی تەوێڵەیی.

ماموستا مەلا حەمە سەعید ذەوقی ئەدەب و شیعریشی هەبووه و له تەک ماموستا مەلا مەحموودی بێخوددا نێوانیان خۆش بووه و ماموستا بێخود به شیعر مێژووی لەدایکبوونی منداڵەکانی بۆ نووسیوه.(١)

## ماموستا شێخ مستەفای موفتیی هەڵەبجە

ئەم زاتە کوڕی شێخ مەحموودی کوڕی شێخ عەبدوڵلای خەرپانییە، ساڵی ١٢٩٥ک- ١٨٧٨ز له هەڵەبجە لەدایک بووه و سەرەتای خوێندنی له خانەوادەی خۆی و مەدرەسەی باو و باپیریدا بووه، هێشتا خوێندنی تەواو نەکردووه باوکی کۆچی دوایی کردووه، ئەمیش بۆ خوێندن رووی کردووەتە بیارە و له خزمەت ماموستا مەلا عەبدولقادری بیارەدا درێژەی به خوێندن داوه تا ئیجازەی تەدریسی له ماموستای ناوبراو وەرگرتووه و گەڕاوەتەوە هەڵەبجە و له جێگەکەی باوکیدا بووه بەئیمام و خەطیب و مودەڕیس. دواتریش فەرمانی فەتوای بۆ دەرچووه و وەک باوکی بووه به موفتی هەڵەبجە. له ژیانیدا تووشی دوو کارەساتی ناخۆش بووه:

---

(١) بۆ ئەم بابەتە جگە له (علماؤنا في خدمة العلم والدين) سوودم له وتارێکی خوالێخۆشبوو جەمال موفتی وەرگرتووه که وێنەکەیم لەلایە. بەڵام ژمارەکەی نازانم. که لەوانەیه له (هاوکاری)دا بلاو بووبێتەوه.

یەکەمیان: ئەوە بوو ئەم مامۆستا بەڕێزە دژی ئینگلیز و دەستەلاتیان بوو لە ناوچەکەدا و بەرهەڵستی کردن، ئەنجام بە دەستی هەوا خواهانی ئینگلیز دیل و دەستگیر کرا و سزا و ئەشکەنجەیەکی زۆر درا و، بە کۆت و بەندەوە چەندان ڕۆژ لەبەر خۆری هاویندا رایان گرت. ئەنجام سزا و تۆڵەیەکی گەورەی هەزاران روپیەییان بەسەردا سەپاند، تا ناچار هەرچی زەویوزار و باخ و ئاش و سامانیان هەبوو هەمووی فرۆشت تا لەو تۆڵە و غەرامە دەرچێ.

دووەمیان: تووشی نەخۆشیی پرۆستات بوو، لەو سەردەمەیشدا چارەسەری ئەو نەخۆشییە ئاسان نەبوو، بەو دەردە ساڵی ١٣٨٧ک –١٩٦٧ز کۆچی دوایی کرد.[١]

یەکێک لەو زیانە مێژوویییانەی کە هەرگیز لە دڵم دەرناچێ ئەوە بوو: بە ژیاندا بە خزمەت تووباخانی خێزانی شێخ مستەفای موفتی گەیشتم و بە وردی بەسەرهاتی مامۆستای مێردی دەزانی، من نەمکرد درێژەی ئەو کارەساتە لە دەمی ئەو خانمە بەڕێزە وەربگرم، تا ساڵی ١٩٨٨ لە کیمیابارانی هەڵەبجەدا شەهید بوو بە ڕەحمەتی خوا شاد بوو.

## چەند قازییەکی تر:

### قازیی قازییەکان نیزامەدین عەبدولمونعیمی بەندەنیجی:

ساڵی ٥٩١ک– ١١٩٢ز لەدایک بووە، سەرەتای ژیانی لە مەدرەسەی (فخر الدولة)ی کوڕی موتەلیبی ناسراو بە (دار المذهب) خەریکی خوێندنی شەرع بووە تا تێیدا سەرکەوتووە و بووە بە موفتی، دوایی بووە بە مامۆستای بەشی شافیعیی لە مەدرەسەی موستەنسەرییە لە بەغدا. ساڵی ٦٦٧ک– ١٢٦٧ز کۆچی دوایی کردووە.[٢]

### ئەبوعەلی بەندەنیجی

ئەبوعەلی، حەسەنی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی یەحیای بەندەنیجی. سەرەتای خوێندنی لە وڵاتی خۆیدا بووە، دوایی چووەتە بەغدا و لەوێ حوکمی کردووە. دوایی گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتی خۆی و ساڵی ٤٢٥ک– ١٠٢٤ز لەوێ کۆچی دوایی کردووە.[٣]

### زەیدولعابیدینی گۆرانی موفتیی بەغدا:

باسی ئەم مامۆستا تەنیا لە یەک دەستخەتدا هەیە کە ئەویش دانراوی خۆیەتی و بەپێی ئەو دانراوە، ساڵی ١١٦٥ک– ١٧٥١ز موفتی بەغدا بووە، بەڵام لەوە زیاتر زانیاریم لەبارەیەوە دەست نەکەوتووە.[٤]

---

(١) بڕوانە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ص: ٥٦٧ .

(٢) بڕوانە: بندنیجین (مندلي).

(٣) بڕوانە: بندنیجین (مندلي) في التأريخ قديماً وحديثاً، محمد جميل الروژبياني، مجلة المجمع العلمي العراقي، الهيئة الكردية– العدد (٧) ١٩٨٠ ص: ٣٦٠ .

(٤) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد... بەرگی چوارەم، ل: ١٤٩ .

### سیبغەتوڵڵای حەیدەری:

کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەری کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی حەیدەر پیرەدین. ئەم مامۆستا باپیری حەیدەرییەکانی بەغدایە کە پلەی فەتوای شافیعی و حەنەفی لە بەغدادا تەنیا بە دەست ئەوانەوە بووە و لەواندا بووە.

گەلێ دانراوی بە سوودی هەیە لەوانە:

١- ناملیکەیەک لە طاعووندا.

٢- حاشیەی بەسەر تەفسیری سوورەتی فاتیحەی بەیضاوییەوە.

٣- حاشیەی لەسەر بەیضاوی.

٤- رسالة في تحقيق زيادة الصفات.

٥- رسالة في مدح بعض الوزراء بالفارسية...

چەند دانراوی تریش

ئەم مامۆستا ساڵی ١١١٠ک- ١٦٩٨ز لەدایک بووە، ساڵی ١١٨٨ک- ١٧٧٤ز کۆچی دوایی کردووە، لە مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بە خاک سپێرراوە.[١]

### زیائەدین حەیدەری حەیدەریی:

ئەم مامۆستا کە کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەرە ساڵی ١٢٤٦ک- ١٨٣٠ز لەدایک بووە سەرەتای خوێندنی لەلای باوکی لە بەغدا و دوایی خوێندنی لە کوردستان تەواو کردووە، دواتر لە حەمیدیە و بەغدا موفتی بووە. دەرزی گوتووەتەوە و کتێبی داناوە لە دانراوەکانی ئەمانەم زانیوە:

١- عمدة الكلام في شرح برأة الأنام.

٢- شەرحی نامیلکەی بەیانی مامۆستا مەلا ئەحمەدی گەرەویی.

مێژووی کۆچی دواییم نەزانی.[٢]

### عوبەیدوڵڵای کوڕی عوبەیدوڵڵای حەیدەریی:

ئەم زانا یەکێکە لە زانا زۆر مەزنە حەیدەرییەکان کە گەلێکیان موفتیی شافیعی و حەنەفی و مامۆستای مەدرەسەکانی بەغدا بوون، بەڵام بەداخەوە ژیانی ئەو مامۆستا مەزنانە کە خاوەنی دەیان دانراو بوون و لە چەندان مەدرەسەی گەورەدا دەرزیان گوتووەتەوە بە وردی نەنووسراوە و، کەم لەبارەیانەوە دەزانرێت و، زۆریان ساڵی لەدایکبوون و مردن و ماوەی موفتێتییان لە بەغدا و شارەکانی تردا نەزانراوە. ئەمەیش ناوی چەند کەسی تر لەو موفتییە حەیدەرییانە:

١- عەبدولغەفووری حەیدەری.

---

(١) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد. بەرگی شەشەم، ل: ٢٢٩ .

(٢) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد... بەرگی شەشەم. ل: ٢٥٠ .

٢- ئەسعەد سەدرەدینی حەیدەری.
٣- عەبدوڵڵا ئەفەندیی حەیدەری.(١)

**مامۆستا مەلا ئەحمەدی نۆتشیی:**

ئەم مامۆستا ١٢٢٨ک ١٨١٣ز چاوی بە جیهانی بەریندا هەڵهێناوە.

مامۆستا دوای تەواوکردنی خوێندنی لە خزمەتی گەلێ لە مامۆستا گەورەکانی ئەو چەرخەدا وەک شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی و وێنەی ئەو و ئیجازەوەرگرتنی ماوەیەک لە شاری سلێمانی موفتی بووە.

دوایی چووەتە شاری سنە و لەوێ ساڵی ١٣٠٢ک - ١٨٨٤ز کۆچی دوایی کردووە. لەوێش- واتە لە شاری سنە- موفتی بووە.

ئەم مامۆستا جگە لە چەند دانراوی بە نرخ گەلێ فەتوای لە کاروباری ئاینی و شەرعیدا لێ بەجێ ماوە.(٢)

**مامۆستا شێخ بابا عەلی تەکیەیی:**

ئەم زاتە کوڕی زانای گەورە شێخ عەلی مەلای تەکیەییە. ساڵی ١٢٥٧ک- ١٨٤١ز لە گوندی تەکیەی قەرەداغ لەدایک بووە. جگە لە باوکی بەڕێزی لای چەند مامۆستای گەورەی چەرخی خۆی خوێندوویە.

دوای تەواوکردنی خوێندن ماوەیەک لە تەکیە ماوەتەوە لە پاشان چووەتە سلێمانی لەو مزگەوتەی کە ئێستە بە مزگەوتی بابا عەلی ناسراوە مامۆستا و مودەڕیس بووە، تا لە ساڵی ١٣٥٩ک- ١٩٤٠ز دا کۆچی دوایی کردووە.

مامۆستا شێخ بابا عەلی جگە لەوەی زانایەکی گەورەی چەرخی خۆی بووە لە خواناسیشدا کەموێنە بووە و، گەلێ کەرامەتی لێ دەگێڕنەوە.

کۆمەڵێ زانای گەورەیشی پێ هیاندووە و لەسەر دەستیدا ئیجازەیان وەرگرتووە.

گەلێ فەتوای هەیە بەداخەوە پەرتەوازەن و کۆ نەکراونەتەوە.(٣)

**موفتی زەهاوی:**

لەبارەی ئەم مامۆستا مەزنەوە گەلێ شت نووسراوە، لەوانە کتێبی مفتی زەهاوی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ. نووسەری ئەم بابەتەیش بە زمانی عەرەبی کتێبێکی بە ناونیشانی:

---

(١) بڕوانە: محمد فيضي الزهاوي. ل: ١٧٤ .

(٢) بڕوانە: يحيى مظهري، علامة دهر النودشي. چاپ دووەم، ١٣٨٤ش. هەروەها بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد بەرگی: ٤/١٣٧.

(٣) بڕوانە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ص: ١١٣.

«محمد فيضي الزهاوي نبذة عن حياته وشيء من آثاره» نووسيوه.

ئەم مامۆستا یەکێک بووە لە بلیمەتەکانی جیهان و دوای کۆچی دوایی لە «السجل العثمانی»دا لەسەری نووسراوە: (یفوق کافة علماء عصرنا) واتە لە هەموو زاناکانی ئەو سەردەمەی دەوڵەتی عوسمانیی زاناتر بووە و، تاقانەی چەرخی خۆی بووە. ساڵی ١٣٠٨ک- ١٨٩٠ز لە بەغدا، دوای ئەوەی ٣٨ ساڵ موفتیی عیراق بووە، کۆچی دوایی کردووە.

**محەمەد سەعیدی زەهاوی:**

ئەم مامۆستا بەڕێزە کوڕی محەمەد فەیزی زەهاویی موفتی عێراق بووە. ساڵی ١٢٦٨ک - ١٨٥١ز هاتووەتە دنیا، ساڵی ١٣٠٨ک - ١٨٩٠ز دوای کۆچی دوایی باوکی بووە بە موفتی بەغدا، ٢٧ساڵی تەواو لەو وەزیفەدا ماوەتەوە، ساڵی ١٩٢١ کۆچی دوایی کردووە، لە تەنیشتی باوکیەوە لە مەدرەسەی سلێمانی لە بەغدا بە خاک سپێرراوە.[1]

**ئەمجەد زەهاوی:**

کوڕی محەمەد سەعیدی کوڕی محەمەد فەیزی زەهاوی. مامۆستای بلیمەت و خواناسی کەموێنە.

ساڵی ١٣٠٠ لە بەغدا هاتووەتە دنیا و لای باوکی و باپیری خوێندوویە، دوایی لە ئەستەمبوڵ بە سەرکەوتوویی و یەکەمیی خوێندنی تەواو کردووە و بووە بە موفتی لە (الأحساء)، چەند پلە و پایەی جۆراوجۆری لە بواری دادوەریدا دیوە. دوا پلەی ئەوە بوو موفتیی بەغدا بووە.

ساڵی ١٣٨٧ک - ١٩٦٧ز لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.[2]

**مامۆستا بابا رەسووڵی بێدەنیی عەبابەیلێی**

ئەم ذاتە کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عەبدوسەمەدی بێدەنییە و لە سەیدە بەرزنجەییەکانی سۆڵەیە.

ساڵی ١٣٠٣ک -١٨٨٥ز لە گوندی بێدەن هاتووەتە دنیا.

مامۆستا لە گەڵێ جێگە خوێندوویە و دوای تەواوکردنی خوێندن چووەتە بیارە و لەسەر دەستی شێخ نەجمەدیندا تەمەسوکی کردووە.

لە گەڵێ دێدا خزمەتی ئاین و مەلایەتی کردووە. شاعیر بووە بە فارسی و کوردی شیعری هەیە، فەتوای هەیە. نازناوی شیعری (کوردی) و (بابا)یە.

---

(١) بڕوانە: الإمام أمجد بن محمد سعید الزهاوی فقیه العراقیین والعالم الإسلامی، تألیف کاظم المشایخی. ص: ٧٠ . و محمد سعید الزهاوی مفتی بغداد حیاته ومخطوطاته. تألیف الدکتور عماد عبدالسلام رؤوف.

(٢) بڕوانە: الإمام أمجد بن محمد سعید الزهاوی فقیه العراقیین والعالم الإسلامی.

ساڵی ١٣٦٣ک- ١٩٤٣ز لە گوندی عەبابەیلێ کۆچی دوایی کردووە.[١]

## مامۆستا شێخ عومەری ئیبنولقەرەداغی

ئەم مامۆستا کوڕی شێخ ئەمینی قەرەداغی و لە بنەماڵەی مەردۆخییە. ساڵی ١٣٠٢ک - ١٨٨٥ز لەدایک بووە.

ئەم مامۆستا یەکێک بووە لە زانا هەرە بەناوبانگ و خواناسە کەموێنەکانی کوردستان لە چەرخی خۆیدا.

تەمەنێکی پیرۆز و پڕ خزمەتی ئاین و زانستی بەسەربردووە. دەیان زانای گەورەی پێ گەیاندووە.

لە هەموو زانستەکانی باوی سەردەمی خۆی و حیساب و ریاضیات و ئوستورلاب و رویعدا، دەستێکی باڵای هەبووە.

جگە لەوەی زانایانی پێ گەیاندووە و ئیجازەی عیلمی پێ داون و، جگە لە فەتوا زۆرەکانی کە بەشی زۆریان مامۆستای مودەڕیس لە (جواهر الفتاوی)دا بڵاوی کردوونەتەوە.. دانراوی لە زانستەکانی تردا بەزۆری هەیە.

لە ساڵی ١٣٥٣ک- ١٩٣٤ز کۆچی دوایی کردووە.[٢]

## مامۆستا مەلا قادری سۆفی

ئەم زاتە کوڕی محەمەدی کوڕی سەفەری کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەمەدە لە تیرەی (وەڵی)یە.

لە دێی ژاڵەناو لەدایک بووە، مێژووی لەدایکبوونی نەزانراوە.

جگە لەوەی پیاوێکی زانا و خزمەتگوزارێکی دڵسۆزی ئیسلام بووە پیاوێکی کۆمەڵایەتیش بووە و بۆ چاککردنەوە و پتەوکردنی نێوانی خەڵک هەوڵی زۆری داوە.

لای مامۆستا مەلا قادری بیارە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. مەنسووبی شێخانی بیارە بووە و پێوەندی پتەوی لە تەکیانا بووە.

چەند جێگە بە مەلایەتی گەڕاوە، دوا قۆناخی گوندی بانی خێڵان بووە، تا لە ساڵی ١٩٥٢ز دا لەوێ کۆچی دوایی کردووە.[٣]

## مامۆستا شێخ مستەفای قەرەداغی

مامۆستا شێخ مستەفا کوڕی شێخ نەجیبی کوڕی شێخ عەبدوللەتیفی کوڕی شێخ عەبدوڵڵای قەرەداغییە.

---

(١) بڕوانە: بنەماڵەی زانیاران بەرگی دووەم ل: ٥٩١ .

(٢) بڕوانە: بنەماڵەی زانیاران، ٥٧٨/٢ .

(٣) بڕوانە: بنەماڵەی زانیاران بەرگی دووەم. ل: ٦٣٠ .

سالّی ١٣٠٢ک- ١٨٨٥ز له قەرەداغ لەدایک بووە.

لەلای باوکی و زانایانی تر خوێندنی تەواو کردووە. ئیجازەی له باوکی وەرگرتووە.

جگه لەوەی پیاوێکی زانا و بلیمەت و زانا به زانستی ریاضیات بووە، پیاوێکی بەخشندە و میهرەبان و کۆمەڵایەتیی و خانەدانێکی دەست و دڵ گوشاد و بەرێز لەلای هەموو چینەکانی چەرخ و دەوری خۆی بوو.

لەسەر ئەو رێبازە پیرۆزە سالآنێکی درێژ له قەرەداغ خزمەتی ئاین و وڵاتی کرد. له دوادواییی تەمەنیدا گواستیەوە بۆ سلێمانی و لەوێ درێژەی بەو خزمەتە پیرۆزە دا و له مزگەوتی شێخ عەبدورەحمانی عازەبانی جێگەی رێزی موسڵمانان بوو.

دوای تەمەنێکی پیرۆزی پان و درێژ له سلێمانی سالّی ١٣٩٠ک ١٩٧٠ز کۆچی دوایی کرد.[٢]

---

(٢) بڕوانە: علماؤنا في خدمة العلم والدين. ل: ٥٦٨.

# "بحر الأنساب" و شەجەرەکانی بنەماڵە سەیدەکانی کوردستانیش سەرچاوەگەلێکی بێگەردی مێژوویین

٥٤٨

بۆ ئێمەی کورد کە خۆمان مێژووی کورد و کوردستان و زانا و ناودارانی کوردمان نەنووسیوەتەوە و، ئەوەیشی کە بیانیان لەبارەی مێژووی کورد نووسیویانە هەرچی ببێت ناتەواوە و، وەک پێویست یان کاریان بۆ نەکردووە، یان بۆیان نەکراوەو، ئەوەی نووسیویانە بێ هەڵە و کون و کەلەبەر نییە و زۆرمان ماوە بگەینە مێژوویەکی تۆمارکراوی دروستی جێگەی متمانە.. بۆ ئێمە لە وەها حاڵێکدا پێویستیمان بە هەموو سەرچاوەیەکی دروستی پێوەندیدار بەهەر بابەتێکی مێژووی کوردەوە هەیە، دەبێ زۆر ورد بۆ ئەو سەرچاوانە بگەڕێین و، بیانبووژێنینەوە و، هەرچییان لێ وەردەگیرێ بیخەینە بەردەستی لێکۆڵەرەوان و مێژوونووسانمان.

یەکێک لەو سەرچاوانە کە تا ئێستە وەک پێویست سوودی تەواوی لێ وەرنەگیراوە شەجەرەی بنەماڵە شێخ و سەیدەکانی کوردستانە کە لە کۆنەوە لە کوردستاندا جێگەی بایەخ بوون و، بە خەتی خۆش و عیبارەتی رەوان و بەرز نووسراونەتەوە و، پشتاوپشت لێیان زیاد کراوە و نەوەی نوێیان خراوەتە سەر و هەموو جارێکیش بۆ پشتڕاستکردنەوەی ناوەڕۆکەکانیان مامۆستا و شێخ و پیاو چاک و زانا و ناوداری ئەو چەرخە کراون بە شایەت لەسەر ناوەڕۆکی شەجەرەکان و، بە نووسین و ناو و مۆری خۆیان دروستیی ناوەڕۆکی شەجەرەکەیان سەلماندووە.

بۆ زانینی سەردەمی ژیانی ئەو زانا و مامۆستا و ناودارانە بوونی مۆر و ئیمزایان بە دامێن و پەراوێزی شەجەرەکانەوە بەڵگەگەلێکن وێنەیان کەمە و جێگەی گومان و دوودڵیش نین.

لەم بارەوە مامۆستایان و زانایانی پێشوومان چەندین کتێب و (بحر الأنساب)یشیان نووسیوە، گەلێکیان تێدا چوون و ناویان بەسەر زاران و لە سەرچاوەکاندا ماوەتەوە. هەندێکیشیان لەملاولا ماونەتەوە و تا ئێستە بۆیان نەلواوە چاپ بکرێن و بخرێنە بەردەستی پسپۆڕان و لێکۆڵەرەوان.

ئەو کتێبانەی لەبارەی رشتەی بنەماڵەکان (الأنساب)ەوە نووسراون سەرچاوەگەلێکی بێگەردن بۆ زانینی مێژووی زانایان و ناوداران و هاوچەرخانیان؛ چونکە گەلێ لە دانەرەکانیان بە قووڵی و فراوانی لە کارەکانیاندا رۆچوون و، باش دەستیان داگرتووە و، باسی هەر کەسێک لە زانایانی سەردەمی خۆیان و پێشتریان کردووە بە تانی لایەنەکانی ژیانیاندا چوون و، لە خوێندەوارییان و خەتخۆشییان و ئازایەتییان و بەخشندەیی و دەهەندەییان وهاوەڵان و هاوتەمەنانیان و مامۆستا و قوتابییانیان و... هتد، هیچ لایەکیان بێبەش نەکردووە، هەر کامێکیان بەشی خۆیان لە نووسینەکەدا هەیە. ئەوانیش تێکڕا یان یەکە یەکە بۆ کەسانی ئەمڕۆ کە بۆ دۆزینەوەی مێژووی

دروستی ئەوان ئەگەڕێن نرخیان هەر تەواو نابێ.

ناوی گەلێک لەوانەم بیستووە و هەندێکیشیانم دیوە. یەکێک لەوانە کە وێنەم لەلایە و تا ئیستە چاپ نەکراوە و، چاوەڕێی هەوڵ و کۆششی کەسانی پسپۆڕ و کارامەیە تا کاری بۆ بکەن، سا یان وەک خۆی، یان بە وەرگێڕراویی بۆ زمانی کوردی یان عەرەبی چاپی بکەن و کتێبخانەی مێژووی زانا و ناودارانی کورد بەو سەرچاوەیە دەوڵەمەند بکەن.. یەکێک لەوانە کتێبی (الأشرافیة)ی دانراوی شێخ مەحموودی شۆڕیجەیە، کە کتێبێکی گەورە و نایاب و کەموێنەیە.

جگە لەم کتێبەیش چەندان (بحر الأنساب)ی هاووێنە و لەو گەورەتر و بچووکتر هەیە، ئەوانیش هەر چاوەڕوانی هەوڵی دڵسۆزانەی شارەزایانی ئەو بوارەن، بەڵکو لایان لێ بکەنەوە و چاپیان بکەن.

لە ناوەڕۆکی ئەم (بحر الأنساب)ەو هاووێنەکانیانەوە گەلێ زانیاری بەسوود و نەوازە وەردەگیرێن لە شوێنانی تردا بە ئاسانی دەست ناکەون. بۆ نموونە:

ئەو شێخ و سەیدانەی لە شەجەرەکان و (بحر الأنساب)ەکاندا ناویان هاتووە، بە زۆری شاعیر و ئەدیب و زانایان تێدا بووە، دەکرێ لە رووی شەجەرەکانەوە لاپەڕەگەلی نەزانراو لە ژیانیان بزانرێت.

کە لە تەک باسی شێخەکاندا باسی کەرامەت و خەواریقاتیان دەکرێت، یان باسی مورید و مەنسووبیان، یان تەنانەت ئەوانەی دژیان بوون... زۆربەی ئەو کەسانە ئەدیب و شاعیر و زانا بوون، بەمەیش هیچ نەبێ کات و سەردەمی ژیانیان دەزانرێ.

لە (بحر الأنساب)ەکاندا ناوی دەیان شەجەرەی بنەماڵە شێخەکان هاتووە، کە هەر شەجەرەیەکیان ناوی چەندان زانا و شێخ و ناوداری ئەو سەردەمەی پێوە بووە، زانینی هەواڵی هەندێک لەو شەجەرانەیش بۆ خۆی کارێکی ترە.

لە (بحر الأنساب)ەکاندا چەند پارچە شیعر و تاک و چوارخشتەکی هەن کە یان لە سەرچاوەکانی تردا نین یان جیاوازییان هەیە، دۆزینەوە و ساغکردنەوەی ئەو پارچە شیعرانە و دانانیان لە شوێنی خۆیاندا لە دیوانەکاندا، گوڕ و تینێکی نوێ دەدا بە کاری لێکۆڵینەوەی بەرهەمی شاعیرانمان، بۆ نموونە لەم (بحر الأنساب)ەدا کە باسی دەکەین یەک تاک شیعری شێخ رەزای تاڵەبانی هەیە، لەلایەکەوە تاکە شیعرەکە لە دیوانەکەدا نییە، لەلایەکی تریشەوە: شاعیر شیعرەکەی بۆ کێ داناوە؟ ئەمەیش لە قسەی خاوەنی (بحر الأنساب) شێخ مەحموودەوە دەردەکەوێ کە دەڵێ: ئەم بەیتەی بۆ من وتووە، واتا بۆنەی وتنی شیعرەکەمان زانی بەوەیش مانا و مەبەستی شیعرەکە باشتر و روونتر دەزانرێ.

ئەمەیش تاکە شیعرەکە:

شاد باش أي شيخ (محمود) الخصال

أي جليل القدر معدوم المثال.

***

هەروەها وا دەبێ نووسەری (بحر الأنساب)ەکە لە کاتی نووسینی ناو و باسی زانایاندا باسی دانراوەکانیان دەکات و، رێک کەوتووە ئەو دانراوەکانی ئەو زانایانەی دیوە و ناوی هەموویان یان هەندێکیان دەبات کە ئێمە هەواڵێکمان لێیان نییە. ئەمەیش بۆ خۆی لایەنێکی تری دەوڵەمەندکردنی مێژووی زانایان و ناودارانمانە.

بۆ نموونە لەم (بحر الأنساب)ەی بەردەستماندا ناوی چەندان کتێب هاتووە لەوانە:

١- جامع الكرامات: دانراوی مەلا سولەیمانی نەقشبەندی.

٢- جغرافية حاجي أمين أفندي.

٣- زنبيل مختصر كشكول.

٤- (بحر الأنساب)ی شێخ حەسەنی گڵەزەردە و چەندان کتێبی تر.

***

دەبێ ئەوەیش نەبوێرم لێرەدا مەبەستم کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی هەموو شەجەرەکانی بنەماڵە سەیدەکانی کوردستان نییە و، ئەو شەجەرانە لەوەندە زیاترن کتێبێکی وەها بیانگرێتەوە، وەک مەبەستیشم ئەوە نییە لە ڕاست و دروستیی یان نادروستیی ناوەڕۆکی شەجەرەکان و ڕشتەکانیان بکۆڵمەوە، ئەوەیش -دووبارە- هەر زۆر و بگرە زۆرتری دەوێت، پێش زیاتر لە چارەکە سەدەیەک لە کۆتاییی بنەماڵەی زانیاراندا ڕا و بۆچوونی خۆم لەسەر ئەم لایەنە بە ڕوونی نووسیوە. مەبەستم لەم کارەم لایەنی مێژوویی و بەڵگەنامەییی ئەم شەجەرانەیە و هەرکەس هەر چۆن بۆیان بڕوانێ ئەگەر لە چاوی منەوە یان لە چاوێکی واقیعبینانەوە سەیریان بکا ناتوانێ لە بابەتی بەڵگەنامەی مێژوویی وەدەریان نێ.

## لایەنێکی تر:

ڕەنگە کەسانێک بێن بڵێن: بەم کارە بەشێکی کوردستان دەبن بە عەرەب و ڕشتەیان دەگەڕێتەوە بۆ عەرەبەکان! لێرەدا دەگوترێ: وەک عەرەب بۆ زۆرکردنی ژمارەی خۆیان دەڵێن: (العربية لسان) یان (العرب من تكلم العربية) واتە: عەرەبی و عەرەببوون بە زمانە، یان عەرەب ئەو کەسەیە بە زمانی عەرەبی بدوێت، ئێمەیش دەڵێین: کورد ئەو کەسەیە بە کوردی بدوێت و کوردی بزانێ و ئاخاوتنی بە کوردی بێ.[١]

جگە لەمەیش خاوەنی ئەو ڕشتە و شەجەرانە شانازی بە کوردایەتی خۆیانەوە دەکەن و، لە ڕشتەکانیاندا جگە لە کوردی لەقەبی گۆرانی بە خۆیان دەدەن.[٢] من لێرەدا حەز دەکەم بەو

---

(١) جگە لەمانەیش من بزانم ئێمەی کورد ڕشتە و ڕەگەزی خۆمان بە دروستی نەپاراستووە و ناتوانین بڵێین: فلان تیرە و هۆز پاش ئەوەندە پشت دەچنەوە سەر ڕەگەزی فلان ناوداری دێرین و ناسراوی کورد و فلان تیرەیش دەچنەوە سەر کەسایەتییەکی ناوداری دێرینی کورد. ئەم بابەتە لێکۆڵینەوە و لێدوانی وردی زۆری دەوێ.

(٢) ئەم دیاردەیش تەنیا لەناو کورددا نییە و لە گەلانی غەیرە عەرەبی دراوسێی و دوورە شوێنێدا هەن وە =

کەسانە بڵێم: ئەی بۆ خەمێک لەو سەدان زانای گەورەی کورد و دەیان خێزان و بنەماڵەی زانیاری کوردە ناخۆن کە لە ئاوارەییدا تواونەتەوە و ناویشیان نەماوە؟ هەر لە بەغدادا بنەماڵەکان: زەهاوی حەیدەری و سنەیی و پشدەری و، لە مەکە و مەدینەدا گەردیی و گۆرانی و، لە زۆربەی شارەکاندا شارەزووریی و چەلەبی و... هەبوون هەموویان بوون بە ئاردی بن دڕک و کەس هەواڵیان نازانێ!
ڕەنگە کەسانێکیش بڵێن: ئەی ئەم هەموو شەجەرەیە چییە؟ بۆ ئەوەیش دەڵێم: ڕەنگە ئەم شەجەرانە کەم بن و زۆر لەمانە زیاتریش هەبووە و تێداچوون، چونکە هەر لەناو ئەم شەجەرانەدا دەخوێنینەوە کە شێخ مەعرووفی نۆدێ دوو شەجەرەی بۆ دوو برا دروست کردووە، یان یەک دێی بچووکی وەک دێی تەکیە، لەچاو ئێستەدا، هەشت شەجەرەی تێدا بووە.

لەلایەکی تریشەوە ئەگەر بمانەوێ ڕەوشی زانست و بوونی پیاوانی زانا و ژمارە و ئەندازەی توانا و لێهاتوویی زانایانی چەرخانی پێشوو و سەردەمی ئەو زانایانەی ئەو شەجەرانەیان مۆر کردووە بزانین، ئەوە ئەگەر ئەو شەجەرانە لە سەدا سەدی ئەو بوارانەمان نەدەنێ ئەوە دەشێ بکرێن بە بەڵگەی ڕواڵەتێکی نزیک لە تەواوی ئەو مەبەستانە؛ چونکە لەلایەکەوە لە هەر چەرخێکدا کە شەجەرەیەک نووسراوەتەوە هەوڵی ئەوە دراوە زانایانی ئەو ناوچەی شەجەرەکەی تێدا نووسراوە بکرێن بەشایەت لەسەر ئەو شەجەرە، ئەمەیش ئەگەر بە هەموو زانایان نەگەیشتبن، یان هەموویان مۆریان نەکردبێ ئەوە-بێگومان- بەشی زۆریان بەو کارەدا گەیشتوون.

کە ئەمەیش ئەنجام درا بە زۆری دەقەکان دەبنە ئاوێنەی نواندنی توانای مامۆستایانی خاوەن دەق و بەرمۆرەکان. ئەوەتا لەم دەقە جۆراوجۆرانەدا دەقی زۆری باڵای وا دەبینی هاوار دەکات و پێت دەڵێت: ئەو کەسەی ئەم دەقەی نووسیوە پیاوێکی خاوەن توانای کەموێنە بووە. وەک لە تەک ئەو دەقەدا دەقی مامناوەندی و لاوازیش دەبینی.

هەروەها لە رووی ناوی خاوەن دەقەکانەوە دەزانین لەو سەردەمەدا کێ قازی کوێ بووە. کێ لە فلان ناوچەدا موفتی بووە، مامۆستا و مودەڕیسی مزگەوتی فلان کام مامۆستا بووە. ئەو کەسانەی کە بە کاری نووسینی مێژووی زانایان و ناودارانەوە خەریک دەبن دەزانن بوونی ئەم ناوانە لەو شەجەرانەدا بە خەتی خودی مامۆستا و موفتی و قازییەکان چ دەورێکی هەیە لە دروستیی نووسینی مێژووی ئەو زاتانەدا. جا ئەگەر ناوەکان لە چەند شەجەرەی جۆراوجۆردا کە لە کاتگەلی جیاجیادا نووسرابنەوە و دەست بکەون ئەوە ئەوەندەی تر سەرچاوەی مێژوویی بۆ لێکۆڵەرەوان دەخەنە دەست.

---

= جێگەی تەشەر و توانجی گەلەکانیشیان نین. بۆ نموونە سەید عەلی خامنەئیی و پێشتر ئایەتوڵڵا خومەینی و سەیید محەمەدی خاتەمیی و دەیان گەورەی ئێران ناوی سەیدیان پێوەیە و بەمەیش لە فارسێتیی نەشۆراونەتەوە. بگرە ئەوەندەی ئەوان هەوڵی پاراستنی ڕەگەزی فارسیی دەدەن کەم کەس بەو شێوە ڕەگەزی خۆی دەپارێزێ.

# الأشرافيه

## سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند بۆ مێژووی زانایانی کورد

٥٤٩

ئەم کتێبە یەکێکە لە کتێبە دەگمەن و گەورەکانی دەستخەتخانەی کوردستان.

دانراوی زانای مەزن شێخ مەحموودی شۆڕیجەیە، بە زمانی فارسییە. (٥٠٠) لاپەڕە زیاترە. پێوانەکەی (١٣×١٧)ی، لاپەڕەی (١٢) دێر زیاتر و کەمتری تێدایە.

لەبەرئەوەی ئەم کتێبە تا ئێستە چاپ نەکراوە و دەگمەنە و کەم کەس ئاگای لە ناوەڕۆکەکەیەتی، وام بە باش زانی گەشتێکی خێرای پێدا بکەم و پسپۆڕان و خاوەن مەبەستان لە ناوەڕۆکەکەی ئاگەدار بکەم، بەڵکو لەو گۆشەی دوور لە خوێنەرانە رزگاری ببێت و، شوێنی خۆی لە کتێبخانەی کوردیدا بگرێت.

ئەم دەستخەتە لە سەرەتاوە ناتەواوە و پێشەکی دیار نییە و لەوە دەچێت زۆری لەناو چووبێت.

١- ئەوەی کە ماوە بە باسی ڕووداوی کەربەلا و شەهیدبوونی حەزرەتی حسەین دەست پێ دەکات. لە پەڕەی (٦)دا هەندێک باسی بنەماڵەی (خادم السجادە) لە کەرکووک دەکات.

٢- باسی حەزرەتی (زین العابدین) (١٢).

٣- باسی ئیمام محەمەدی باقر. (١٣).

٤- باسی ئیمام جەعفەری سادق. (١٥).

٥- هەندێک باسی پیر خدری شاهۆ (٢٣).

٦- هەندێک دەربارەی ئیمام مووسا و بەسەرهاتەکانی (١٧).

٧- نەوەکانی ئیمام مووسای کازم. (٢٣).

٨- إبراهیم سمین (٢٤).

٩- ئیمام (علي الرضا) (٢٥).

١٠- باسی (محمد التقي) (٣١).

١١- باسی (علي النقي) (٣٣).

١٢- باسی ئیمام حەسەنی عەسکەری (٣٥).

١٣- باسی ئیمامی مەهدی (٣٧).

١٤- باسی ئیمام حەسەن (٤١).

١٥- باسی شێخ عەبدولقادری گەیلانی (٤٢).

# تەرجەمەی الأشرافیە

# وەرگێڕانی مامۆستا مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا رەسووڵ

٥٥٠

لەسەر ژیانی مامۆستا مەلا ئەحمەد نووسراوە

ناوی ئەحمەد و کوڕی حاجی مەلا رەسووڵی دێلێژەییە. لە شاری سولەیمانی هاتووەتە دنیاوە لە خانەقین کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەی براوەتەوە بۆ سولەیمانی لە گردی سەیوان نێژراوە. شاعیرێکی بەرز و عالمێکی بەرزتر بووە.

دوکتۆر عیزەدینی برازایشی لەبارەیەوە نووسیویە:

فائیز لە مزگەوتی عیرفانی سلێمانی و لە بلێ (زێبار) و لە سالانی دوایی ژیانیدا لە مزگەوتی گەورەی خانەقین مودەڕیس بووە. دیوانێکی باشی شیعری هەیە. کاتێ دوکتۆر مارف خەزنەدار خەریکی ئامادەکردنی باسێ بوو پێکەوە چووینە شارەبان لای عەبدولقادری کوڕە گەورەی حاجی مەلا ئەحمەد (کە ئامۆزامە) هەموو بەرهەمی شیعری باوکی لەگەڵ چەند بەڵگەدا بۆ سوود لێ بینین دا بە دوکتۆر مارف. ئەوە بوو ئەویش لە باسەکەیدا بە چەند لاپەڕە باسی (فائیز)ی کردووە و ئیشارەتی بۆ ئەو یارمەتییەی کاک عەبدولقادر داوە...[١] ئەوە دیارە کە ئەم مامۆستا ناوی مەلا ئەحمەدە و لەقەبی شیعری (فائیز) بووە و، ئەم شتە کەمەی لەسەر نووسراوە ئیتر باسی بەرهەمەکانی نەکراوە. باسی ئەوەیش نەکراوە کە ئەم دانراوەی هەبێت. بەپێی ئەوەی ئەم نوسخە لەبەر نوسخەی حەفسەخانی نەقیب نووسراوەتەوە دوور نییە مامۆستا مەلا ئەحمەد ئەم کتێبە (رسالة الأشرافیة)ی لەسەر داوای حەفسەخان تەرجەمە کردبێت. جا ئەگەر ئەو نوسخەی لای حەفسەخان بووە دەست بکەوێت، یان نوسخەیەکی تری دەست بکەوێت ئەوە ئەو کاتە دەزانرێ ئەم کتێبە چۆن وەرگێڕراوە.

بەپێی ئەوەی ئەم دەستخەتە- وەک لەمەولا دەیبینی- ساڵی ١٩٣٦نووسراوەتەوە دەبێ ئەم کتێبە پێش ئەو مێژووە کرابێت بە کوردی، بەڵام نازانین کەی بووە.

باسێکی دەستخەتەکە:

ئەم دەستخەتە بە خەتێکی خۆش بە مەرەکەبی شین و سوور نووسراوەتەوە، لە سەرەتایەوە چەند

---

(١) بڕوانە: دیوانی سەفوەت، دیوانی مەلا مستەفای حاجی مەلا رەسووڵی دێلێژە. پێشەکی و ئامادەکردن و پەراوێز بۆ نووسینی دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ. دار الحرية للطباعة - بغداد. ١٩٨٤ ل: ٣١ .

لاپەڕەیەکی دڕاو و پەرپووتە، هەندێ شوێنی ئاوی بەرکەوتووە و شوێنەکان شێواون، ١٤٩ لاپەڕەیە.
سەید محەمەدی کوڕی سەید ئەمینی قەشقەیی لە شێخانی سەڵپاتوو لە نەوەی شێخ ئیمام لەبەر نوسخەی حەفسەخانی نەقیب ساڵی ١٣٥٥ک- ١٩٣٦ز، لە ٢٨ی مانگی رەجەبدا نووسیویەتییەوە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

«گەورەیی بۆ ئەو خوایە کە گەورەی عالەمە، رێکخەری جامیدات و حەیوانات و ئادەمە، عەقڵ لە چلۆنیی ئیشی ئەو سەرگەردران و ماتە، بۆ ناسینی ئەو پێغەمبەرەکان لە ئادەم تا خاتەمە. برژێنە رەحمەت ئیلاهی بەسەر ئەو محەمەدە کە نەخوێندەوارێکی حەکیمە، دامەزرێنەری دینێکی موهیمە، چەند فەیلەسووف و حوکەما سەرگەردانە لە عەقڵ و زانینی ئەم عاقڵە کە ئینسانە. لە زەمانی جەهالەتدا موئەیەدە بە قورئان، عاجزە لە خەلقی ئایەتێکی هەموو عولەمای جیهان. وە ئەو رەحمەتە لایقە بۆ ئەصحاب و ئال و ئەولاد و ئەتباعی وە بۆ هەرکەس کە ئیمانی هێناوە بە رەوشتی بە ئیجماعی.

لە پاشان: ئەم کتێبە لە پێشا بە زومانی فارسی بوو بۆ هەموو کەس ئیستیفادەی تەواوی نەبوو. کە ریسالەی ئەشرافییەیان پێ دەگوت. لە پاشا موحتەرەم جەنابی مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا رەسووڵ تەرجەمەی کرد بە کوردی. وە ئەم ریسالەیە بەحسی سیلسیلەی تاهیرە دەکات، وە بەعزێ لقەکانی کوردستان بەیان ئەکا، وە هەندێ عەرەبیش».

ئەم نووسەرەوە بەڕێزە باسی پێشەکیی وەرگێڕی کتێبەکە- جەنابی مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا رەسووڵ- ناکات و نازانین پێشەکییەکەی چۆن بووە و کەی ئەم کتێبەی کردووە بە کوردی، زانینی مێژووی وەرگێڕانەکە بۆ مێژووی پەخشانی کوردی کاریگەریی خۆی هەیە. نایشزانین ئەو نوسخە کە لە لای حەفسەخانی نەقیب بووە کەوتووەتە کوێ و چی بەسەرهاتووە.

کۆتاییی دانراوەکە:

لە کۆتاییی ئەم دەستخەتەوە هیچ قسەیەکی وەرگێر جەنابی مەلا ئەحمەدی کوڕی حاجی مەلا رەسووڵ نییە کە باسی وەرگێڕانەکەی بکا. ئەوەی کە کۆتاییی دەستخەتەکەی پێ هاتووە ئەمەیە:

«بە عەونی باری و حەمدی خودا یاری، وە هیممەتی حەزرەتی رەسووڵ و بەرەکاتی (فاطمة البتول) و ئیستیمدادی (علي مرتضى) و یاری (حسين المجتبى) و ئاگاداری جەددەکان و بە ئەنفاسی نافیذینی (سدەکان)- دەبێ سەیدەکان بێت -م. ع. ق- بۆ خزمەتی ئەجناسی سادات و ئەدای لەوازیمی میللەت لە واجیبات زانرا کە ئەم نوسخە بێ لاف و گەزافە بە سەعی و ئیهتیمام تەرقیم کەم لەسەر نوسخەی جەنابی نەقیبزادە کچی شێخ مەعرووفی نەقیب حەفصەخان لە سلێمانی لە مزگەوتە بچکۆلە لە تەئریخی١٣٥٥ی هیجری و لە ١٩٣٦ی میلادی لە مانگی (٢٨) رەجەب تەواوبوو. ئومێد ئەکەم هەر کەس سەهو یا زیاد و نوقصانێ ئەبینێ دەنگ بکا تا چاکی بکەم. وە (كاتب الحروف) سيد محمد ابن سيد أمين، لە ئەهالی قەشقە لە عەشیرەتی شێخانی سەڵباتوو لە ئەولادی شێخ ئیمامن. ئومێدی عەفوم لە خوا هەیە و رجای شەفاعەتم لە (محمد

المصطفى) هەیە. یارەبی لێمـان خـۆش بی و بە ئامـالی دین و دنیـا نائیلمـان بکەی و لە غـەم و موصیبەت خەلاصمان بکەی. آمین یارب العالمین»

ئەوەی لێـرەدا دەبێ بگوترێ ئەوەیە کـە ئەم دەسـتـخـەتە ١٤٠ لاپـەڕەیە و، وا نووسـراوە کـە وەرگێڕراوی (الأشرافیة)یە دەبێ ئەمـە وەرگێڕراوی بەشێکی بێت، چونکە (الأشرافیة) کتێبێکی گەورەیە و بەهیچ جۆر ناگونجێ بە (١٤٠) لاپەڕە بکرێ بە کوردی و دەبێ ئەمە کورتەی بێت.

دووبارە دێمەوە سەر ئەوە کە لێرەدا باسی پێشەکیی وەرگێڕ و قسە لەسەر وەرگێڕانەکەی نییە. بۆیە گومان بۆ ئەوە دەچێت نووسەرەوەی دەستخەتەکە بەشێکی نووسیبێتەوە، هەروەک گومانیش بۆ ئەوە دەچێت کە وەرگێڕ خۆی لە بنەڕەتدا پوختـەی (الأشـرافیـة)کـەی وەرگێـڕابێت یان لێی لابردبێ.

# شەجەرەی سەیدەکانی حاجی مامەند

٥٥١

**شەجەرەکانیش:**

لە پەنای ئەو (بحر الانساب) و کتێبە دانراوانەدا لەم بوارەدا چەندان شەجەرەی کۆن و نوێ هەیە کە هەر یەکەیان پێوەندی بە ناوچەیەک و بنەماڵەیەکەوە هەیە و، هەر یەکەیان لە ناوەڕۆکەکەیدا ناوی چەند کەسایەتی هەیە، جگە لەوەی لە پەڕاوێز و ئەملا و ئەولای هەر یەکێکیاندا مۆر و ئیمزا و شایەتیی چەندان کەسایەتیی ناسراو و گەورە و جێگەی بڕوای لای خەڵکی سەردەمی خۆیان پێوەیە، بە کۆکردنەوەی ئەو زانیارییانە لە شێوەی کتێب و نامیلکەدا، یان بە کۆکردنەوەی شەجەرەکان وەک خۆیان و چاپکردن و بڵاوکردنەوەیان، بەشێکی باش و سەرچاوەی مێژوویی‌مان لە لەناوچوون رزگار دەکەین، لەولایشەوە کەرەستەی پوخت و جێگەی باوەڕ دەخەینە بەردەستی شەیدایان و سەرگەرمانی ئەو بوارانە.

لێرەدا ناڵێم: کاری گەورەم کردووە و چی بۆ ئەو مەبەستە پێویستە ئەنجامم داوە، ئەوەندە دەڵێم: بە خستنەبەرچاوی چەند نموونەیەک لەو شەجەرانە و، باسکردنی هەندێک لەو (بحر الانساب)انە، سەرنجی خاوەن مەبەستان و لێکۆڵەرەوان بۆ لای بایەخی ئەو سەرچاوانە رادەکێشرێت و بەرچاوڕوونییان دەکرێت و دەستیان دەگیرێت بۆ لای ئەوەی رێبازی سوودوەرگرتن لەو سەرچاوانە بگرنە بەر و، لێکۆڵینەوە و نووسینەوەکانیانیان پێ دەوڵەمەند بکەن.

لە تەک ئەم باسەدا دەق و پەڕاوێزەکانی سەر چەند شەجەرە دەخەمە روو، بە هیوای ئەوەی لێیان زیاد بکرێ و ئەم بابەتە دەوڵەمەندتر بکرێ.

لە پێشدا بە کۆنترین شەجەرە دەست پێ دەکەم کە لەم ماوەدا وێنەکەییم دیوە:

**شەجەرەی سەیدەکانی حاجی مامەند**

لە سەرەتا و کۆتاییی ئەم شەجەرەوە ناو و مۆری چەند زانا و ناوداری ئەو سەردەمە و دوای ئەو سەردەمەی پێوەیە، هەندێکیان لە وێنەکەدا باش دەرنەچووبوون بۆم نەخوێنرانەوە، ئەوانەیشیان کە خوێنرانەوە لێرەدا تۆماریان دەکەم:

لە سەرەتای شەجەرەکەوە دوو جێگە نووسراو هەیە سێ مۆریان لە خوارەوەیە. بەشی سەرەوەی نووسراوەکان لە وێنەگرتنەوەدا بەرنەکەوتووە و تێداچووە، بە هۆی ئەوەوە نازانرێت نووسراوەکە چییە. ناوی (السید کاك أحمد والسید...) لە بەشی یەکەمدا دەخوێنرێتەوە. لە بەشی دووەمدا (جنت مکان رئیس... السید عبدالغفور) دەخوێنرێتەوە.

لە خوار ئەوەوە لەناو خڕکەیەکی سەرەتای شەجەرەکەدا نووسراوە:

(البرزنجي، المدرس العلماء سليمانية السيد حسن گلەزەردە).

لە خڕکەیەکی تردا لەلای چەپی ئەمەوە بە مەرەکەبی سوور شتێک نووسراوە باش ناخوێنرێتەوە لە کۆتاییەوە ناوی (مـلا محمـد...) هەیە. لە خواریەوە مۆرێک هەیە ناوی (محمد صائب) یان (محمد صامت)ی تێدا نووسراوە.

**لە کۆتایی شەجەرەکەیشەوە ئەم نووسراوانە هەیە:**

(السيدان السيد طه، و السيد كاكه حمه، و السيد يسين، و جناب السيد بابا رسول كبير، و شيخ مصطفى نودي، و جناب نقيب الأشراف ميرة سور سليمانية، و جناب شيخ مصطفى مفتي مرحوم، و جناب شيخ حسين القاضي سليمانية، و شيخ عبدالصمد القاضي، كان المتقين و خبرين شهادتهما، و في هذا الشجرة الصحيحة... هما فختمهما جنت مكان رئيس... حضرت كاك أحمد الشيخ...)

(رأيت هذا الشجرة المباركة الصحيحة ما كذبناهما فختمناهما باشكاتب محكمة شرعية مامه خلى).

لە ناو ئەم نووسینانەدا (٣٧) مۆر هەیە بەڵام ناخوێنرێنەوە، بەسەر یەکێکیانەوە ناوی (بابا رسول) هەیە. بەسەر یەکێکیشیانەوە (حفيد سيد عمر) هەیە.

ئەم شەجەرە بۆ سەید مەحموودی قەلەندەری نووسراوە و بەو دەست پێ دەکات. دوای ئەوە ناوی باو و باپیری نووسراوە تا دەگاتە سەر سەید ئەحمەدی ریفاعی و، سەید ئەحمەدی بەدەوی و، تا دەگاتە سەر (إسماعيل المحدث)ی کوڕی ئیمام مووسای کازم.

ئەوەی کە باوە و نووسراوە ئەوەیە کە شێخانی حاجی مامەندی لقێکن لە شێخانی تەکیە و لەوان جیا بوونەتەوە، بەڵام بەپێی ئەم شەجەرەی بەردەستمان ئەو شێخانە نەوەی (إسماعيل المحدث)ی برای ئیمام هەمزەن و نەوەی ئیمام هەمزە نین، بۆ روونکردنەوەی ئەمەیش دوا بە دوای ئەم بابەتە دەقی یەکێک لە شەجەرەکانی بنەماڵەی تەکیە وەک خۆی دەنووسم، تا بە بەراوردی لە تەک ئەمەدا ئەو راستییە روون ببێتەوە.

**دەبێ لێرەدا یەک دوو شت بنووسم:**

یەکەم: وەک دەبینی دەقەکە کۆنە و تەمەنی لە (٤٥٠) ساڵ زیاترە، بە فۆتۆگراف وێنە گیراوەتەوە، وێنەکە بچووکی کردووەتەوە، لە هەندێ شوێنیدا باش دەرنەچووە و ناخوێنرێنەوە.

دووەم: دەقەکە لە رووی زمانی عەرەبییەوە لاوازە و هەڵەی زمان و رێنووسی تێدایە، وەک خۆی نووسیمەوە و، هەڵەکانیم چاک نەکرد.

سێیەم: قسەکان بە ناوی سەید مەحموودی قەلەندەرییەوە کراون، کەچی خۆی بە خۆی دەڵێت (الولي، قطب العصر صاحب الخوارق والكرامات...) هەر لە دەقەکەدا و لە کۆتایی نووسینەکەیەوە نووسیویە:

(أما بعد: فإن الرجل الصالح المقبل على مولاه، المعرض عن من سواه، الراغب في الدار الآخرة،

المواظب على الأعمال الصالحة، جدي كبير السيد محمود قلندري، صاحب الخوارق والكرامات...).

جا دەبێ دوو سەید مەحموودی قەلەندەری بن؟ یان نووسینەکە کەوتن و هەڵەی تێدابێ؟

**پێش دەقی شەجەرەکە ئەمە نووسراوە:**

«هذه شجرة أصلها أصيل، فرعها نبيل، وحاملها رجل جليل، أسأل الله تعالى أن يرزقه الاستقامة بحرمة محمد صلى الله عليه وسلم، المهُبط عليه الوحي والتنزيل، أمضيتها وأنفذتها، وأنا أفقر الورى وخادم الفقراء الراجي عفو ربه الولي السيد محمود قلندري، قطب العصر صاحب الخوارق والكرامات خادم السجادة. جدى السيد الشيخ عبدالقادر الجيلاني قدس الله سره العزيز. اللهم صلي على محمد بحر أنوارك ومعدن أسرارك، ولسان حجتك، وعروس مملكتك، وإمام حضرتك، وطراز ملائكتك، وخزائن رحمتك، وطريق شريعتك، المتلذذ بتوحيد إنسان عين الوجود، والسبب في كل موجود، عين أعيان خلقك المتقدم من نور ضيائك، صلاة تدوم بدوامك، وتبقى ببقائك، لا منتهى لها دون علمك، صلاة ترضيك وتُرضِيه وترضى بها عنا يارب العالمين.»

**دەقی شەجەرەکە:**

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله فاتح أقفال القلوب بذكره، وكاشف استار الغيوب ببره، ورافع أعلام الزيادة للقائد بشكره. أحمده على أن جعلنا من أهل توحيده، وأشكره طالباً لفضله ومزيده، وأصلي وأسلم على سيدنا محمد أفضل أنبيائه وعبيده، وعلى آله وأصحابه الحائزين لطويل الفضل ومديده.

أما بعد: فيقول العبد الفقير، المقرّ بالذنب والتقصير، الراجي عفو ربه، الولي، قطب العصر، صاحب الخوارق والكرامات، السيد محمود قلندري القادري الرفاعي، حاجي مامندي، المشهور بقصر الازار -قدس الله سره وأسراره- وأمه وهي من سلسلة حضرة الحسين- رضي الله عنه- إبن السيد إسماعيل.. أز جملة مشايخان بود، واز اولياء متقدمان وأعالم بأنوا ع العلوم الظاهر والباطن ابن السيد جعفر ابن السيد مراد ابن سيد... ابن سيد أحمد، ابن السيد رسول، ابن السيد عبدالرحمن، ابن السيد يوسف، ابن السيد عبدالمجيد، و سلطان العارفين السيد أحمد الرفاعي- قدس الله سرّه- ابن سيد معد، ابن السيد علي، ابن السيد منصور مشهور بالأولياء، ابن السيد مراد، ابن السيد إسماعيل، ابن السلطان العارفين السيد أحمد بدوي، ابن السيد معد، ابن السيد إبراهيم، صاحب الشريعة والطريقة القادري والرفاعي، ذو الخوارق والكرامات، ابن السيد إسماعيل المحدث الهمام الكبراء، ابن السيد موسى كاظم، ابن السيد إمام جعفر الصادق، ابن السيد محمد الباقر، ابن السيد إمام علي مثنى، ابن السيد الإمام زين العابدين، ابن السيد شباب أهل الجنة وقرة العين أهل السنة، الإمام عبدالله الحسيني.[١] رضي الله عنه- الإمام أمير المؤمنين علي بن أبي طالب- كرم الله وجهه- ابن عبدالمطلب، ابن هاشم، ابن عبدالمناف، ابن قصي، ابن كلاب، ابن مرة، ابن كعب، ابن لؤي، ابن

---

(١) لێرەدا هەڵەکە زۆر ئاشکرایە و راستییەکەی ئاوایە: «الامام ابي عبدالله الحسين...»

غالب، ابن فهر، ابن مالك، ابن نضر، ابن كنانة، ابن خزيمة، ابن مدركة...»

تا سەر حەزرەتی ئادەم...

**دوای ئەمەیش نووسراوە:**

أما بعد: فأن الرجل الصالح المقبل على مولاه، المعرض عن من سواه، الراغب في الدار الآخرة، المواظب على الأعمال الصالحة، جدي كبير السيد محمود قلندري، صاحب الخوارق والكرامات، قدم بغداد، فزار حضرة جدي قطب الدوائر، والدرة الذخائر، ملحق الأصاغر بالأكابر، القطب الرباني، الغوث الصمداني، والقنديل النوراني، صاحب الإشارات والمعاني، السيد عبدالقادر الجيلاني، – قدس الله سرّه–. ثم بعد الزيارة جاء الينا والتمس منا تلقين كلمة التوحيد، فلقنته، كما تلقيته بالسند عن شيخي وإبن عمّي السيد الشيخ عبدالقادر القادري عن أبيه وشيخه السيد أبي بكر، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ إسماعيل، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ عبدالوهاب، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ نورالدين، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ محمد درويش، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ حسام الدين، عن أبيه وشيخه وابن عمه السيد الشيخ أبي بكر، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ يحيى، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ نورالدين، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ ولي الدين، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ زين الدين، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ شرف الدين، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ شمس الدين، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ محمد الهتاك، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ عبدالعزيز، عن أبيه وشيخه السيد الشيخ قطب العارفين ومرشد السالكين شيخ عبدالقادر الجيلاني– قدس الله سرّه– عن شيخه أبي سعيد المبارك المخزوم، عن شيخه حسن الحكاري، عن شيخه أبي الفرج الطرطوسي، عن شيخه عبدالواحد التميمي، عن شيخه أبي بكر الشبلي، عن شيخه أبي القاسم الجنيد البغدادي، عن شيخه سري السقطي، عن شيخه معروف الكرخي، عن شيخه قبلة الباطن أبو الحسن علي ابن موسى الرضا. قال: حدثني أبي موسى الكاظم، عن أبيه جعفر الصادق، عن أبيه محمد الباقر، عن أبيه زين العابدين، عن أبيه سيد شباب أهل الجنة وقرة أعين أهل السنة الإمام أبي عبدالله الحسين، عن أبيه الإمام أمير المؤمنين علي بن أبي طالب– كرّم الله وجهه– قال: حدثني حبيبي وقرة عيني رسول الله– صلى الله عليه وسلم– قال: حدثني جبرائيل– عليه السلام– قال: سمعت رب العزة– جل جلاله– يقول: لا إله إلا الله حصني، فمن قالها دخل حصني، فمن دخل حصني أمن من عذابي.

وبالسند المتقدم الى الشيخ المعروف الكرخي، عن شيخه داود الطائي، عن شيخه الحبيب العجمي، عن شيخه حسن البصري، عن شيخه الإمام الأمير المؤمنين علي بن أبي طالب– كرم الله وجهه– عن رسول الله– صلى الله عليه وسلم– عن جبرائيل– عليه السلام– عن رب العزة– جل جلاله– وبعد أن لقناه كلمة التوحيد، وأمرناه بتلاوتها عقب كل فريضة مائة وخمسة وستين مرة، وفي سائر الأوقات على حسب ما تيسر له... فمن نكث فإنما ينكث على نفسه، ومن أوفى بما عاهد عليه الله فسيؤتيه أجراً عظيماً.

وصلى الله على سيدنا ومولانا وشفيعنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

السيد محمود قلندر صاحب الخوارق والكرامات قدس الله سرّه.

والحمد ثم الحمدلله كه اين شجرهء متبركّة وإجازه مكرمه در اوان سعيد، و زمان حميد، بتأريخ پانزدههم رجب المرجب في سنة ٩٢٥ هجري عليه الصلاة والسلام- أز دست أحقر العباد، وأضعف الأفراد، جناب سيد محمود قلندر صاحب خوارق وكرامات- غفر الله له ولوالديه- مرقوم ومكتوب گرديد، واز حليهء إختتام وزيور إتمام مزين ومرصع شد.

سيد محي الدين أمر الله، شيخ محي الدين فضل الله، أولياء محي الدين، أمان الله بابا محي الدين، نور الله غوث محي الدين، قطب الله سلطان محي الدين، سيف الله خواجه محي الدين، فرمان الله مخدوم محي الدين. برهان الله درويش محي الدين. آيات الله فقير محي الدين، معشوق الله پادشاه محي الدين، غوث الله.

أولاد حضرت شيخ عبدالقادر الجيلاني قدس الله سرّه العزيز: عبدالعزيز، عبدالوهاب، عبدالرزاق، عبدالجبار، عبدالغفار، عبدالغني، صالح، شمس الدين، محمد إبراهيم، عيسى، يحيى... حضرة السيد محمود قلندر مشهور بالأولياء قدس الله سرّه، ابن سيد إسماعيل، ابن سيد جعفر، حاجي مامندي، من محال سُروچك. رضوان الله تعالى عليهم أجمعين، ولسائر المسلمين آمين برحمتك يا أرحم الراحمين. أمّه الحسني وأبوه الحسيني. في سنة ٩٢٥ . ١٥ رجب المرجب.

# شەجەرەی سەیدەکانی باراو

٥٥٢

ئەم شەجەرە بە خەتێکی (ثلث)ی زۆر نایاب نووسراوەتەوە، دیارە نووسەرەوەکەی لە کاتی خۆیدا خۆشنووسێکی دیاری سەردەمی خۆی بووە. کەم شەجەرەی وەها جوانم دیوە، بەڵام بەداخەوە کۆن بووە و دێرەکانی سواو و پواون، هەندێ شوێنی بە زەحمەتی زۆریش ناخوێنرێتەوە.

مۆر و ئیمزا و نووسینی چەند کەسی پێوەیە، بەداخەوە زۆری مۆر و نووسینەوەکانیش ناخوێنرێنەوە. ئەگەر وا نەبووایە لە ڕووی مێژووەوە شەجەرەکە گەلێ سوودی زیاتری دەبوو.

ئێستەیش لە تەک ئەو کۆنی و نەخوێندرانەوەییەیدا چەند زانیاری پڕ بایەخی لێ وەردەگیرێت.

یەکێک لەوانە: ئیمزای مامۆستا مەلا ئەحمەدێکی پێوەیە کە نووسیویەتی (أحمد الذهابي = ئەحمەدی زەهاوی) ئەم ئەحمەدی زەهاوییە بە باوکی محەمەد فەیضی زەهاوی = موفتی زەهاوی دەزانم. ئەگەر وایش بێت ئەوە یەکەم جارە دەزانین باوکی موفتیی زەهاوی مەلایەکی وەها بووە مامۆستا و مودەڕیس بووبێت لە یەکێک لە مزگەوتەکانی سلێمانیدا. وەک پێشتر دۆزیمەوە کە لە زەهاو بووە و ڕەنگە بە فەقێتی لەوێ بووبێت[1] هەروەها ناو و ئیمزای مەحموود ناوێکی پێوەیە کە قازی بووە لە قەڵاچوالان، ئەمەیش بۆ زانینی ئەو کەسانەی کە قازی بوون لە قەڵاچوالان بایەخی مێژوویی خۆی هەیە.

ئەسڵی ئەم شەجەرە لای کاک شێخ بەختیاری باراوی پارێزراوە و، وێنەیشی دا بە من.

**شەجەرەی سەیدەکانی باراو[2]**

هو الله المستعان واليه المرجع وعليه التكلان

بسم الله الرحمن الرحيم

هذا بيان نسب سيد سليمان الى سيد المرسلين وخاتم النبيين ورسول رب العالمين.

لعنة الله على داخل النسب وخارج النسب

وهذا اسمنا: سيد سليمان، ابن سيد إسحاق، ابن سيد نضر، ابن سيد مراد، ابن سيد محمد، ابن

(١) بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغی، بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی حەوتەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠٠٧ ، چاپی یەکەم. ل: ١٦٤.

(٢) باراو گوندێکە دەکەوێتە (٢٠کم)ی ڕۆژئاوای شاری سلێمانییەوە. سەر بە شارۆکەی چوارتا و ناحیەی بەرزنجەیە. کەوتووەتە نێوان قەڵاچوالان و بەرزنجە.

گوندێکی کۆنە، گۆڕستان و مزگەوت و شوێنەوارەکان بەڵگەی ئەو کۆنییەن. پێش ئەوەی ساڵی ١٩٨٠ =

## بەڵگەنامەیەک لەناوی پیاوانی تەریقەتی نەقشبەندیدا

٥٧١

شەهابەدین ئەبوثەنای ئالووسی بە دوو جۆر یان لەسەر دوو ڕێگە ناو دەبرێت و، عەباس عەزاوی پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت ئالووسی سەلەفیی بووە[1]، لە هەندێ جێگەیشدا قسە لەوە دەکرێ دژی مەولانا خالید بووە و کتێبی دژی تەریقەتەکەی داناوە[2]، بەڵام من بەڵگەنامەیەکم دەست کەوتووە سەرەتاکەی نووسین و ئینشای ئەبوسەنایە و، بە ڕوونی ئەوە دەردەبڕێ کە لەسەر ڕێبازی تەسەووف بووە و، شانازی بەوەوە دەکات کە لە مەنسووبەکانی مەولانا خالیدە و مەولانا ئیجازەی پێ داوە.

باسێکی کورتی بەڵگەنامەکە:

ئەم بەڵگەنامە بەڵگەنامەیەکی نایاب و کەموێنەیە و من تا ئێستە لە رووی جوانی خەتی و، شێوەی نووسینەوەی و، زۆریی ناوی ئەو کەسانەی ناویان تێیدا هاتووە وێنەیم نەدیوە.

ئەم بەڵگەنامە پێوانەکەی (٥٢٥×٢٢سم)ە، بە خەتی نوسخ و ثولث نووسراوەتەوە، وردەکارییەکی زۆر لە نووسینەوەیدا کراوە. ناوی دەیان کەسایەتیی مێژوویی تێدایە، ساڵی ١٢٦١ بەخەتی عەبدوڵڵای فەنایی نوور بەخشیی مەولەوی نووسراوەتەوە.

ئەم بەڵگەنامە لە چەند روویەکەوە سوودی بۆ مێژووی کورد و زانایانی کورد هەیە، لەلایەکەوە ئەبوسەنا ئیجازەی لە مەولانا خالید وەرگرتووە، لەلایەکی ترەوە، ئەوەی من بزانم و لە ناوەکانیانەوە دیاربێت ناوی چەندان کەسایەتیی مێژوویی کوردی تێدایە رەنگە لە شوێنانی تردا ناویان نەبێ.

ئەم بەڵگەنامە بۆ ئەبوسەنا و لەسەر داوای ئەو نووسراوەتەوە، ئەویش- وا دیارە- لەسەر تەرتیبێکی زەمەنی و مێژوویی ناوی پیاوانی گەورەی تەریقەتی هەڵبژاردووە و بە خۆشنووسێکی نووسیوەتەوە، دوای ئەوەی ئەو ناوانەی لە شوێنی تردا دیوە و داوای لەو خۆشنووسە کردووە- دوای ئەوەی ئەم سەرەتای بۆ نووسیوە- بۆی نووسیوەتەوە.

من لێرەدا سەرەتاکەی ئەبوسەنای ئالووسی وەک خۆی دەنووسمەوە، دوایی بە بۆچوونی خۆم

---

(١) بروانە: المحامي عباس العزاوي. ذكرى أبي الثناء الآلوسي. شركة التجارة والطباعة (ذ م م . بغداد، ١٣٧٧هـ - ١٩٥٨م ل: ٣٩ .

(٢) بروانە: شهرزور السليمانية، عباس العزاوي، راجعه وقدم له وعلق عليه محمد علي القرداغي. الطبعة الأولى، بغداد- مطبعة السالمي ١٤٢٠- ٢٠٠٠ ، ل: ٢٥٨ .

ناوی ئەو کەسایەتییە کوردانەی لە بەڵگەنامەکەدا هاتوون هەر بە تەرتیبەکەی خۆیان لێرەدا دەنووسم، بەهیوای ئەوەی سوودی خۆی بدا.

ئەمە سەرەتاکەی ئەبوسەنایە:

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله الذي جعل من عباده من يُقاد إلى الجنة بالسلاسل. والصلاة والسلام على مريد هو مراده وخليفته في خليقته وبلاده، محمد سيد الأواخر والأوائل، وعلى آله وأصحابه الذين سلكوا أقوم طريقة فوصلوا- ويا لله تعالى درهم- الى الحقيقة، فغدا لكل منهم المرشد الكامل والشيخ الواصل، وعلى من اقتفى أثرهم وسار في الخلوة والجلوة سيرهم، فلما أشرقت عليهم أنوار شمس الأزل، واتحد لديهم ما لا يزال وما لم يزل. حطوا في فِناء البقاء بعد الفناء الرواحل.

وبعد: فيقول أفقر الورى، وخويدم الفقرا، أبو الثناء شهاب الدين السيد محمود مفتي الحنفية في بغداد المحمية عفا عنه رب البرية: إني منذ ترقيت من مرتبة العقل الهيولاني، وفرّقت بين المعقولات الأول والمعقولات الثواني، لم أزل مولعا بالانتساب إلى السادة الصوفية، والتأدب بآدابهم الصافية عن أكدار الحظوظ النفسانية، رغبة في أن يرشح عليّ ما يطفح من برك بركاتهم، ويشرح صدري ما يسرح في رياض التجربة مما تقتضيه رابطتهم من حسن توجهاتهم، وأن أكون ممن ضمّ إلى زبد العلم الذي مخضته الأفكار شهداً، وعلى جده حتى كان رسول الله -صلى الله عالى عليه وسلم- مرشداً وجداً. ففزت- ولله تعالى الحمد- بالانتساب إلى مشايخ أجلّة، وتحدثا بالنعمة أقول: قد أعطاني ربي- جلّت نعماؤه- جلّ ما رغبت فيه بل كله، وقد حررت أسماءهم في أثباتي، وأدرجت معظمها في درج إجازاتي، إلا أني ظفرت في هذا الأيام (كذا) بجريدة تتضمن من أصول الطرايق عن مشايخ عديدة. وحديث كانت على وضع رفيع القدر عجاب، ولي إلى أكثر من فيها من صالح وولي إنتماء وانتساب، أحببت كتابتها، ضاماً إلى ذلك أسماء آبائي الطاهرين المشرّفين بنسبتهم الصورية والمعنوية إلى سيد المرسلين- صلى الله تعالى وسلم عليه وعليهم أجمعين- ما طلب محبوب، وما جذب سالك وسلك مجذوب...

پێش دەستپێکردنی ناوەکان سەرەتا لە خڕکەیەکی جوانی ڕێکوپێکدا ناوەکانی خوا نووسراون. دوای ئەوە لە خڕکەیەکی تردا ناوی چواردە لە پێغەمبەران و ناوی جبرەئیل لە ناوەڕاستی خڕکەییەکەدا نووسراوە. دوای ئەوە لە خڕکەیەکی تردا ناوی پێغەمبەر (د.خ) نووسراوە بە دەوریدا ناوی کوڕ و کچەکانی و بە دەوری ئەوانیشدا ناوی کۆمەڵێک لە یارانی و شوێنکەوتووانیان دێت.

دوای ئەمانە ناوی دەیان کەس لە پیاوچاکانی ڕێبازی تەریقەت دێن، وەک وتم ئەوانەیان گومانم بۆ ئەوە دەچێ یان بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کوردن لێرەدا دەیاننووسم:

١- سەید ئەبولوەفا. ڕەنگە ئەبولوەفای نەرجسیی بێت.

٢- نجار الاسترابادي.

٣- علوی دینەوەری.

٤- ئەبوعەلی روودباریی.

٥- ئەبویووسفی هەمەدانی.

٦- ئەبولعەباسی دینەوەریی.

٧- محەمەدی دینەوەریی.

٨- حەسەنی ئوسترابادی.

٩- عين القضاة الهمداني.

١٠- ئەبونەجیبی سووڕەوەردی: عەبدولقاهیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی محەمەدی کوڕی (عمرية).

١١- عیمادەدینی سوهرەوەردی.

١٢- خواجە ممشادی دینەوەری.

١٣- شەهابەدینی سوهرەوەردی.

١٤- عەماری کوڕی یاسیری بەدلیسی.

١٥- خواجە یووسفی گۆرانی.

١٦- پیر (حلمه) شیروانی.

١٧- عوسمانی شیروانی.

١٨- سەید عەلی هەمەدانی.

١٩- سەلاحەدینی ئەیووبی.

٢٠- ئەبوبەکری کوردی.

٢١- کاکا بابای غاراسیی.

٢٢- شێخ ئیبراهیمی کوڕی حەسەنی گۆرانی.

٢٣- مەولانا خالیدی شارەزووری.

٢٤- شێخ عوسمانی سلێمانی.

٢٥- خەلیلولڵاهی باقلانی.

٢٦- شەهابەدینی مەحموودی ئالووسی. خاوەنی ئەم شەجەرە لە خواری ناوەکەی خۆیەوە نووسیویە: أخذ الطريقة العلية الصافية النقشبندية من الشيخ مولانا المشار اليه. ثم أنه – قدس سره– أمره بالاشتغال بالعلم، ووعده بأنه لا يحرم – إن شاء الله– من بركة أهل الطريق.

٢٧- شێخ (أمی) خامۆشی.

٢٨- جەمالی کوردی.

٢٩- مەحموودی ئەشنەوی.

هذه مبنية على الكتاب والسنة وسلامة الصدر وسخاء اليد وبذل الندا وترك الجفا والصفح
عن عثرات الاخوان والنصيحة للاصغار والاكبار ... ياولدي بالفقراء
واحفظ حرمات الشيوخ وحسن العشرة مع الاخوان وترك الخصومات الا
في ترك امور الدين واعلم ياولدي وفقنا الله واياك والمسلمين اجمعين ان حقيقة الفقر
ان لا تفتقر الى من هو مثلك وحقيقة الغنى ان تستغني عن من هو مثلك وان
التصوف لا يؤخذ عن القيل والقال ولكن اذا لقيت الفقير فلا بد بالرفق لعلم وايضا
بالرفق فان العلم بوحشه والرفق يونسه ... ياولدي وفقنا الله واياك والمسلمين
اجمعين ان التصوف مبني على ثمان خصال الاول السخا الثاني الرضا الثالث الصبر
الرابع الاشارة الخامس الغربة السادس لبس الصوف والسابع السياحة والثامن
الفقر فالسخاء لنبي الله ابراهيم عليه الصلاة والسلام والرضى لنبي الله اسحاق عليه السلام والصبر
لنبي الله ايوب عليه السلام والاشارة لنبي الله زكريا عليه السلام والغربة لنبي الله
يوسف عليه السلام ولبس الصوف النبي الله يحيى عليه السلام والسياحة والسياحة لنبي الله عيسى
عليه السلام والفقر لجدي رسول الله عليه الصلاة والسلام كشرف ... وعز وجل وعظم واوصيك
يا ولدي ان تصحب الاغنياء بالتعزز والفقراء بالتذلل وعليك بالاخلاص وهو
نسيان رؤية الخلق ودوام رؤية الخالق ولا تتهم الله في الاسباب واسكن اليه في جميع الاحوال ولا
تضيع حوائجك اتكالا على احد لما بينك وبينه من المودة والصداقة والقرابة
فان الله فرض لكل مومن حقا وعليك بخدمة الفقراء بثلاثة اشيا احدها التواضع
والثاني حسن الادب والثالث سخاء النفس وامت نفسك حتى تحيى واقرب
الخلق الى الله وسيلة واوسعهم خلقا وافضل الاعمال رعاية السر عن الالتفات
الى شيء سوى الله تعالى واعلم يا ولدي ان الصولة على من هو دونك ضعف وعلى من هو
فوقك تخبط وان الفقر والتصوف كله جد فلا تخلطه بشيء من الهزل ... عند
وصيتي لك ولكل من يقف عليها ويسمعها ولواهام المسلمين المريدين
والمحبين كثرهم الله تعالى والله تعالى يوفقنا واياكم لما ذكرناه وبيناه ويجعلنا
ممن يقتفي اثار السلف ويتبع اخبارهم بحرمة سيدنا ومولانا محمد صلى الله
عليه وسلم وعلى اله وصحبه وسلم تسليما كثيرا الى يوم الدين والحمد لله رب
العالمين

لنبي الله زكريا عليه السلام والغربة
لنبي الله يوسف عليه السلام ولبس الصوف لنبي الله يحيى عليه السلام والسياحة لنبي الله عيسى عليه السلام

والفقر لجدي رسول الله صلى الله عليه وسلم

وشرف وكرم ومجد وعظم اوصيك يا ولدي وفقك الله وايانا والمسلمين اجمعين
ان تصحب الاغنيا بالتعزز والفقرا بالتذلل وعليك بالاخلاص وهو نسيان رؤية الخلق
ودوام رؤية الخالق ولا تتهم الله في الاسباب واسكن اليه في جميع الاحوال وان
لا تضيع حوايجك اتكالا على احد لما بينك وبينه من المودة والصداقة
والقرابة فان الله فرض لكل مومن حقا وعليك بخدمة الفقرا في ثلاثة اشيا احدها
التواضع والثاني حسن الادب والثالث سخا النفس وامت نفسك حتى تحيا
واقرب الخلق الى الله تعالى اوسعهم خلقا وافضل الاعمال رعاية السر عن
الالتفات الى شيء سوى الله تعالى وتعلم ان الصولة على من هو دونك ضعف

# ئاشنانەوە لە کوردستاندا

## دانراوی مامۆستا مەلا وەسیم

٥٧٢(*)

**پێشەکی**

دۆزینەوەی هەر دەستخەتێکی کۆنی مامۆستایانی کورد هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی ونبوو و شاراوەی مێژووی ئەدەب و ڕۆشنبیریی و کولتووریی کوردە، بایەخ و سوودی ئەو لاپەڕەیش خۆی لە بەبایەخی ئەو دۆزراوەدا دەنوێنێ کە تازە سەر هەڵدەدا.

دیاریی ئەم جارەم دۆزینەوەی لاپەڕەیەکی کەموێنەی مێژووی ئەدەب و زانستی کوردە، لاپەڕەیەک بەبیری مندا نەهاتووە – و باوەڕیش ناکەم بەبیری ڕۆشنبیراندا هاتبێ – کە مامۆستایانی پێشوومان خۆیان لە قەرەی کاری وا دابێت.

ئەم دۆزینەوەیە ڕەنگە- نەک بەپێوەدانی بارودۆخی ڕۆشنبیریی کورد- بەپێوەدانی ڕۆشنبیریی گەلانی جیهانیش دەستپێشخەرییەکی کەموێنە بێ. مامۆستایەکی کورد پێش زیاتر لە ٢٣٠ ساڵ بیر لەوە بکاتەوە باسێکی تێروتەسەل و تەڕ و پاراو و بەپێز لەسەر دروستکردنی ئاش بنووسێ، کە تا ئێستە من وێنەیم نەدیوە و، ڕەنگە وێنەیشی نەبووبێ.

سەرەتا چەند خاڵێک لە بایەخی ئەم کارەدا دەنووسم:

یەکەم: کارەکە بە زمانی کوردییە.

دووەم: کارەکە تا کۆتایی کە لە ٢٧٥ بەیت زیاترە لەسەر یەک قافیە و سەروا ڕۆیشتووە، کە ئەمە خۆی- نەک لە شیعری تەعلیمیی – لە چامەی ئەدەبی کوردیشدا کەموێنەیە.

سێیەم: لە نووسینێکی زوومدا ئاماژەم بۆ ئەوە کردووە کە دەڕاسە و تەرەکتۆر سەدان وشەی ڕەسەنی کوردیی جووت و گا و دروێنە و خەرمانکوتانیان پێچایەوە[1]، لەم نووسینەیشەوە بۆمان دەردەکەوێ کە وشەی (ئاشە مەکینە) هەگبەیەک وشەی ڕەسەنی کوردیی کە لە ئامرازەکانی ئاشی ئاو پێک دەهاتن پێچایەوە و، ئەم نامیلەکە تۆمارگەیەکی بە ئەمانەتی ئەو وشە ڕەسەنانەیە کە ئەگەر ئاوا نەبووایەت و پێش ئەوەی مەبەست و واتاکانیان لە بیر بچنەوە بمانزانیایەن و فەرهەنگۆکمان بۆ بکردایەن دەیان وشەی ڕەسەنی کوردیمان دەخستە سەر

---

(*) لە ژمارە (٧)ی کۆواری (ئەکادیمی)دا بڵاو بووەتەوە.

(١) بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغیی، چەند لکێک لە زمانی سێبەری ئەسپە شێدا.

**خەرمانی فەرهەنگی کوردی و بۆ بەرانبەری چەندان شت کە ڕەنگ بێ بۆ بەرانبەریان دابمێنین بەکارمان بهێنایەن[1].**

**دانەری ئەم کتێبە کێیە؟**

دانەری ئەم کتێبە خۆشبەختانە لە کۆتاییی کتێبەکەیەوە لە دوو لایەنی پڕ بایەخ دەدوێ - با بەکورتیش بێت - کە هەردووکیان بۆ ئێمە مایەی شادمانیی و جێگەی سوودن:

یەکەمیان: مێژووی دانانی کتێبەکەیەتی کە لەو بارەوە نووسیویەتی:

سەنە هەزار و صەد و نەوەد بی

هەفت ساڵی هەنی هەم چاگە و دمای

(چە رعافنە وراوم!) کەردەن

هیچ کەس نەواچۆ پەی چێش ژاویای؟

بەم پێیە ساڵی ١١٩٧ک کتێبەکەی داناوە.

لە دوای ئەمەیشەوە لە بەینێکدا ناوی خۆی ئاوا نووسیوە:

واو، سین، ی، میم، ئەرجو دارۆ

پەرێش بوانان سوورەی دۆعای

بەگوێرەی سەرەتای ئەم بەیتەیش ناوی دانەرەکەی پێک هاتووە لە (و س ی م) کە دەکاتە (وەسیم).

بەڵام ئەم وەسیمە کێیە؟ دوای گەڕان بەسەرچاوەکاندا و پشکنینی ناوی زانایان، ناوی دوو وەسیم ناو دەبینین: شێخ محەمەد وەسیمی یەکەم کە ساڵی ١١١٨ک. لەدایک بووە و ساڵی ١١٧١ک. کۆچی دواییی کردووە. محەمەد وەسیمی دووەم کە ساڵی ١٢١٩ لەدایک بووە و ساڵی ١٢٧٥ک. کۆچی دواییی کردووە[2]. بەڵام بەپێی ئەو مێژووەی کە لە کتێبەکەدا نووسراوە، ئەم دانراوە بۆ مێژووی هیچ کام لەو دوو محەمەد وەسیمە دەست نادات.

چونکە مێژووەکە پێش لەدایکبوونی دووەم و دوای مردنی یەکەمە. مێژووی نووسینەوەی کتێبەکەیش کە ساڵی ١٢٣٣ کۆچییە پاڵپشتی ئەوە دەکات کە بۆ محەمەد وەسیمی دووەم دەست نەدات.

ئەگەر هەڵەیەک یان ئاڵۆزییەک لە نووسینەوەی دەستخەتەکەدا لە شوێنی مێژووەکەدا هەبێت ئەوە دەگونجێ بۆ شێخ محەمەد وەسیمی یەکەم بێت، ئەمەیش دوور نییە؛ چونکە ئەم شێخ محەمەد

---

(١) زانایانی عەرەب کە بەدرێژیی لەسەر زانستی عەرووزی عەرەبیی ڕۆیشتوون و ناویان بۆ بەحرەکانی داناوە، ناوەکانیان بەزۆریی لە ئامرازەکانی دەوار وەرگرتووە، چ دەبێ ئەگەر ئێمەیش لە ئامرازەکانی ئاش ناو بۆ چەند کەرسەی پیشەسازیی سەردەم دابنێین؟

(٢) بڕوانە: بابا مردوخ ڕوحانی شیوا، تأريخ مشاهير كرد، سروش، تهران، خيابان استاد مطهری، نبش خيابان دكتر مفتح. ساختمان جام جم، چاپ اول، ١٣٦٤، ل: ٢٣٧، ٤٠٥.

وەسیمە گەلێ دانراوی جۆراوجۆری لە گەلێ بابەتدا بەشێوەی گۆرانیی هەیە و، دەکرێ ئەمەیش یەکێک بێت لە دانراوە نەزانراو و باس نەکراوەکانی.

خۆ ئەگەر ئەمە نەچێتە سەر دەبێ بڵێین: لە نێوانی ئەو دوو شێخ محەمەد وەسیمەدا وەسیمێکی تر هەیە کە تا ئێستە نەناسراوە، ئەویش پیاوێکی زانا و بەتوانا و خاوەن بەرهەم و دانراوی شاکاری وەک ئەم نامیلکە بووە کە لە بەردەستماندایە. لەم حاڵەدا دەبێ بەچاوەڕوانیی بمێنێتەوە تا یان نوسخەیەکی تری دەست دەکەوێت و مێژووەکەیمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، یان ناوی شێخ وەسیمی دانەری ئەم کتێبەمان- ئەگەر جگە لە یەکێک لەو دووانە بێت - لە سەرچاوە و شوێنگەلی ترەوە بۆ ڕوون دەبێتەوە.

**باسێکی دەستخەتەکە:**

ئەم دەستخەتە بریتییە لە دەستخەتێکی کۆنی شڕی پەرپووتی دڵۆپەلێدراو، بەگوێرەی ڕەنگی لاپەڕەکانی بەلای کەمییەوە دوو تا سێ جار دڵۆپە لێی داوە و، تەڕ بووە و خووساوە، بەڵام خۆشبەختانە مەرەکەبەکەی ئەوەندە چاک بووە و چاک گیراوەتەوە ئەم هەموو تەڕبوونە نەیشۆردووەتەوە، هەر چەند هەندێ شوێنی تێکەڵ و پێکەڵ کردووە.

شیرازەی پساوە و لێی لە ناوچووە، کەسێک هاتووە چەند لاپەڕەی تر- کە لە ناوەڕۆکدا لەیەک ناچنی- هێناوە لە پێشی ئەو دانراوەوە دای ناوە، ئەو چەند پەڕە لە باسی شەرحی چل فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) و هەندێک سەڵاواتدان. بەڵام کاغەزەکانی ئەوەندە خراپن پواون لەخۆیانەوە دەکەون و هەڵدەوەرن. ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەو نامیلکەیە کە لە باسی ئاشنانەوەدا نووسراوە. دووبارە خۆشبەختانە کاغەزەکەی ئەم جۆرەکەی جیایە و باشتر خۆی گرتووە و دوای ئەو هەموو کارەساتەی بەسەری هاتووە هێشتا هەر باشە و زۆر نەڕزیوە.

ئەم باسی ئاشنانەوەیە ٢٤ لاپەڕەیە، پێوانەکەی (١١× ١٥)ە، ناشارەزایانە و ناشیانە بە بەن و پەتێکی ئەستوور لە پێستێکی قاوەیی دووبەر گیراوە. هەرچۆن هەیە ئەو پێستە پاراستوویەتی.

سەرەتای نامیلکەکە نەماوە و، ڕەنگ پەڕەیەک یان زیاتری لێ کەوتبێ. کۆتایییەکەی ماوە، نووسەرەوەکەی لە کۆتاییەوە نووسیویە:

تمت شد في يد الحقير الفقير فتح الله بن عبدالله سنة ١٢٣٣.

کە جارێکی تر چاو بەم دەستخەتەدا بگێڕینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو مامۆستای دەستخەتەکەی نووسیوەتەوە، بۆ گەلێک لەو وشانەی خوێندنەوەیان ئاسان نییە، یان خوێندنەوەیان لە ڕوویەک زیاتر هەڵدەگرێت، سەر و بۆری کردووە و، کارئاسانیی بۆ هێنانەوە سەر ڕێنووسی ئەمرۆی کردووە.

لە دەستخەتەکەدا هەندێ - باکەمیش بن - نیشانەی سەرەتای ڕێنووسی کوردیی دەبینرێت؛ وەک بەکارهێنانی (ە) هێی خڕ لەباتیی (فەتحە - سەر).

هەندێ وشەی سەرنجڕاکێش لە ڕووی نووسینەوەوە لە دەستخەتەکەدا دەبینرێن؛ وەک (بەیتەور)

لەو نووسینە کۆنانەدا من دیومن هەموویان (بیطور - بەیطەور)یان تێدا نووسراوە، بەڵام ئەم مامۆستا - ئیتر نازانم هەر دانەرەکەی وای نووسیوە یان داهێنانی نووسەرەوەکەیە - تێکڕا بە (بەیتەور) نووسیویەتی.

هەروەها لە هەندێ شوێندا وشەی لە تەک وشەی تردا لکاندووە بەیەکەوە؛ بۆ نموونە (زیادشکرە) ئەمە لە دەستخەتەکانی تردا وام نەدیوە بەڵکو (زیادش کرە - زیادش کەرە) نووسراوە. هەروەها (یکتمن) لە باتیی (یەک تمەن) و وشەگەلی تریش.

هەر وەک دیارەیەکی تر: بۆ هەموو ئەلفێکی درێژ وەک: (دار)، (ئاچۆ)، (ئارد)، (ئاو)، (هاران) گەلێ جار نیشانەی (مەد - درێژ)ی بەم شێوە (آچو، آرد، آو، هارآن) داناوە.

جاری وایش هەیە بواردوویەتی. بەڵام بۆ ئەلفی کورت وەک: (ئەگەر)، (ئیمجار)، (ئەر)، (ئەوەڵ)... هیچی دانەناوە و هەر (اگر، ایمجار، ار، اول...)ی نووسیوە.

کارێکی تریش هەیە ڕەنگە تایبەتمەندی ئەم دەسنووسە بێت؛ ئەویش ئەوەیە (واو)ێک هەیە لە زاراوەی گۆرانییدا دەلکێنرێ بەدوای وشەوە وەک (وەختو)، (چارەکێو)، (ئەصلو) کە واوی عەتف نییە لەم دەستخەتەدا بەزۆریی لکێنراوە بە وشەکەوە.

**مێژووی ئاش لە کوردستاندا:**

ڕەنگە زیادەڕەویی نەکەم و دوور نەڕۆم ئەگەر بڵێم: ئاش کۆنترین پیشەسازییە لە کوردستاندا. بەڵام بەداخەوە لا لەم بارە بەنرخەی ژیانی کوردەواریی نەکراوەتەوە و، تا ئێستە نەمدیوە بەشێوەیەکی شیاو و ڕەسا لەسەر ئەم پیشەسازییە نووسرابێ.

کە دەڵێم: ئاش کۆنترین پیشەسازییە لەوەوە بۆی دەچم کە مرۆڤ - هەموو مرۆڤ، دیارە کوردیش - ڕاستەوخۆ ژیانی بەسراوە بەو پیشەوە؛ چونکە هەر کەسێ لوێچێ گەنم یا جۆ یان هەرزن یاگاڵی بوویێ کە ویستبێتی بیکات بە نان یان بە کولێرە یان بەگێتکە، پێویستی بەوە بووە بیهاڕێت و بیکات بە ئارد، ئەمەیش بەدەستاڕ یان ئاش کراوە و، دەستاڕیش کەمتر؛ چونکە ڕەنجی زۆری دەوێت و بەرهەمی کەمیش دەدات.

هەروەها مێژووی ئاش بەگشتیی نازانین، نایشزانین مرۆڤ لە درێژاییی ژیانیدا چەند جۆر ئاشی داهێناوە و بۆ پێویستیی هاڕینی دانەوێڵە بەکاری هێناون؛ چونکە مەرج نییە لە هەموو شوێنێکدا بارودۆخ گونجاو بووبێت بۆ ئەو ئاشنانەوەی تا سەردەمێک لەمەوپێش لە کوردستاندا دەوری هەبوو.

ئەوەتا مامۆستای دانەری ئەم نامیلکەی باسی دەکەین، ناوی چەند جۆر ئاش دەهێنێ، کە دەمێکە لە کوردستاندا یان هەر باویان نەبووە یان باویان نەماوە، لەم ڕووەوە نووسیویە:

واچوو: ئاسیابی چەندێ نەوعێنی
هەم چنای نەوعێ مەبۆشان نیای!

یەکێ زەنبـــوورەک، یـەکێ تـەنوورەن

یەکێ مـــەگـــێـلـــۆ تیـــرش لاوەلای

یەکێ بە ئەسپ و ئێســتـر مـەگێلۆ

یـەکێ نـاوەنە، یـەک ئـاســـــاو و وای

ئەمما جـــەی مـــەکـــان نـاوە باونـە

چون ئاســـانـەنە پەی هیچ نەزانـای

مامۆستامان لێرەدا ناوی چوار جۆر ئاش دێنێ کە ئێمە ناویانمان نەبیستووە و، دوا ناویان کە ئاشی ئاوە دەفەرمووێ: ئەمەیان لە هەموویان ئاسانترە و بۆ خەڵکی سادە و هیچ نەزان ئەرک و زەحمەتی زۆری ناوێ. دووبارە زیادەڕەوی ناکەم ئەگەر بڵێم: هەموو گوندێکی کوردستان ئەگەر چەند ئاشی تێدا نەبووبێت ئاشێکی تێدا بووە، دیارە مەبەستم ئەو گوندانەیە کە بارودۆخیان لەبار بووە بۆ ئەوەی ئاشیان تێدا بنرێتەوە.

ڕەنگە ئەم ئاشە ئاوانەیش بکرێن بەدوو سێ بەشەوە: بەشێکیان هەر ئاشی زستانە بووە و، کە کەوتوونەتە بەهار و ئاو کز بووە، ئەو ئاشانەیش ئاویان کەوتووە و پەکیان کەوتووە.

هەر بەبیرەوەریی من لە زادگای مندا ئاشی زستانە هەبوو، کە زستان ئەهات و ئاو زۆر دەبوو ئەو ئاشە ئەنرایەوە و کاری ئاوایی و چەند شوێنی تریشی مەیسەر دەکرد، تا بەهار دەهات و وردە وردە ئاو کز دەبوو ئەوسا دەبووایە باراش بۆ شوێنی دوور ببرایەت و، لەوێ نۆرەی بۆ بگیرایەت، تا نۆرەی نەهاتایەت بۆی نەبوو باری خۆی لێ بکا و، پەندی (ئاش و تەنوور بە نۆرەیە) لەوەوە هاتووە، هەروەها پەندی (دەوەن بەئاش)یش.

هەر بەبیرەوەریی من دوو سێ ئاش هەبوون کە هاوین و زستانیان بۆ نەبوو، ئاوی بنەوانەکانیان زۆر بوو، هەموو کات ئاشگێڕ زیاتر ئاویان پیا دەهات و ئاشەکان پەکیان نەدەکەوت، وەک: ئەستێڵ و بانی خـێـلان و دەرەدۆین و، پسـاکـان... ئاشی ئەم شـوێنـانە هەمـوو کـات لە گـەڕدا بوون و – بەتایبـەتی لە هاوین و پایزدا – خـەڵک لـە شـوێنی دوورەوە باراشـیـان بۆ دەبردن و نۆرەیـان تێـدا گیرابوو.

هەر لەو شـوێنە ئاودارانەدا، وا بووە چەند ئاشی بـەڕز تێدا نراوەتەوە و، شـوێنی وا بـووە پێیـان وتووە: حەوت ئاشان. وەک گوند هەبووە بەناوی (ئاشەوا) کە چەندان ئاشی تێدا بووە[1].

---

(١) ئاشـەوا: ئێستـە هاوینەهەوارێکە لە ناوچەی بادینـان، لە کۆندا چەندان ئاشی تێدا نراوەتەوە؛ چونکە شـوێنەکـە لێـژ بووە و ئـاوی زۆر بەخـوڕ لە سـەرەوە هاتووەتە خـوارەوە. ناوەکـەیشی دەگـونجێ لەوەوە هاتبێ کـە دەڵێن: حـەسـەناوا، عـەلیـاوا، ئـاشـەوایش بەوە ناونرابێ کـە بەئاش و بۆ ئاش ئاوەدان کراوەتەوە.

هەر بەبۆنەی ناوی ئاشەوە مامۆستا حەمەبۆر دەڵێت: لای سلێمانیدا ئاشێ بووە پێیان وتووە (ئاشە پەپوولە) لە سـەردەمی فەرمانڕەواییی شێخ مەحموودا کە سلێمانیی بوردومان کراوە. شێخ بارەگای گواستووەتەوە، یەکێک لەو شتانە گەنجینەکەی بووە، کـە هەرچی پارە و لیرەی هەبووە لە سێ =

خۆ ئەگەر بە وردیی سەرنجی مۆزەخانەکان بدەین یان بە شوێنە کۆنەکاندا بگەڕێین نموونەی هاڕینی سەرەتاییی جۆراوجۆر هەبووە و ئیستەیش تاک و تەرایان ماوە. بە بیرەوەریی من لە خوارووی گوندی تەکیەوە بەردێکی گەورە هەبوو ناوەکەی چاڵ کرابوو پێیان دەگوت: (هارەگلیلەکە). هەروەها ئێستەیش لەسەر تەختی قەڵای (باوەکورۆیی) دوو سێ چاڵ هەن کە باش دیارن کاتی خۆی شتیان تێدا کوتراوە و هاڕراوە.

**کاری من لەم دەستخەتەدا:**

کە ئەم دانراوەم دەست کەوت و چاوێکم پێدا گێڕا و ئەمسەرە و سەرێکیم کرد و لە بابەت و ناوەرۆکەکەی گەیشتم، ماوەیەک دام نا و نەموێرا خۆم لە قەرەی ئەوە بدەم شتێکی لە تەکدا بکەم، چونکە ناوەرۆکەکەی - نەک بە من - بە ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆ نامۆیە و، وشە و زاراوەکانی زۆر بەکەمیی لە فەرهەنگە کوردییەکاندا هەن، کەسانێکیش کە مانای ئەو زاراوانە بە دروستیی بزانن، ئەگەر مابن، دۆزینەوەیان ئاسان نییە و، بابەتی وا تا ئێستە لە ڕۆشنبیریی و ئەدەبی کوردیدا بڵاو نەکراوەتەوە تا پەنای بۆ بەرم و بەراورد لە نێوانیاندا بکەم و شتێک بەشتێک بکەم. بۆ نموونە ئەگەر ئەمە باسی ڕاو و شکار، یان سەیرانی کیژان و سەردانی مەزار، یان باسی گوڵ و نەو سوەیل و بەهار، یان باسی کەژ و نسار و لالەزار، یان باسی چنار و تاڤگە و جۆیبار... بوایەت چەندان نموونەیان لە دیوانی شاعیرانی کۆندا هەیە و پەنام بۆ ئەو بابەتانە لەو دیوانانەدا دەبرد و لەبەر ڕۆشناییی ئەواندا ئەمیشم شتێک لێ دەکرد، بەڵام نەبوونی هیچکام لەمانە پشتی سارد دەکردمەوە و دەستم لە عاستی قەڵەمدا گۆی نەدەکرد.

ماوەی چەند مانگێک دەستخەتەکەم وەک خۆی دانا، بەڵام دوایی گوتم: ئەگەر هەر ئاوا دای بنێم دەبێ چارەنووسی چی بێت؟ دەبێ دوای من کەسێک ببێت لە من باشتری لێ بزانێت کاری باشی بۆ بکا؟ گومانم لەمانەدا هەبوو، بۆیە گوتم با چیم بۆ دەکرێت بیکەم و، بەهەڵە و ناتەواویشەوە بێت بیخەمە بەردەستی ڕۆشنبیران و ناوی بەگوێی ڕۆشنبیراندا بدەم، لەوە باشترە بەچاوەڕوانیی چارەنووسی نادیارەوە دایبنێم. چونکە ئەم دانراوە بەم شێوەی کە هەیە لە لێواری گۆڕ و مردندایە و ئەگەر نەیشتوانرێ بەتەواویی بیووژێنرێتەوە و گیانی بەبەردا بکرێتەوە، ئەوا نیوە گیانێکیشی بە بەردا بکرێتەوە هەر لەوە باشترە بەگیانەڵڵا و چاوەڕوانیی مردنەوە بهێڵرێتەوە!

---

=سندووقدا بووە، نراوە لە هێسترێک و زەلامێک ڕەشۆی هێسترەکەی ڕاکێشاوە، تەیارە هاتووە بۆردومانی کردووە ئەو زەلامەی هێسترەکەی ڕاکێشاوە بەرکەوتووە و کوژراوە، ئەو چەکدارانەیش لە تەکیدا بوو ون پەرتەوازە بوون و خۆیان شاردووەتەوە، هێسترکەیش بەلەسە بووە و خۆی کردووە بەئاشە پەپوولەدا، خاوەن ئاشەکە کە (... ...) بوون بارەکەیان خستووە و، گەنجینەکەیان شاردووەتەوە و، دوایی هەر چەند ئەشکەنجەیان داون و بەندیان کردوون نەچوونەتە ژێر و، ئەو سامانەیان بۆ خۆیان چەپاو کردووە.

هەر بەو بۆنەوە دەڵێم: لە دەوروبەری گوندی تەکیەی زادگای مندا چەند ئاش هەبوو لەوانە: ئاشی بەرامبەر، ئاشی کوورە، ئاشی دوودەر.

بۆیە ورەم بەرنەدا و وزەم دا بەخۆم و دەست لە دەست و قوووەت لە خوا، دەستم کرد بەنووسینەوەیی و، زۆر لەسەرخۆ و دوای هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەی وشەکان، بەبیر و بۆچوونی خۆم هەرچیم بۆ خوێنرایەوە هێنامەوە سەر ڕێنووسی کوردی، هەرچیشم بۆ ساغ نەکرایەوە بە ڕێنووسەکەی خۆی لە نێوان دوو کەوانەدا و، لە تەک ئامرازی سەرسوڕماندا دام نا، هەندێ جاریش شوێنەکە بەتەواویی کوژابووەوە، یان هەر بۆم نەخوێنرایەوە ئەوە خاڵم لە شوێنەکەیدا دانا.

بەم کارەیش – بەبڕوای خۆم – لەلایەکەوە ئەم ئەندازەم لە دانراوەکە لە چنگ مۆتەکەی لەناوچوون دەرهێنا، لەلایەکی تریشەوە دانراوەکە– وەک خۆم بۆم خوێنراوەتەوە – لە تەک وێنەی تەواوی لاپەڕەکاندا – دەخەمە بەردەستی ڕۆشنبیرانی کورد، بەڵکو لای کەسێک نوسخەیەکی تر پەیدا ببێ، یان کەسانی لە من شارەزاتر بەکارەکەی مندا بچنەوە و، ئەوەی من بۆم ئەنجام نەدراوە ئەوان تەواوی بکەن، بەمە و بەهەموومان شاکارێکی مامۆستایەکی گومناوی مەزنی کورد بخەینە کتێبخانەی کوردییەوە.

دەبێ لێرەدا بەسەر ئەوەدا نەڕۆم کە گومانم نییە هەڵەی زۆرم لە هێنانەوە سەر ڕێنووسی ئەو بەشەیشدا هەیە کە هێناومەتەوە سەر ڕێنووسی کوردیی، بەڵام ئەوەی پاساوی ئەوەم بۆ دەدات دوو شتە:

یەکەم: سەرچاوەی باسەکە، یان کەسانی شارەزام دەست نەکەوت تا پەنایان بۆ بەرم.

دووەم: هەرچیم لە دەست هاتبێت درێغیم نەکردووە و، شەونخوونیی و گەڕان و خۆماندووکردنم لە پێناویدا بەلاوە گران نەبووە.

هەروەها لێرەدا دەڵێم: یادت بەخێر کا فەرەج[1]، ئێستە لە کوێت بێنم یەکە یەکە مانای ئەو زاراوانەم پێ بڵێیت کە سەریان لێ دەرناکەم!

فەرهەنگۆک:

لە زۆری ئەو دەقە کەلەپوورییانەدا کە تا ئێستە بڵاوم کردوونەتەوە – بەتایبەتیی دەقە گۆرانییەکان – هەوڵم داوە فەرهەنگۆک بۆ هەندێک لە وشە و زاراوەکانی ناو دەقەکە بکەم.

بۆ ئەم نامیلکەیش حەزم دەکرد فەرهەنگۆک بکەم و مانای وشە و زاراوەکانی بکەم، بەڵام وەک وتم ئەم بابەتە نامۆیە و، وشەکانی بەگوێ و هەست و بیری ڕۆشنبیری ئەمڕۆ نائاشنان و، کەسانێکی وا دەست ناکەون مانای ئەو وشانە بزانن. بیرم لەوە کردەوە بەیارمەتیی فەرهەنگە کوردییەکان ئەم کارە بکەم، کە سەری فەرهەنگەکانیشم دا بینیم ئەوانیش لەم بوارەدا زۆر هەژار و مەودا تەسکن و، جێگەی متمانە و پشت پێ بەستن نین، بۆ نموونە یەک وشە دەخەمە بەرچاوی

---

(١) کا فەرەج پیاوێکی خزممان بوو هەردەم بەزستان ئاشەوانی ئەو ئاشە زستانەیە بوو کە لە بەرانبەری گوندی تەکیەوە دەنرایەوە. کەم ڕۆژ بوو لە تەک باوکمدا – خوا لێیان خۆشبێ – بەیەکەوە لە ماڵەوە دانەنیشن. ئەم پیاوە تا ئەم ساڵانەی دوایی لە ژیاندا بوو، بەڵام لەلایەکەوە من لە بەغدا و ئەو لە تەکیە و دوایی لە سلێمانیی و، لەلایەکی تریشەوە بەبیرمدا نەهاتووە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەستخەتێکی وام بێتە پێش تا زوو کەرەستەی بۆ بخەم.

خوێنەری ئازیز و، وەک دەڵێن: (مشتێ نموونەی خەروارێکە).

بۆ ئەم مەبەستە (پازناو)م کرد بە نموونە و، ماناکەیشی بەگوێرەی سێ فەرهەنگی کوردیی دەنووسم:

پازناو: مەڵغەی بەرداش هەڵێنان. (ف) اهرُم سنگ آسیا برداشتن. هەمبانە بۆرینە، هەژار، چاپی یەکەم. سروش، ل: ٩٨.

پازناوک: دارێکە وەک بێڵەکان دەکرێ بەنوێڵ و بەرداشی پێ هەڵدەگیرێ. فەرهەنگی خاڵ، چاپی دووەم، ئاراس ل: ٦٣.

پازناو: دارێکە وەکو تێلا وەکو نوێڵ دەخرێتە ژێر پێی ئاش و پێی ئاشی پێ بەرز و نزم دەکرێت بۆ ورد و درشتیی ئارد بەپێی خواست. پێی ئاش تا بەرز بێ ئاردی زبرە، تا نزم بێت و دابخرێت ئاردی وردە. فەرهەنگی کشتوکاڵ، مەعرووف قەرەداغی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم. ل: ٥٦.

ئەمە بۆ شتێکی ناسراوی ئاش سێ کەس بە سێ جۆر مانایان لێداوەتەوە. جا بۆ شتەکانی دی کە لە نامیلکەکەدان بەشی هەرە زۆریان لە فەرهەنگەکاندا هەر نین و باسیان نەکراوە[1]، دەبێ چی بکرێت؟ بەڵام هەرچۆن هەیە و چیم بۆ کرا و چەندم لە دەقەکە و لە نووسینانی مامۆستایان دەستکەوت بەچنگە کرێ و چنگەکوورێ فەرهەنگۆکێکم خستە پاشکۆی بابەتەکەوە، بەڵکو لەمەولا باشتری بۆ بکرێت و دەوڵەمەندتر بکرێت بەڵکو (کێ دەڵێ) نوسخەی تری دانراوەکە دەربکەوێ.

---

(١) هەر بۆ نموونە ئەمە چەند دانەیەک لەو وشانە: جیرهار، بەلەکی، بەرزەنە، وارنە، خلەچیر، هوربڕنە، بەرمانک، زەردەپل ، قەمچش، پلە، نیری، جواما، کەمەرگا، کوورەگا...

## دەقی هۆنراوەکە

رەویەک مـوحـتـاجـیی ندارت حـدود!
ئارێو مـوحـتـاج بۆ هەم بەرا و خـودای
کـارش مـەسـازی جـێت دڵ وەش مـەبۆ
وەشـی هـەی وەشـی بەهـەشـت و دنیـای!
واچوو: ئاسـیـابی چەندێ نەوعـێنـی
هـەم چنای! نـەوعێ مـبـۆشـان! نیـای
یـەکـێ زەنـبـوورەک، یـەکـێ تـەنـوورەن
یەکێ مـەگـێـڵـۆ تیـرش لاولای
یەکێ بە ئەسپ و ئێسـتـر مـەگـێـڵـۆ
یـەکـێ نـاوەنـە، یـەک ئـاسـاو و وای!
ئـەمما جـەی مـەکـان ناوە بـاونـە
چـون ئـاسـانـەنـە پـەی هـیـچ نـەزانـای
بیـنـاش بـنـێـمێ بـە پـاکـیـی دەروون
بـە ذەوق و زیـنـەت چـەنـی [بـسـم الـلـه]ی
کـەسێ نـە جـایێ بیناش ئاسـاوەن
کـوورەگـاش کنۆ دمـا و جـوامـای
دۆزەقـەی ئاسـا و با مـودەوەر بۆ
[مـشـیـو و دآیرنی] بە جـەدوەل کـێـشـای
... بـش بـێ زیـاد و کـەم
بڵندیش [با بو!] قـەد و کـەمـەرگـای
[چاکـو وار!] طووڵش چەهار گـەزێ بۆ
گـەزێ پەهـنـایش نـەبا خـەلەطیـای
... سـەر تـا بـە وار دیـوارش کـەرە
دیوار مـەحکەم دەسـتـکار و پـەندای!
دیـوار مـەحـکـەم ئـەر [بـو تـوی بـی بـر!]
[مـبـو تـعـدل!] دایرە نیـای

بەینشان جە یەک چارەک کەم نەبۆ
نەک خجڵ مانی وەختو خجڵیای
هەم چا نە واتم زیاتر نەبۆ
تا پێت راحەت بۆ وەختو هاڕنیای
ئەر واچی عەیب و کەم و زیادی
با پێت بواچوو گیانو برای:
ئەگەر بەینشا بێ حەد زیاد بۆ
ئانە خەراوەن پەی هاوسەراونای
ئەگەر بەینشان چانە کەمتەر بۆ
[قتّب!] مەگیران وەختو هاڕنیای
دارێوە هەنی [ونیوْادیشان!]
داری وەرینی نەوەرش نە پای
چاکو وار داریش پابنی بانی
تاکە بڵند بۆ وەر و ئاردەشای
هەر وەختێ کەردت داربەندیی تەمام
مەبۆ هەڕو خاک وە سەرش کێشای
جەو دما تەختە و خوانیش بتاشە
چەهار سووچ مەبۆ [پاناپش!] نیەدای
سەرانش هەردوو مشاربڕ کەرە
درازیش با بۆ قەد و [کورەکای!]
جە هەردوو سەرش چەهار ئەنگوشت کەم بۆ
هەر دوو لا مەبۆ تەوەنیش نیای
مەبۆ سەریۆش بنخانە گری
فاقەش یەک چارەک ئەصل موددەعای
چەهار ئەنگوشت بەینو هەردوو پەلەیش بۆ
تاکە مەحکەم بۆ تێش نیا نە پای
ئەو سە جەو دما چەنی ئەسکەنە
سۆراخ [دوری کن!] جە هەردوو لای
چەو دما چووبێ ڕاست و مورەببەع
ئەر موودەووەر بۆ قەیدش نە جەلای

باوەرە سەرێو زبانەش بڕە
ئەو قەدەر فاقەی جەی وەر کوک کڕنای
ئاچوو بە پەنەش مواچانی پاه
بەو پاوە بەندەن پەرێ هارگێلای
سۆراخێ جەی وەر نە فاقەت کەردەن
یەکێ هەنی کەر نە زوان و پای
ئەو زوان و پای بێ زیاد و کەم
مەبۆ نە فاقەی مەذکوورەش نیای
وەختێ پات نیا [ندلی خوانی!]
مەبۆ جە لاوە مێخش ویارای
مەبۆ ئا چووبە سەخت چوو پێ بانی
تا شکست نەبان وەختو پا نیای
جەو دما مەبۆ بشمێ ئەوداری
راست و دوو دارەی خوانی سەراونای
دوو دارەی مەحکەم قەدیم واتمان
بەنیو هەردووشان [نوا کلاش دای!]
[یونی تختی راستی رو دمنی!]
مەبۆ نە وەرو نە پشتش نیای
هەر لاشان صافەن بەرەش پەی خوانی
خوانی نەگیران وەختو هۆرێزای
تەوەنێ پانی صافی زەریفی
یۆ پەی سەرخوانی، یەکێ پەی لاو پای
هەر دووشان بادا مەحکەم نوانی
نمەبۆ فرێ ئەشکەنجەشان دای
باز هەم تەوەنێ پانی باریکی
جە سەرخوان مەبۆ چیر سەرش نیای
کەسێ نەزانۆ هەر پاسە خاصە
سەرخوانش بەرز بۆ کەمێ ئەولاو پای
جەو دما مەبۆ پاش وە پاکەری
سەرش نەفاقە و خوانی سازنای

[سـيـر سـيـرنش!] دياری كـەری

قـولانجێ سـۆراخ پەرێش هۆركنای

سـە چـهـارەک چوش پـو نـە ويـارە

ئاچوون مـەواچان: پێش شـمـشـێـر و پای

با جـا پاش جـە لاو ئاردەشـانێ بۆ

نـەوا خـەڵـەت بـی بـەريش پـەی ئـەولای

وەخـتێ پانيش تـەمـام كـۆک كـريا

بيـمێ سـەروكـار ناو و بارەگـای

بينای بارەگـەش چاكـە بيناكـەر

گـەزێ چـە پشت و بـيناو بـارەگـای

ئـا گـەزە واتم پـەی پـەنج گـەز نـاوی

بـاوا دوو گـەز بـو از... پـەی دای

ديوارێ مـەحكەم راسـت كـۆ بـەندی

بڵنديش با بۆ قـەدەر [جـو آمـای!]

پاسـە خـاصـەنە ئەر ئـاوێش بـەيۆ

هـەر چـەنـد بڵـنـد بـۆ بشـۆ پـەی بـاڵای

جـەو دمـا واچوو چێش مـەبۆ كـەردی

وەخـتێ بارەگـاش تـەمـام ونـارای:

چـەنـی طـەنـاف پـەيمانـەش كـەرە

بـەين و دوو دارەی سـەرو بـارەگـای

دوو دارەی وەريـن ئـەووەڵ وتمـان

سـەرو دۆزەقـەی جـە ئەصـڵـو پنای

جـەو دمـا مـەبۆ قـەدو طەنافی

دارێ مـوناسب نـاوش پـەی تـارای

پێـسـە بەو پەشـتـە و ئـەنگوشت گـەورەی

راسـتش ونـاری نـەک چون قـووجـيـای

سـەری وەرينش مـەبۆ قـەمـچش بۆ

ئـەر قـەمـچش نـەبۆ مـەبۆ چەمـچش دای

چەمـچش: تەخـتـێـوەن زەريف تاشـيـا

بری نـە بـەينش بسـمـاريش كـوای

سەر سەرینش با شانەدەم بۆ
ئاوێ نەگیرۆ وەختو ئاو ئامای
ئەر نمەزانی [کرتاشاد!] ناوی
پەرێت بواچوو پەسەند و ئوستای
وەختێ [تریت!] تو چری ناوی!
طەرەف قۆڵش مەبۆ هۆر کنای
طەرەف قوڵش تەخت سارا کەر
جەو دما مەبۆ طەنافش پێکای
ورچو پەرێشان پێکاو طەنافی
تاکە [بزاندی!] چەنیش طەناف دای
رێسمان صاف کرژو مەحکەم بۆ
باوەر بە [بیکش!] تۆ وە هەردوولای
چەنی سیاوی سیاوەش کەرە
تاکە نەورێو وەختو دەست کێشای
باوەر سێ ئەنگوشت دیاریی کەرە
ئەر ئاوش کەم بۆ سەرو ئارو نای
ئەگەر هەم ئاوش کەم بۆ وێش نیەن
ئەنگوشت هەنیش زیاد پنەدای
سەر سەرینش هەرچەند تێدا بۆ
ئەگەر گوشاد بۆ عەیبش نە جە لای
جە هەر دوو سەرش بەنێ بگیران
بەنێ سیاوێ دەستی توند کێشای
چەنی دوو ئەنگوشت بەنێ بگیرە
سەببەحە و ئەبهام چەنی وسطای
ئەمما جە ناودا دەستێ بگیرە
دەستت لار نەبۆ وەختو بەن وەردای
بەنێ هۆرکێشە هەرچەند وسی بۆ
بە ئوستادانە بپێکش ونای
جە سەر تا بە وار نەقشش مەکێشۆ
ئەمجار بەی دەستوور مەپێکش واو...

وەختێ هەر دوو لا سیاویش کێشا
ئەمجار دەست گرە تۆ وە تێشەشای
هەرتا مەتاوی خاصش بتاشە
بادا صافە بۆ جە سەر تا وە پای
بەینو طەناف و ناوێ هۆرکەنە
گوشادش گوشاد تەنگش تەنگ کونای
بەین سەری وارینش بە مشار برە
زۆرش زیاد بۆ پەرێ ئاو زیای
جە هەر دوو لاوە گیریش پەی بازە
تا کە نەتەرسای جە ئەرە خزای
لا و پلەی لیس و بادا باریک بۆ
تاکە نەپێکۆ پلەش لەب دەم نای
پێچیش پەلەو ناو نەزدیکی موان
ئەگەر دووری بان عەیبەن پەی وەستای
هەر وەخت تەمام بی تاشیاو ناوی
بێمێ سەروکار ناوی سەراو نای
صاحێب قووەتێ ناوی هۆرگێران
بیان باوەراش بەنامو خودای
وەختێ ناوشان یاونا بە جاه
[برانیش بلان!] سەرو بارەگای
[... کور و نای!] با هەر جە سەر بۆ
وەردێش باوەران پەرێ کوورەگای
دۆزەقەی ئاسا و پێمانە کەرە
هیچ زیاد نەبۆ ئیلا و ئەولای
[... رومو!] ناوی قەویی قایمەن
مەبۆ نە چیرۆ ماداریش لکنای
[... و کر!] هەم دەمش تەنکەن باریکەن
مەبۆ پەنجێوە مەفاصلش دای
... آرو چو رەش مەبۆ بواچۆن
قولانچێ چیرۆ ماداریش زنای

وەختێ سەراونات راست تەمام راستە
سەعیە بکەری قایمش بنیای
سەرنای با جە سەر دوی پلیش بان
ئاویش کەردە بۆ وەختو ئاو ئامای
بە بێ دەنگ بەیۆ قەڵوەز نەپێکۆ
سۆزە [پیویو!] ئاو نەو لێونای
جەو دما موورەش پەرێ بتاشە
هۆشت باوەرە پەی خاص تاشای
هەرچۆت خەیاڵەن بە مواە کەری
با چون یەکێ بان درێژ و پانای
خاص سەعیە کەرە پەی مودەوەریش
کاری هەمروی و یا فازش پەی دای!
جەو دما جاگەی پلانش کەنە
بیست و دو یا سێ نەشی چاکو لای
[... قلش!] هەژدە نۆزدە هەم خاصەن
تاقی بزانە پەرێ هەڵمەت دای
جاگەی پلانش ئەنگوشت شادەت
ئەنگوشتی گەورەی بادا پەی مانای
جاگەی پلانش لاری هۆرکنە
با پلێش نەکنان جە وەقت گێڵای
مووڕێ کیرِ کەنە سەر صەرفیش هەنبی!
پەی پل نەکەفتە و پەی کەسر بارای
پەی دووریی خاصەن بێ درۆو گەزاف
هاڕەهاڕ مەکەرد هاڕەی خاص هاڕهای
بەعدئەزان تاشاو پلان لازمەن
ئەندازەو پلان هەم مەبۆ زانای
چار ئەنگوشت چەنی یەک چارەک تەمام
چار ئەنگوشت پەی موور چارەک پەی گێڵای
کاسە دارێ بان کاسم مەکەرە
کاسە دار خاصەن پەی ئاوگر ئامای

ئەصڵــــو ئاســـاوی بەڵەکێ خـــاصـــە
بەڵەکێ خـــــاصـــــە پەی هـاروونا رای
ئەر بۆ درازیش پەنچ چارەک خــاصـــەن
ســەرش تیــژ نەبۆ عــەیبــەن پەی گـێـڵای
بە زۆر مــەنیــشــۆ دلێــر حــەو جـۆشی
خـــەرابەن دلێـــر حـــەوجـــۆشی بوای
جـــە گــێـــڵایەنە دووش کـــەم مـــەبۆ
دایم مـــــەلەرزۆ خــــوانش چەنی پای
بـــادا پــلـــو لاوش وێـنـــەی پـــەلـــو تـــو
چون ســەرو قــەلچـیش نەک ســەروســارای
جـــەو دمـــا یاران بشـــمێ پەی هاران
تاکـــە بزانمێ کــۆ مـــەشــیـــۆ لوای
نەوەر لانەو بـان بـەرمــــــانـک زەردەپـل
بەیۆیان خـــاصـــەن چەنی بەڕ [لشــای!]
هەم زوشت و هەم توند صــەدانی خـاصـەن
شــا مـــەشــیـــۆ کـــۆشش بدۆ بە صـــەدای
[کڵی!] بێ هەمـــتــان قــیــمـــەت نەدارۆ
تـەمــام بێ عـــەیبـــەن ئەو نە رووی دنیـــای
نەدەر هەم خـــاصـــەن خـــەیلێ مـــەهاڕۆ
کـەم عـومـرەن عـومـرش مـەشۆ جـەنی دای
کــێنمـــە هـەر حـــاڵ بەیدەر وای حـــاشـــا
هـارە بڕ مــەشــیــۆ جـــە خــێــرش زیای
لانـشــت لاودەنـشــت بـێ زیـاد و کــــــەم
روێ بـارێـوەن نـیــــەن چاکــــــو لای
چەکــــــینـە ئاردێ وردێ مـــــەهاڕۆ
ئەمما کـــەم مـــەدۆ مـــزد پەی لەم زیای
چە هـەزارانێ هـاری خــــاصــــێنی
هـەم گـــردیلەیی [وەرو مـــعـــرونای!]
باقی جـــەی مـــەکـــان هاری خــاص نیـــەن
[ئەسـپەرێز] خـاصـەن چەنی [سیسـر]ای
ســەرهار ســەنگ بڕ بۆ جـیـر هار سوورەنی

صاحێب ئاساوان بێدی تەماشای
جەو دما هەرجا جە هەر کۆ کانەن
ئوستادش مەبۆ هاری پەسەنیای
ئارورجیی مەبۆ منیچ بزانۆ
تەوەن شناسی میثلو ئوستای
پەرێت بواچوون ویردەر بە واتەم
نەگنی ئەو دماو عەقڵ و ساوای:
بەگشت ڕەنگێوە کان هارانەن
سوورەن، سەفیدەن، زەرد، چەنی سیای
ئەمما خاصیشان رەنگ حساب نیەن
ئەصڵش پیڕۆزەن صاحیب مەودای
بەڵێ پیرۆزەش [خرتی!] نەوانی
بوانی عەقیق جە وەختو سویای
پیرۆزی سێ سووچ چوار چلی بان
سەر چون [مووابان!] وەختو هۆرێزای
کۆڕ و دەروێشان مەبۆ بواچۆن
ئەرزن، گەندم، جۆ، نخوودەن ئەعلای
ئەرچا زیاتر پیرۆزش دەستەن
دەشتێ مەهاڕۆ وەختو پانیای
وەگەر هەم بینە پاش پەی بکێشی
نمەدۆ وە بەر وەختو پاکێشای
ئەر جە گرد کەمتر بیرۆزەش وەردەن
مەدۆ بەلاودا گشت سەعیە و ئۆستای
پیرۆزەش مەبۆ جیا جیای بان
بە خام بەندی بان نەک پێوە لکیای
[خامیشان توزین!] ئەمما مەحکەم بۆ
[توزی زردە بو ئەمەبو چرمای!]
ئەر بێ کارە بان تەمام خاصێنی
شەرطێ مەحکەم بان وەختو نەوای
[... سر!] پیرۆزەش بەسەنگ بەندینی
پیرۆزەش دوو بەش، بەشێ سەنگ نەپای

ئانە هەم خاصەن خاص مەهاڕانی
مەستانان بە زۆر حەق پەرێ ئوستای
ئەر چە پیرۆزە خامش فێشتەرەن
تەنی تۆ مەیۆن بە دەست پو نە شای!
... کلیچ مەهاڕۆ کەمێ کەمێوە
چەنی قوڵنگەی ونەداو ئوستای
ئەر تۆ بواچی: پیرۆزە چێشەن؟
تەوەن چەخماخەن نشی چاگە و لای
ئەر واچی: ڕەنگش چە ڕەنگێ مەبۆ؟
بەگشت ڕەنگێوە زوو نیشانمدای
ئەمما [داشکسان!] یەکسەر سەفیدەن
هەم بێ پیرۆزەن صەنعەت و خودای
فارسیی: سەنگ بڕ، تورکیی داشکسان
چون شان عەسەل قووت تی نە دەمیای
[کملاش!] شرینەن جە ئاو شرینتەر
شرین ئارۆشەن شرین ئاودێرای
هاوار سەنگ بڕ بۆ ئەر باقی هاران
سەرو چێرشان مەبۆ شناسای
ئەر چێرهار نەرم بۆ مانیع نەدارۆ
سەرهار با توند بۆ توند خاصەن هەی های
[ساتندی کوسی!] پەی پیرۆزە بۆ
پڕ پیرۆزە بۆ چون چیت کرای!
ئەگەر بەی ڕەنگە گەرتەنت بە دەست
ئاوەکەی کاسۆ پلانش پێکای
ئانە بزانە ئاو پلە وێشەن
مەبۆ [چاپاکی!] حەوجۆشش نیای
ئەگەر بن پلەش زیاد مەپێکۆ
قەدو زیادی بەرەش پەی ئەولای
ئەگەر سەر پلەش ئاو نمەدۆ لێش
مەبۆ باوەریش قەدو ئاو نەدای

[تیسری ئوکی پیسو حمّاجیّ!]
کاسۆ پلانش پەی مەبۆ پێکای
وەختێ ئاو پلەش موهەییا کەردی
مەحکەمش کەرە خوانە چەنی پای
هارێ مەکەرە بۆ سەرو هاران
گرد سەعیت بۆ بەی هار ونارای
ئەوسە چێرهارەت نیا نەجای وێش
مەبۆ بەڵەکێ چە [کرش زنای!]
ئەگەر بەڵەکەش کۆتاکارەنە
مەبۆ جە چیری چیرخوانش نیای
ئەگەر بەرزەنە ئەو سەرو هاری
هەم مەبۆ جە سەر هاری هور بەڕنای
خرت و بەڵەکی جە کردا کەم بۆ
ساراوە مانۆ زوانە و پانای
وەختێ چێرهارەت بە راست نە یارۆ
ئیمجار پەی لاریی نمەبۆ دیای
مەبۆ ئەندەکێ بگنۆ بە وەردا
نە یەندە قەدو میزان شێویای
میزانی خاصش کەسێ نەزانۆ
بەرێش بواچۆ زانای نە زانای
زاناش ئینەنە ئەمن مەزانۆ
تەجرەبەم کەردەن نەک خودپەسەنیای
ئەر ئاوێت کەرد ئەو سەرو هاری
ئاوەکێ مدرا قەدو تەمەننای
گاهێ ئاردێ وردێ مەهارۆ
بێ دەم و بین پەرێ تەماشای
ئەر نەرمی پەی وەر ئاوەردش ناوێ
ئانە سەرهارەش هارەن پەی بەردای
جە دماو وناراو میزان و هاری
مەبۆ خەیلێوە سووکێش پەی تاشای

سووکێ سێ سووچێ نووک باریکێ بان

سەرچاخ وەلێ لەڕ پەرێ ئاوکێشای

کۆنە کڵاشێ کارۆ قەباڵەی

مەبۆ گردەنۆ بەلەکیش پێچای

بەلەکە مەدرۆ چەنی کڵاشی

دەورو کڵاشی سووکەکان [کوای!]

جەو دما بەراست راستە کرانەن

دوو چارەک راستە [مبویش!] تاشای

قەدو چێرهارەی دیاریش کەرە

[هۆرش کەن قەدو زوانە ز...!]

بکەر سۆراخیش بە زوانەدا.

مەبۆ سووکێوەش بەوەردا کوای

یەکێ جە یاران بشۆ ئەو واری

چۆگە دەست کەرۆ پلە چەرخنای

تا لارو راستی ئەو سێ دیار بۆ

تاکە بزانی کۆش مەبۆ خزنای

زینهار! وارنە راستە نەگیری

خراوەن پەرێ ئاو پل شێونای

راستە ئەووەڵەن جە سەر کۆک مەبۆ

راستەی وارینش بازمێ پەی دمای

راستە جە هەرکۆ هارەی نەگیرۆ

هارەی بخزنە بەرەش پەی ئالای

ئەر نمەزانی چەنیش بەرینە

هارەی بخزنە بە نووک و پازنای

ئەر زیادت بەرد بازهەم نە بێکاش

مەبۆ چاراستە هارەی هور بڕنای

تا راستش بەیۆ بەیتەور واتمان

چەنیو هور بڕیەی هەم چەنی خزنای

ئانا راستمان بە راست ونارا

بیناکەر بیناو گەردوونە نیای

دیواری دەوری صاف و مەحکەم بۆ
مەبۆ گەزێوە بڵندش نیای
جە هەردوو لاوە زیادش کەرە
چارەکێ و زیاد ئەو دەم و ئاسای
دماو تەمامی و دیوارو دەوریش
مەبۆ بە صافیی سواخش کێشای
با بە ویرت بۆ نەبا ویاریش
یاگێ و چەقچەقێش مازە جە لاو پای
یاگێ و چەقچەقێش چەو بەینە مەبۆ
سۆراخێ دەوری نە دیوار نیای
بڵندو نزمیش قەدو سەرهارەی
ئەر بەرزەن بەرزە، ئەر نزمەن جە پای
دما گەردوونەی کارێ هەنێ هەن
گەردش لازمەن نمەبۆش لادای
دوو گەز تەختەی راست بە راست بتاشە
پەنج چارەک جەنیش داریۆ ئاروشای
بشاندا بەینش مەحکەمش بنیە
لەنگەر نەپێکۆ چەنێو لەنگەر دای
هەم دوو تەختەی صاف قەد و ئا تەختە
ئەندازەش گیرە ئەو قەدو ئاسای
سەریۆش بنیە قەدو چێرهارەی
ئەو سەرش قەدو تەختەی سەراونای
ئەو یەک بەی دەستوور بنیە وە ئەولاش
راستیشان بەیۆ چەنیو پێچیای
بنیشان واچۆن پەیمانەش کەرە
چێرهارەی کەران چەنی لەنگەر دای
هەم [زینتن!] پەی ئاردە دۆڵی
هەم لەنگەرێتی پەرێ ئاسیای
جەو دما سەر هار باوەرە نەوەر
بە راستیی دەست کەر تەوەرە نیای

ئەمما تەوەرێ دوی نەوعەنی
هەم دوی نەوعێ مەبۆشان نیای
ئەوەڵ ئاهنین کارێ مەحکەمەن
دوەم چۆ مەبۆ بە تێشەش تاشای
بەڵێ ئاهنین [سە صرفی!] دارۆ
هەر یەک یەک تمەن مشیۆ قیمەت دای
ئەوەڵ: مەحکەمەن شکستش نیەن
شکست خراوەن پەی پنەکیریای
دووەم: هەر وەختێ سەرهار سەر ڕاست بۆ
سەر لار نمەبۆ دماو راسشامای
سێیەم: ئەر زەڕەی سەر لاریش مانۆ
راست مەگنۆ وەختۆ خلەچیر سوای
واچوو سەراوناو ئاهنێ پەی تۆ
تاکە بزانی چەنیش سەر ئاونای
تەوەرەی بنیە ئەو سەرو کەری
چەنی پەیمانەی راست ئەرە نیای
وەختێ راست نیات ئەو [دلیو!] هارەی
مەبۆ لاش خەیطێ سیاوێ کێشای
ئەوسە هەردوو لاش دیاریی کەردی
بنیش وە ئەولا مازەش چاراستای
سەرقولنگە تیژ بنیۆ خەیطینە
صەبرێ دەست کەرە بەیاگە کنای
یاگێش بگنە یەندە [وسی!] بۆ
باز هەم باوەرەش هەم بنیەش نە جای
ئەر نمەزانی چەند نشتەش وەسێن
جەوی هار بەرز بۆ سەرو ئیلاولای
ئەگەر بواچی ئیلاو لاو چێش؟
سەرێو تەوەرەی جە ئەرە نیای
ئەنا تەوەرەت نیا نەجای وێش
بە بەن بەندش کەر پەی هارەسەر نیای!

بەیتەور بەند مەبۆ واچۆن پەڕەنیان

بەنێوە مەحکەم کرژو وادریای

دوە لاش وزێ قەدو تەوەرەی

نەک جاو بەلەکێ ئیلاو یا ئەولای

هەردوو سەرانش بشان بکەردا

جە پشتۆ هارەی هەم گرێشان دای

جەو دما توولێش پونە ویارە

مەحکەمش کەرە چەنی پێچیای

بادا هۆشت بۆ بێ گۆ نمەبۆ

بێ گۆ خراوەن پەی هارە سەر نیای

گۆیێ بتاشە بادا دوی پان

بەرزیی بان سەرو زوانە زیای

ئەگەر نزمی بان زیانش ئێدەن

زوانە مەبۆ مانیع و لوای

هار سەر سەنگ مەدۆ سەر بەلەکێ!

وەختو سەر وەستیو وەختو لانیای!

ئەگەر بەرزی بان سەرێو زوانەی

وەش [ملو!] وە سەر وەش مەیۆ پەی لای

گۆوان بەردانە سەرو چێرهارەی

یەکێ جە سەر خوان یەکێ جە لاو پای

چەنی [باوریت!] هارەی هور بڕنە

وەرش ئەو وەر بۆ پشتێش ئەو دمای

نەبەرمێ! بنیش ئەو سەرو گۆوان

دماش هۆر بڕنە دەست پێوەنیای

تاکە بیاۆ سەرهار نەجای وێش

تەوەرەی بەلەک راستێوە مدرای

بە پازناوێ خاص هارەی هۆربڕنە

دەست بەرە گۆوان باوەرە نەجای

پازناوی دەستیت بادا دوی بان

یۆ پەی ئیلات بۆ، ئەو یۆ پەی ئەولای

ئێدی هۆربڕنە، ئەوی بکێشە
ئەوی هۆربڕنە، ئێد بێ پەی دمای
ئەوسا پازناوێت بەر کێشای وە بەر
سەرهار کەوت وە سەر بەلەک شی نەجای
بنی تەوەرەی چەنی تۆڵەکێ
با بە ویرت بۆ مەبۆشان کێشای
تووڵێ بکێشە گرە بن وەردە
بەنێ بکێشە چون گرێ کێشای
جەو دما واچە ئەوی هۆر بنیان
تاهار بگێڵۆ گێلا خاص گێلای
وەختێ سەر هارەت خەیلێوە گێلا
دیاریی مەبۆ بەرز چەنی نزمای
جەو داما واچە ئاویش بڕانی
قۆچاخێ دەست کر هار ئەولا نیای
دوو پازناو هاری هۆر بڕنای
مەزانی هارێ چەنی لا نیەی!
هەردوو گۆ بنیە نە چێرو ئاسای
هارەی هۆر بڕنە [نبوی!] پازنای
راستیشان بنیە لاری نەوانی
یەکێ پەی ئیلای یەکێ پەی ئەولای
هارەی بکێشە باوەرەش وەلا
دەست بەرە پەرێ قوڵنگەی پۆلای
قوڵنگەی پۆلا ئاودار صاحیب بڕا بۆ!
یا مەوداش برۆ چەنی قوڵنگ شای
هەر کامێش بەرزەن ئانا دیارەن
ئانا ساویان ئەو چەنێو گێلای
بە ضەرب پەنجە مەودا و قوڵنگەی
بەرزیشان [- پست کر!] چەنی وندای
بەعدەزان: واچوون پەرێت گۆش دارە:
هۆشت باوەرە بۆوە سەرو رای

یەک چارەک جەیۆ هاران سیا کەر
سیاوێ بێ عەیب یەکسان سیاوەری
ئەوسا چارەکە بە ئاوی پاکە
تەڕکەرە چەنی پەنجە وەنەدای
باز بەرەش وەسەر بادا بگێڵۆ
یا چەنیو دەستی ها ئاوی گێلاّی
وەختێ خەیلێوە سەر هارەش گێلاّ
باز هەم سەرهارەی باوەرۆ پەی لای
ئانا دیارەن هەرکامێ بەرزەن
سیاوش کەردەن ئەو چەنی سیای
چەنی قوڵنگەی سیاوش چەنە
تا شەدە کێشۆ چون شەدەی بەغدای
شەدەش چار ئەنگوشت زیاتر نەبۆ
باقیی سەفید بۆ دوور جە وەنەوای!
یەک ئەنگوشت جە لەب هاران خاڵیی بۆ
با نەدۆ ونە بەدەن پەی بەروای!
جە سینەش غولله جەی لاو لوشە
هارە کەرۆ مووشەدەی کێشیای
جە شەدە ئاردێ مەهاڕۆ خاص خاص
چە خاص بەر مەدۆ وەختو تەماشای
ئەگەر جە سینە مەکەرۆ ئاردی
ئاردی باوەرۆ تا وەختو بەردای
ئانە کەیلەن بێ دەمو پلەن
ئاردی مناوچۆ! باز هەم بەر نەدای
ئەر خەلە باورۆ بیاونۆ شەدەی
جە شەدە خەلە دەست کەر وەساوای
باز هەم بەو دەستوور [هیچ!] مەهاڕۆ
لارە لارەشەن جە وەختو داندای
وەختێ ونارای میزان و هاران
بۆ وە سەروکار باقیی جە ئەشیای:

کەویژەی ناویژ، هەم دانە دۆڵەی
تەیار بکەری هەم وەسەر نیای
بنو تەوەنی، مشتیلەو قەمی
[وەلا ذەکەرە لشیو نهای!]
دماو ئانانە چەقچەقەش ماچان
ئانە لازمەن مەبۆش پەی تاشای
چەقچەقەش دایم شەقێ مەشانۆ
بەزۆر مەستانۆ دانە پەی ئاسیای
نە پاسە نییەن حەق حەق مواچۆ
دایم مەکەرۆ ئەو ذیکرو خودای
بەیتەورە کارت موهەییا کەردی
هیچ نەمانۆ ئیللا ئاو ئامای
ئوستاد (سارای) ئوستادێ خاص بی
[فرید الدهر] بی نە دەور دنیای
واچی ئاساوان ئاوی هۆر بنیە
ئاوێ خاصەنە پەی تۆ جە ئوستای
ئیمام گەڵباغیی صاحێب سەخاوەت
مەعرەکە کەری ئەو چەنی ئوستای
[آسیاوکم او...!]
کەمئاو خاصە ئەر سال ئاو نەدای
بادا بگێڵۆ هەفتێ دوو هەفتە
جەو پێ لازمەن هارەی لا نیای
هارێ تێژکەردەی مەبۆ بزانی
مەبۆ بزانی وە گۆش مەبۆ دای
ئەگەر تەوەنێش سەخت و رەقەنە
دامەنە سینەش چون یەک ئەنجنای
ئەگەرتەوەنێش فرێ نەرمەنە
مەبۆ [هرشدەو!] دامانش گوای
ئەگەر [یش شلەن!] مەبۆ بزانی
مەبۆ بە تەرتیب سووکێش [وندای!]

بنێو کلاشێ جه بەینو سووکان
چەنێو ئەسکەنەی هەم سووکێش کوای
ڕاسته بکەره بە بەلەکەدا
بادا شەق نەبۆ وەختۆ چەرخنای
ئانا دیارەن هەر لا مەگیرۆ
جه واری خوانی بەره پەی ئالای
ئەگەر هەم ڕاستەن هیچ [نشیوان!]
زینهار! نمەبۆ دەستش وەنەدای
هارێ سەروزه کارت تەمامەن
خاتیمەی کارەن جه دەورو دمای
چێویەتەر ماچوو گۆش وەنەم دارە:
خاصێ و هارانیچ هەم مەبۆ زانای
هەر هارێ سوور جه هەڕدەی نەکەوت
ئانە هاریۆ خاصەن هەم خێر و خودای
ئەگەر هار سوور بی ئاردیش ناوای
پڕو پایانت مەبۆ چێش ڕمای
سنە هەزارو صەدو نەوەد بی
هەفت سالی هەنی هەم چاگەو دمای
[جه رعافنه و!] وڕاوەم کەردەن
هیچ کەس نەواچۆ پەی چێش [ژاویای]؟
هەرکەس مەفامۆ ماچۆ ئافەرین
هەرکەس نەفامۆ پەی پنە خوای!
[واو]، [سین]، [ی]، [میم] ئەرجو دارۆ
پەرێش بوانان سوورەی دوعای
ئەداو بابەشان بە ڕەحمەت شاد بۆ
ئەگەر بوانان پەرێم ئەی دوعای
هەزاران دروود هەزاران سەلام
(ز ما بر محمد علیه السلام)

تمت شد في يد الحقير الفقير فتح الله بن عبدالله سنة ١٢٣٣

## فەرهەنگۆک

### أ

ئاچووبە: ئەو دارە

ئارور: ئاخر

ئارورچی: ئەبێ منیش، چی ئەبێ منیش

ئاردشا: شای ئارد، ئاردی چاک هێنایان

ئاسیاب: ئاسیاو، ئاش

ئاودێردای: ئاودانی

ئاوچنین: ئاوبڕان

ئاوەکێ: ئاوەکەی

ئەر: ئەگەر

ئەرساڵ: ئەگەر ساڵ

ئەسکەنە: ئامرازی شت کوتان

ئەمەبۆ: دەبێ

ئەندەکێ: کەمێ

ئەویشان: ئەویان

ئوستاوانە: ئوستادانە، وەستایانە

ئیلات: ئەملات

ئیلاو: ئەملاو

### ب

باریکەن: باریکە

بپێکەش: بیاندە لە یەک

بزاندێ: بزانن

بسماریش کوای: بزمار ڕێژی کەی

بشاندا: ناوەخنی کە

بشمێ: بڕۆین

بنخانە: خانی ژێرەوە

بندینی: بدەی

بن وەردە: گرێی لە بن دراوە

بنیە: بنێ

بەسەنگ: بەکێشانە
بەعدەزان: دوای ئەوە (فارسی)
بەڵەکی: بەردێکی چەخماخی ڕەنگاوڕەنگە، شڵ و بەڵەکە
بەوار: بەهار
بەینێش: بەینی
بەیۆ: بێت
بەیدەر: خەرمان
بواچی: بڵێی
بێبەر: دەست بدا
بێ دەم و بین: بێ قسەکردن، بێ ئەوەی دەم بکەیتەوە وەرە بیبینە

**پ**

پا: پێ
پلولاش: ناوەکەی، ناو لەپەکەی
پلوتۆ: دەست و پلی تۆ
پەرێ: بۆ
پەرێشان: بۆیان
پەسەنیان: پەسەندکراوی
پەندای: پەنجە، دەست و پەنجە
پەنەش: پێی
پیرۆزە: مزەئاش. بەردی چەخماخ

**ت**

تاشاو: تاشینی
تریت: ترت، وەختێکی تر
تەڕکەرە: تەڕی بکە
تەنکەن: تەنکە
تەوەن: بەرد
تووڵی بکێشە: ئەندازەی بگرە
تێشە: تەشوێ

**چ**

چاگەولای: لەوە زیاتر، لەو نەترازێ
چەودما: لەو کاتەدا- پاشان

چووبێ: دارێ

چڕی ناوی: ناوی دەبەی، بانگی دەکەی

چەرمای: سپیی

چو: دار

چێرشان: بنەوەیان، ژێریان

چیتکرا: پێتکرا

چێش: چی

## ج

جە گرد: لە بەرد

جەو دما: لەو کاتەدا، لەوەو دوا

## خ

خامیشان: خاویان

خرتی: خڕی

خزنای: خزاندن- خزاندت

خەیلێوە: ماوەیەک، گەلێکە

خوانی: مەجالی، ماوەی

خوان: شوێنی دان، دۆلیانی ئاش

## د

دان: گەنم، جۆ، گاڵ، کزن

داندای: داندانی ئاشەکە، بەردانی بەری

درازیش: درێژیی

دەمش: دەمی

## ر

روێ: رۆژێ

رێسمان: بەن، پەت

## ز

زۆرش: زۆری

زیای: زیادە لە زمانەکەی

## ژ

ژاویای: ژاوە ژاوت کرد

### س

ساندای: هەساندانی

سەرچاخ: ئامێرێکە

سەروزە: بیخەسەری

سەرهارە: بەردی سەرەوەی بەرداشەکە

سیاوێ: رەشێ

### ش

شانەدەم: وەک دەمی شانە، دەمی وەک دەمی شانە

شلەنە: شلە

شناسای: بناسی

### ط

طەنافش پێکای: تەنافی بگرە

### ف

فرێ: زۆر

### ق

قەم: (قوم) دارێکی ئەستووری درێژە. لەسەر باری درێژیی ناوەکەی هەڵکۆڵراوە، کاتی خۆی لە باتی بۆری و لوولەی ئێستە لە چەموچۆڵ و شوێنی نشێودا، ئەمبەرەوبەر ئاوی پێ گوێزراوەتەوە.

قتب، قطب: تەوەرەی ئاش

### ک

کوورەکا: چەمچەی ئاگر گواستنەوە، ئاگرکێش

کاسۆ: بێدەنگ دەبێ

کڕنای: کڕاندت

کەردی: بکەی، کردت

کەردەنی: کردووە، کردووتە

کەوێژ: لوولەیەکی دارینە لە دۆڵیانی ئاشەوە دانەوێڵەی پێدا دەچێتە خوارەوە بۆ گەرووی بەرداشەکە.

کوای: کوتاندن

کۆ: بەردی گەورە

کۆبەند: دیواری بە بەرد کراو

کۆش: کوێی

کۆک: چاک

کێمند: جۆرە دانەوەێڵەیەکە

## گ

گرد: هەموو، بەرد

گێلانش: گەڕانی، گەڕاوەپێدا.

## ل

لانشت: ئەوەی بارێکی تەواو خەلەی بردبێ بۆ ئاش

لاودەنشت: لاتەنیشت، لابار، تایەک یان کەمێک گەنم و دانەوێڵەی بردبێ بۆ ئاش.

لارولای: لارە لاریەتی

لوای: ڕۆیشتنی

## م

مازەش: بیهێڵە

مبویش: دەیکەی

ملۆ: دەڕوا

منیچ: منیش

مەبۆ: دەبێ

مەتاوی: دەتوانی

مەسازی: دەسازێنی

مەگێلۆ: دەگەڕێ

مەلەرزۆ: دەلەرزێ

مواچانی: دەڵێی

## هـ

هاری: هارە، بەرداش

هاری پەسەنیا: تاشە بەردێک کە ئوستاد پەسەندی کردبێ

هارگێلای: بەرداش گێڕ

هەرپاسە: هەر ئاوا

هەڕ: قوڕ

هەڵمەت دای: هەڵمەت بردن، خول خواردن

هۆرش کەن: هەڵی کەنە

هۆرکنای: هەڵکەنی

**ن**

نخوردەن: خواردن

نزمای: نزمایی

نەشۆ: نەڕوا، فیکرت نەڕوا

نمەدۆ: نایەت، نایدا

نمەزانی: نازانی

نیا: دای نا، نییە

نیای: دات نا. (بێنی)

نەبەرمێ: نەبەین

نەبووی: نەبێ

نەپێکۆ: نەپێکێ، نەیپێکێ

نەکنان: نەکات

نەوەرش: لێی نەکەوێ

**و**

وادریای: بادراو

وەپاکەری: جموجۆڵی پێ بکەی

وەرچۆ: لە بەرچی

وەرو: بەری

وەرین: ئەوەڵین، پێشوو

وەسێ: بەسە

وەنەدای: لێدانی

ونارای: دات نا، ئامادەت کرد: ڕاگرتن

ونای: ئەندازەگرتن

# جارێکی تریش بنەماڵەی عیمادی

٥٧٣

بنەماڵەی عیمادی یەکێکە لەو بنەماڵە کۆن و دێرینانەی زانیاری لە کوردستاندا کە دەیان و سەدان ساڵ بێ پسان و بڕانەوە خزمەتی زانست و ڕۆشنبیرییان کردووە و کەڵەپیاویان تێدا هەڵکەوتووە و زانای کەموێنەیان پێشکێشی قافڵەی زانیاران کردووە. بەڵام وەک جاری تریش باسم کردووە بەداخەوە ناو و شوێنەواری زۆربەی ئەو پیاوە مەزنانە کوێر بووەتەوە و هەواڵێکیان نازانین.

پێشتر لە یەک دوو بۆنەدا باسی زانایانی ئەم بنەماڵە دێرینەی زانیاریی کوردم کردووە، چەند نموونە و بەڵگەی گەورەیی پیاوانی ئەم بنەماڵەم خستووەتە ڕوو[1] لە هەر دەرفەتێکی لەباردا شتێکی نوێیانم دەست بکەوێت حەز دەکەم بەسەریدا نەڕۆم، بەڵکو ورده ورده شتێک بەشتێک بکرێ.

ئەمەی لێرەدا پێشکێشی دەکەم دەقی کورتە ئیجازەیەکە کە مامۆستایەکی عیمادی زیاد لە (٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر لە مزگەوتی ئەمەویدا لە دیمەشق مامۆستا بووە و، فەقێ و مەلا و خوازیاری زانستی لە هەموو لایەکی جیهانەوە هاتوونەتە خزمەت و بە پەرۆشەوە لە کۆڕیدا ئامادە بوون و بەشانازییەوە ئیجازەیان لێ وەرگرتووە.

ئەوەتا وەک دەیخوێنینەوە ئەم مامۆستای کە ئیجازەی لە مامۆستای عیمادی وەرگرتووە لە ئەسڵدا خەڵکی مەغریب بووە و لای مامۆستا ئیبراهیمی کوڕی ناسرەدین محەمەدی کوڕی قازیی کەمالەدین محەمەدی کەسبایی عیمادی ئیجازەی وەرگرتووە.

ئەمە ئیجازەیە بۆ خوێندن و خوێندنەوە و وتنەوەی کتێبی (الأربعین النوویة)یە کە دەقەکەی بە ژمارە (١٢٨٧٣) لە کتێبخانەی (المركز الوطني للمخطوطات)دا لە بەغدا پارێزراوە.

لەم دەرفەتەدا لەمەم زیاتر لەبارەی ژیانی ئەم مامۆستا مەزنە لە دەستدا نییە. بەوە باشە نووسیویەتی کە لە ١٥ی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی ٩٥٤ی ک لەدایک بووە، دیارە ئەمەی لە نووسینی باوک و کەسوکاریەوە زانیوە.

هەروەها لە تەک ئەوەدا کە ئیجازەی بەو مامۆستا مەغریبییە داوە، ئیجازەی بە شێخ حسەینی

---

(١) بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی دووەم، چاپخانەی سالمی، بەغدا، چاپی یەکەم. ل: ٨٨ .

هەروەها بڕوانە: بایەخدانی میرانی ئامێدی بە ڕۆشنبیری لە دەڤەرەکەیاندا، دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠٦ .

شێخ عەبدونەبیی سەرپەرشتیاری مزگەوتی ئەمەوی و، شێخ محەمەدی کوڕی شێخ محەمەدی حەسکەفیش داوە.

**دەقی ئیجازەنامەکە**

**الأربعين النووية**

الحمدلله وكفى، وسلام على عباده الذين اصطفى.

وبعد: فقد قرأ علي هذا الجزء من أوله إلى آخره كاتبه الشيخ شهاب الدين أبو العباس أحمد المغربي الأصل، الدمشقي، بجامع الأموي بدمشق، قراءة ضبط وإتقان بالسند المذكور أوله المنسوب إليّ فيه مع روايتي له ولغيره من بقية مؤلفات شيخ الإسلام وقطب الانام محي الدين أبي زكريا النووي رحمه الله تعالى، من طرق عديدة غير ما تقدم، وكلها معلوم عند أهلها وسمع قراءة لذلك في مجلس واحد الشيخ حسين بن الشيخ عبدالنبي القائم بالجامع المذكور، والشيخ محمد بن الشيخ محمد الحصكفي، وأجزت المذكورين بذلك وبجميع ما يجوز لي به وعني روايته بشرطه. ومولدي ليلة سبت زاهر خامس عشر من ربيع الآخر، وذاك من سنة أربع وخمسين وتسعمائة خلت. وتم.

قال ذلك وكتبه خامس تأريخه أعلاه العبد الفقير إلى مولاه إبراهيم ابن ناصرالدين محمد بن القاضي كمال الدين محمد الكسباي العمادي. حامدا مصليا.

# مەنەری مەدرەسە و فەرمانڕەوایی بێتووش

٥٧٤

**وتەیەکی کورت:**

بە پشکنین و گەڕان بەناو دەستخەت و سەرچاوەکانی بەردەستمدا گەیشتوومەتە ئەوە کە لە بێتووشدا مەدرەسەیەک هەبووە سەرەتای بوونی دیار نییە و، سەدان ساڵ بنکەی ڕۆشنبیری و جێگەی زانای مەزن و پێگەیاندنی مەلا و فەقێیان بووە و، تا ئەم ساڵانەی دواییش نەوەکانی مامۆستایانی بێتووشی پشتاوپشت ئەو مەدرەسەیان ڕاگرتووە و، ناوی چەندان زانای گەورەی بێتووشی لە پەراوێز و کۆتایی دەستخەتەکاندا هەیە، مێژووی زۆریان نازانین.

هەروەها فەرمانڕەوایی یان میرنشینێک لە بێتووش و ناوچەی (ئالان)دا هەبووە، بەڵگەی پتر لە (١٥٠) ساڵ بوونی ئەو فەرمانڕەواییە بە پەرتەوازەیی لەملاولا هەیە.

بەشی ئەوەندە لە بەڵگەنامە و زانیاری لەبارەی (مەدرەسەی بێتووش) و (فەرمانڕەوایی بێتووش)ەوەم لەلا کۆ بووەتەوە بۆ ئەوە دەشێن بیاندەم بە گوێی مێژووی کورد و زانا و ناودارانی کورددا و، بیانخەمە بەردەستی مێژوونووسانی کورد بەڵکو لەمەولا شتێک بۆ مێژووی ئەم ناوچە بکرێ.

بابەتەکەیشم بەناوی «مەنەری مەدرەسە و فەرمانڕەوایی بێتووش»ەوە ناو نا، ئەمەیشم بۆ ئاماژە بۆ ئەو پەندە کوردییە نووسی کە دەفەرمووێ: «قەڵایش برمێ مەنەری دەمێنێ». چونکە بابەتەکەی من منە و گەڕانە بە ناو مەنەر = شوێنەواری حوجرە و کۆشک و تەلاری ئەو دوو شوێنە گەورەی ئەو ناوچەدا.

جگە لە سەرچاوە چاپەکانیش بەشێکی زانیارییەکانم ڕاستەوخۆ لە دەستخەتەکان وەرگرتووە و، بۆ ئەم بەشە ئاماژەم بۆ ژمارەی دەستخەتەکان کردووە، بۆ دەستخەتەکانی ئەو کتێبخانەی بەغدا کە پێشتر پێی دەگوترا (دار صدام للمخطوطات) دوایی (دار المخطوطات العراقية) و دواتر (المركز الوطني للمخطوطات) نیشانەی (م، و)م داناوە. بۆ ئەوقافی سلێمانیش هەندێ جار ناویم نووسیوە و ئەگەر جاریش نووسیبێتم (سلم) ئەوە هەر مەبەستم کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزیی سلێمانییە. بۆ کتێبخانەی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵیش (خ)م داناوە. ئەگەر (ع)شم دانابێ مەبەستم ئەو دەستخەتانەیە لەلای مەلا عوسمانی موفەتیشی ئەوقاف بوون و سوودم لێ وەرگرتوون.

## مەنەری مەدرەسەی بێتووش

## کتێبخانەی بێتووش

کە مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێتووشی وتوویەتی:

لەلای قازیی سەردەشت (٣٠٠) سێسەد دەستخەتی کۆنی دیوە هەموویان مۆری کتێبخانەی بێتووشیان پێوە بووە، دوور نەڕۆیشتووە و،[1] لەوانەیە دەستخەتەکانی ئەو کتێبخانە گەلێ لەو ژمارەیش زیاتر بووبن؛ چونکە ئەو مەدرەسە مەدرەسەیەکی بە تەمەن و فرە مەلا و فەقێ بووە و، پشتاوپشت کوڕی ئەو بنەماڵە - وەک بنەماڵە زانیارییەکانی تری کوردستان- زانیاری و کتێب و دەستخەتی لە باو و باپیریەوە بە میرات بۆ ماوەتەوە، کام باو و باپیر؟ ئەوانەی بەهەر لایەکدا چووبن کاتێک گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان دیاریی دەستیان دەستخەت و کتێب بووە و، هەر کاتێ فەقێیەک ویستبێتی کارێکی بە بایەخ بۆ مامۆستایەکی بێتووشی بکا مامۆستا داوای ئەوەی لێ کردووە کتێبێکی باشی بە خەتێکی جوان بۆ بنووسێتەوە.

مامۆستا مەلا مەحموودی برا گەورەی مامۆستا مەلا عەبدوڵلای بێتووشی کاتێک ماوەیەک لە (الإحساء)ی سعوودیە بووە و، دوایی گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان، چیی لە تەک خۆیدا هێناوەتەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشی لەو دوور وڵاتەوە و، بەو ڕێگە سەخت و سامناک و دوور و درێژەدا، جگە لە دەستخەت کە لەوێ بە کڕین یان بە دیاری، یان بۆ نووسینەوەی قوتابییانی خۆی بۆی.. یان ڕێگە گەلی تر، یادگار و شوێنەوارێکی ئەوتۆی دیار نییە لە تەک خۆیدا هێنابێتیەوە.

بەهۆی پەرتەوازەبوون و تێداچوونی کتێبخانەی بێتووشەوە نازانین کتێبخانەی بێتووش چی تێدا بووە و، مامۆستا مەلا مەحموودیش لە (الإحساء)وە چی لە تەک خۆیدا هێناوەتەوە، بەڵام بەڵگەی ئەوەمان لە دەستدایە کە مامۆستا مەلا مەحموود لە (مبرز)ی سەر بە (الإحساء) جێگەی ڕێزی فەقێ و قوتابییانی بووە و، بە شانازییەوە کتێبی گەورەیان بۆ نووسیوەتەوە و یەک دوو نموونەی ئەم لایەنەمان لە دەستدایە:

**یەکەمیان:** شەرحی شەمائیلی ترمذیی دانراوی مەناویی. کە لە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزیی سلێمانیدا لەنگەری گرتووە، کە فەقێیەکی لە (الإحساء)ی سعوودیە بۆی نووسیوەتەوە و، لە کۆتاییەوە نووسیویە:

«ووافق الفراغ من نسخ هذا الكتاب المسمى بالشمايل، شملنا الله تعالى بالخيرات في الغدو والأصايل آمين. وقت العصر يوم الجمعة وهو اليوم العشرون من شهر رمضان، أحد شهور سنة خمس وثمانين بعد المائة والألف هجرية نبوية، على مهاجرها أفضل الصلاة وأزكى التحية، وذلك بقلم الفقير الحقير المقرّ بالذنب والتقصير، راجي عفو ربه المنان، دخيل الله به سليمان بن هريس،

---

(١) بروانە: فهرس مخطوطات مكتبة الأوقاف المركزية في السليمانية. اعداد محمود أحمد محمد، الجزء الأول، مطبعة بغداد. ١٤٠٢هـ - ١٩٨٢م. ص: ١٥.

الإحسائي مولداً ومسكناً، برسم الأجل الأسعد الأرشد الشيخ محمود بن محمد، جعلني الله وإياه ممن عمل بسنة نبيه- صلى الله عليه وسلم- في الحياة، وأماته عليها عند الوفاة آمين. وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم أجمعين.

ئەم دەستخەتە کتێبێکی گەورەی نایابە نزیکی (٦٠٠) لاپەڕەیە. لە کتێبخانەی ناوبراودا ژمارە (٢٥١)ی دراوەتێ.

**دووەمیان:** کە بەڵگەیەکی گەورەی پەرتەوازەبوونی دەستخەتەکانی کتێبخانەی مامۆستایانی بێتووشە یەک پەڕەی کۆتاییی کتێبێکی تەفسیرە بەناوی حاشیەی (سعدي الرومي)، دیارە ئەمیش کتێبێکی گەورە بووە، بەداخەوە ئێمە تەنیا یەک لاپەڕەیمان لە دەستدایە و، ئەمەیش بەشێکە لەو لاپەڕە کە ئەمیش هەر بە خەتی هەمان نووسەرەوەیە:

«وقع الإختتام بعون المهيمن العلام، يوم الأربعاء خامس جمادي الأول، المنخرط في سلك شهور سنة أربع وأربعين وتسعماية. كملت حواشي العلامة، محقق الروم، سعدي أفندي - قدس الله سره- صبح يوم الجمعة، الخامس والعشرون من شهر ذي الحجة الحرام، أحد شهور سنة ١١٨٦ ست وثمانين ومئة وألف، من هجرته - صلى الله عليه وسلم- كتبها العبد الفقير إلى مولاه، الغني به عمن سواه، راجي عفو ربه الكريم المنان، دخيل الله بن سليمان بن هريس، الإحسائي -عفى الله عنهم بمنّه وكرمه- إنه جواد كريم. وكان نسخها بمدينة المبرز من الإحساء المحروسة، جعلها الله دار أمان، بحرمة من أنزل عليه القرآن، وذلك بامتثال الأسعد الأرشد الموفق لكل خير من الملك المعبود، الشيخ محمود - فسح الله تعالى في مدة حياته، بحرمة القرآن العظيم وآياته آمين- والحمدلله وحده وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم تسليماً».

ئەم دوو نموونەم هێنایەوە تا لە دەرگەی ئەمانەوە بچمە ناو باسی کتێبخانەی بێتووش کە سووچێکی هەواڵ و بەسەرهاتی سامناکیم لەم ڕۆژانەدا بیست، ئەو هەواڵە کە هەر چۆن لێی وردبینەوە و سەرنجی بدەین، داخ و پەژارەمان زیاد دەبێ، دەبێ هەر بەو دەردەوە دەست بەدەستدا بدەین و بە خوێنی دڵی لە چاوەوە سەرکردوو، بۆ بەری ڕەنجی سەدان ساڵەی دەیان زانای گەورەی گەلەکەمان بگرین، کە کەمتەرخەمیکردنی ئێمە لە عاستیاندا بە دەردێکی بردوون، مرۆڤی خاوەن ویژدان و هەست ناتوانێ گوێ لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیان بگرێت.

جا با پێکەوە یەکێک لەو بەسەرهاتە خەمئاوەر و جەرگبڕانە بخوێنینەوە، کە بێگومان دەیان و دەیان کارەساتی لەو بابەتە هەن، دەکرێ کۆ بکرێنەوە و ناوی «ڕەنج سووتاویی مامۆستایانی دێرینی کورد»یان لێ بنرێ.

برای خۆشەویستم مامۆستا عوسمانی موفەتیش لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی سلێمانیی دەورێکی باشی هەیە لە دۆزینەوە و کۆکردنەوەی دەستخەت و شوێنەواری مامۆستایانی کورددا، تا ئێستە گەلێ شوێنەواری لە ئاوارەچوون و ئاودیوبوون ڕزگار کردووە و، بەهۆی ئەوەوە گەیشتوونەتە شوێنانێک ئۆقرەی تێدا بگرن و مەترسیی لەناوچوونیان و هەڕەشەی دەستێوەردانیان کەمتربێ تێیاندا.

مامۆستا عوسمان - ماڵی ئاوابێت- لە دڵسۆزیی خۆیەوە و لەوەوە کە گومانی دڵسۆزیی بۆ شوێنەواری مامۆستایانی کورد بە من دەبات. هەرچەند شوێنەوارگەلێ دەست بخات پێش ئەوەی هیچیان دەربارە بکا، یان بۆ شوێنێکیان بەرێت، تێکڕایان پێشانی من دەدات و، منیش بۆ کاری خۆم سوودیان لێ وەردەگرم و، لە نووسینەکانیشدا لەبارەیان ناوی مامۆستا عوسمان وەک سەرچاوەی سەرەکیی باسەکە دێنم.

لەم ماوەدا هەواڵی ئەوەی پێ دام کە چەند دەستخەتێکی دەست خستووە و ماڵی ئاوابێت - وەک پێشتر وای کردووە- دەستخەتەکانی بۆ هێنام، دەستخەتەکان نیشانەی گەورەیی کتێبخانەیەکیان پێوە دیاربوو، کە ئەمانە پاشماوەی ئەو کتێبخانەیە بن. لە کاتی پرسیار و گێڕانەوەی باسی دەستخستنی شوێنەوارەکاندا مامۆستا عوسمان یەک دوو قسەی جێگەی سەرنج و مایەی داخیش لە هەمان کاتدای کرد.

یەکێک لەو قسانە ئەوە بوو: ئەم دەستخەتانەی لە شوێنێک لە دەوروبەری سەردەشت دەستکەوتووە و، خاوەنی دەستخەتەکان پێی وتووە: ئەمە پاشماوەی دەستخەتگەلێکی زۆرن کە کابرایەکی فارس هاتووە بەشی چاک و زۆریانی بردووە.

قسەی دووەمی ئەوە بوو: خاوەنی دەستخەتەکان ئەم دەستخەتانەی ترنجاندووەتە ناو کەنوە تەنەکەیەک و، سەرەکەی لەحیم کردووە، کە لە تەک مامۆستا عوسمان رێککەوتوون دەستخەتەکانی بداتێ، ماوەی ئەوەی نەداوە سەری تەنەکەکە هەڵتەکێنێ و بە تەواویی دەمەکەی بکاتەوە، تەنیا بەشێکی کەمی کەنوەکەی شکاندووە و، ئەو دەستخەتە نایابانەی پەڕە پەڕە دەرکێشاوەتە دەرەوە و، ئەو هەموو کتێبە گەورە و نایابەی هەڵوەشاندووە و، شیرازەیانی پساندووە و، پەرپووت و شپرزەی کردوون! کە هێنانی بۆ لای من و باسەکەی بۆ گێڕامەوە بە کوڵی دڵ بۆ ئەم کارەساتە گەورە و سامناکە گریام کە بەسەر ئەو کتێبخانەدا هاتووە.

دەبێ ئەو کتێبخانە هی کێ بووبێت؟

ناتوانین بڵێین ئەو کتێبخانە تەنیا کتێبخانەی یەک زانا، یان تەنیا مامۆستا مەلا مەحموود بووە، بەڵکو دەکرێ بڵێین: ئەم کتێبخانە تا سەردەمی تێداچوونی، خەرمانی بە پیت و بەرەکەتی ئەو بنەماڵە ماوە و بووە، هەر کەس لە عاستی خۆیەوە شارای گەورەی خستووەتە سەر و، تەمەنێکی پان و بەرینی بووە و، زانایانی ئەوەندە زۆر بوون لە ژمارە نایەن و، ڕەنگە نەتوانین تەنیا ناوەکانیشیان تۆمار بکەین. ئەوەتا لە شوێنێکدا مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای سێیەم ناوی زنجیرەیەکی خۆیان دەنووسێ رشتەکەیان دەگاتە نۆ کەس، کە لە ناوەکانیانەوە دیارە هەموویان زانا و خوێندەوار بوون و، زۆر نزیکە باو و باپیرانی پێشووتریشیان کە ئەم ناوی نەهێناون هەموویان - وەک ئەمان- مەلا و مەلا چاک بووبن.

لە باسی کتێبخانەی بێتووشدا گەلێ شتی شاراوە و باس نەزانراو هەیە، لەوانەیە هەندێکیان هەر نەزانرێن، هەندێکیشیان دەکرێ بە بەڵگە و خوێندنەوەی پەڕاوێز و پارچە - پارچە کاغەزی ئەملاولا سەرە دەزووی بۆ بدۆزرێتەوە و، هەندێ ئەنجامی باشی بۆ بەدەست بێ.

له پەنای یەکێک لە دەستخەتەکانی مامۆستا مەلا مەحموودا دوو دێڕ هەیە هەندێک شت دەدەن بەدەستەوە و گەلێ پرسیاری نوێیش قوت دەکەنەوە. با لە پێشدا دوو دێڕەکە بخوێنینەوە:

«من بعض الكتب الذي أخذَت من الفقير إلى الله أحمد بن شيخ محمود الكردي، أخِذَت منه في دجلة. وأُخَاذُها طائفة الخزاعل، جعلهم الله كالظل الزائل! ثم أستردها المكرّم محمود پاشا، رزقه فعل الخيرات».

واتە: ئەم دەستخەتە لە هەندێک لەو دەستخەتانەیە کە هۆزی خەزاعیل - خوا بیانکا بە سێبەری لاچوو (بڵقی سەر ئاو)!- لە بێچارە ئەحمەدی کوڕی شێخ مەحموودیان سەند لە چۆمی دیجلەدا و، دوایی بەڕێز مەحموود پاشا (دیارە بابانە) بۆی سەندمەوە، خوا بیخاتە سەر ڕێگەی کاری چاک.

**یەکەم:** ئەم کارەساتە کەی ڕووی داوە؟ من - بە گومانەوە- دەڵێم: دوور نییە کاتێ مامۆستا مەلا مەحموود لە ئیحساء گەڕاوەتەوە بە تەمای ئەوە نەبووە ئیتر نەگەڕێتەوە بۆ ئیحساء و، بە سەڵتیی هاتووەتەوە و، کتێب و ماڵ و هەرچیی هەبووە لەوێ بەجێی هێشتووە، دوایی کە دەستبەرداری گەڕانەوەی ئیحساء بووە کتێبەکانی لەوێ ماونەتەوە و، هێنانەوەی کتێبخانەیەکیش لەو سەردەمەدا- لە هەر حەجم و قەوارەیەکدا بوبێت- لە ئیحساوە بۆ بێتووش کارێکی ئاسان نەبووە.

ئەمە لە لایەکەوە، لەولایشەوە کە مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای برای مامۆستا مەلا مەحموود گەڕاوەتەوە بۆ ئیحساء، بێگومان، سەرپەرشتیی و پاراستنی ئەو کتێبانەی گرتووەتە ئەستۆی خۆی. جا من وای بۆ دەچم ئەو شتانە هەروا مابنەوە تا مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا لەوێ لە ئاوارەییدا کۆچی دوایی کردووە، دوای ئەوە مامۆستا مەلا ئەحمەدی کوڕی مامۆستا مەلا مەحموود چووبێت بە سەردەمی ماڵ و شوێنەواری مامی و کتێبخانەکەی باوکییەوە کە لەوێ بەجێ ماوە، ئەمەیش لە سەردەمی فەرمانڕەواییی مەحموود پاشای بابان - لە هەر کام جاری فەرمانڕەوایی دابووبێت- دا بووە کە دەکەوێتە دوای کۆچی دوایی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای بێتووشییەوە.

بەڵگەی پتەوکردنی ئەم بۆچوونەیش لەوەدا دەبینم کە دەستخەتەکانی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا - کە دیارە تا کۆتاییی ژیانی لە دەستی خۆیدا بوون- لە کوردستاندا بوون و، بەزۆریی لە بێتووش و دواتریش لە سلێمانی پارێزراون.

**دووەم:** کە مامۆستا مەلا ئەحمەد لە نووسینەکەیدا دەڵێت: ئەمە لە هەندێک لەو دەستخەتانەیە (کتێبانەیە) گومان بۆ ئەوە دەچێ ئەو کتێبانەی لە مامۆستا مەلا ئەحمەد زەوت کراون زۆر بووبن و، دیارە ماوەیەکیشی بەسەردا تێ پەڕیوە تا مامۆستا مەلا ئەحمەد گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان و، پەنای بردووەتە بەر مەحموود پاشا و، ئەویش کاری بۆ دەستخستنەوەی کتێبەکان کردووە و، لەوانەیە لەو ماوەدا زۆر لەو کتێبانە تێدا چووبن.

هەروەها لەم بنەماڵەدا - وەک لەمەولا ناوی چەند زاتیان دەبەین- چەند قازیی و موفتییان تێدا هەڵکەوتووە، ئەمانەیش بە زۆری وەک چۆن بینیمان مامۆستا مەلا مەحموود لەو ڕێگە دوور و درێژەی سعوودیەوە دەستخەتی گەیاندبووە بێتووش - بێگومان- لە هەر لایەک بووبن و هاتبنەوە، هیوایان کۆکردنەوەی کتێب و دەوڵەمەندکردنی خەرمانی (کتێبخانەی بێتووش) بووە، دیارە ئەم

کتێبخانە ماوەیەکی دوور و درێژ لە گەشەکردندا بووە، تا - نازانین کەی بووە- وردە وردە کەوتووەتە کزبوون و، ئەستێرەی ئاوا بووە و کەوتووەتە بەر چەپۆکی زەمانە و، ئەو کارەساتەی بەسەر هاتووە کە ناتوانین بگەین بە سووچێکی هەواڵە سامناکەکەیدا.

ئەوەندەی من لێرەدا پێم دەکرێت و لە دەستم دێت بیکەم ئەوەیە هەواڵی تێداچوونی ئەو کتێبخانە و، لەناوچوونی دەستخەتەکانی و، پەرتەوازەبوونی بەشێکی بۆ هەندەران و ئەملاولا و، لەدەستدابوونی نیشانە و شوێنەواری ئەو کارەساتە تۆمار بکەم و، لە پەنای ئەو پاشماوە کەمەیشەوە کە توانیومە ببینم ناو و سەردەمی ژیان و شوێنەواری چەند کەسێک لەو مامۆستایانە بخەمە روو، بەڵکو لەمەولایش شتگەلی تر بدۆزینەوە و بەسەرهات و هەواڵی زیاتریان بزانین.

بەو پێیەی بەپێی تەمەن ئێمە هەواڵی دەزانین و مامۆستا مەلا مەحموود یەکەم پیاوی ئەم بنەماڵەیە کە شتێک لە ژیانی و شوێنەواریم دەست خستووە، لە ژیانی ئەم مامۆستا بەرێزەوە دەست پێ دەکەم:

**مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشی:**

پێش ئەم نووسینە کورتە و نووسینەکانی تریشم، داوای لێبووردن لە خوێنەری ئازیز دەکەم لەبارەی دووپاتکردنەوەی هەندێک مەبەست و باس کە بە بیرخستنەوەی پێویستیان دەزانم بۆ گەلێ کات و جێگە. لێرەدا یەکێک لەو بیرخستنەوانە دێتە پێش و، بێ ئەوە باسەکە ئەو تام و چێژەی نابێ.

گەلێ جار نووسیومە: بەختەوەرترین مامۆستای کورد لە رووی ئەوەوە لە دنیادا ناسرابێت و ناوی کەوتبێتە ناو ناوان، ئەو مامۆستا بووە کە بۆی هەڵکەوتبێ لە کوردستان دەرچووبێ و گەیشتبێتە یەکێک لە شارە گەورە یان دیارەکانی دنیا، ئیتر ئەوە بەس بووە بۆ ئەو مامۆستا کە ناوی دەربکەوێ و جێگەی خۆی بگرێت و، مایەی سوودگەیاندنیش بێت بە دەوروبەری و جێگەی دوورتریش لە وڵاتانی دنیا و، دوای خۆیشی ناوی زیندە و دیار لە ریزی مامۆستا ناودارەکانی گەلانی دنیادا بپارێزرێ. ئەمە چەندە بۆ مامۆستایان راست و دروستە ئەوەندە و زیاتریش بۆ دانراو و شوێنەواری مامۆستایانمان رەوا و شیاوی گوتن و نووسینە.

مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشی برای مامۆستای زانا و ناوداری کورد مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای بێتووشییە. وەک دەگێڕنەوە پلەی مامۆستا مەلا مەحموود لە پلەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا کەمتر نەبووە ئەگەر زیاتر نەبووبێ.

یەکێک لەو باسانەی دەماودەم دەگێڕرێتەوە لەبارەی بلیمەتیی هەردووکیان، ئەوەیە کە جووتە برا پێکەوە رێگەی بەسرە و ئیحسا لە وڵاتی عەرەبستانی سعوودیی دەگرنە بەر، لە رێگەدا پارەیان لێ دەبڕێ و خەرجیی رێگەیان پێ نامێنێ، چەند کتێبێکیان پێ دەبێت، لەوانە توحفە و قاموس، دەڵێن:

مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا قاموسەکە لەبەر دەکات و، مامۆستا مەلا مەحموودیش توحفەکە و،

دوایی دەیانفرۆشن و بە و پارەیە سەفەرەکە دەکەن[1]. هەر لەمەیشەوە بووە کە هەردووکیان لە ئیحسا بوون مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا مەتەڵێکی فیقهیی دروست کردووە و، ناردوویەتی بۆ مامۆستا مەلا مەحموود و داوای وەڵامی لێ کردووە و مەتەڵەکەیش بەم شێوەیە:

«ومما وقع لي- وأنا الفقير إلى الله عبدالله- مع شيخي وأخي الشيخ محمود سنة ١١٧٧هـ في هجرة البحرين، إنني عملت بيتاً وأرسلته إليه أسأله إعرابه، وصورته:

كم مصل صائم من غير ذوق رام وصلا

قلت لما قال لي: هل كل من صام وصلاّ؟

بينوا لنا- أدامكم الله للتبيين، ويبلغكم إلى ذروة سنام اليقين- مقول (قلت) المذكور في البيت. وقاكم الله قول ليت، ولا أفجعكم بنعي ميت، وأقنعنا الله وإياكم بالقِصَر والزيت. فوافق وصول السؤال إليه، وإلقاء الرسول الألوكة عليه، وقت اشتغاله بالتدريس، وإفادة الناس بالعلم النفيس، فبعد أن نظر سويعة، في تلك الرقيعة، كتب إليّ فيها كالمنصفين، ولا المجادلين المتعسفين: (مقول قلت لا أعرفه في هذا الحين، وعسى الله أن يأتي باليقين) فلما بلغني شريف جوابه، وفهمت فحوى خطابه، رددت إليه ما كتبه التذاذا بالخطاب الواقع، بعد أن أعربت قوله: (إعرِفهُ) الذي هو مضارع، إعراب فعل الأمر، ففهم بتلك الإشارة الخفية حقيقة الأمر، واتضح أنّ (لا) التي في عجز البيت هي مقول القول، وسلمت المسألة من العول، بحول من له القوة والطول، وحمل ذلك الإعراب على غاية الإغراب، وأغراه مغرى العجب، بالاستنان في سنن الطرب... »[2].

ئەم دەقەم وەک خۆی نووسی تا بە وەرگێڕان تام و چێژەکەی نەبزرکێت و، مامۆستایان کامی بکەن. جا لەم دەقەوە چەند شت وەردەگیرێ:

**یەکەم:** مامۆستا مەلا مەحموود برا و برا گەورەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا بووە.

**دووەم:** وەک مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا و شان بەشانی ئەو لە ئیحسا مەدرەسەی بووە و جێگەی ڕێز بووە و دەرسی گوتووەتەوە.

**سێیەم:** مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا پێی دەڵێت: شێخم و مامۆستام.

**چوارەم:** مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا نزیکی پێنج ساڵ لە ئیحسا ماوەتەوە.

جا ئەم مامۆستا کە خاوەنی ئەو هەموو پلە و ڕێز و زانیارییە بووە و دیویەتی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای براچووکی ئەو هەموو کتێب و شیعر و ئەدەبەی هەبووە.. دەبێ ئەمیش هەستی نەبزوابێ لاسایی برا بچووکی خۆی بکاتەوە؟ گومان نابرێت. بەتایبەتی کە – وەک لەمەولا باسی دەکەین- دانراویشی بووبێت. ئەی هۆی چییە ئەم مامۆستا وا نەناسراو و بێ ناو و نیشان سەری

---

(١) کە دەڵێن ئەم دوو کتێبەیان لەبەر کردووە، مەبەست ئەوە نییە دانیشتبن و کەلیمە – کەلیمە و دێر بەدێر لەبەریان کردبن. بەڵکو خۆیان پێشتر ئاگەداریی تەواویان لە ناوەڕۆکیان بووە و، وەک لەبەریان بووبێ وا بووە، کە پێویستیان بە فرۆشتنیان بووە چاوێکیان پێدا گێڕاون و، دوایی فرۆشتوونیان.

(٢) بڕوانە: البيتوشي، دانراوی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ، مطبعة المعارف، بغداد، ١٣٧٧هـ – ١٩٥٧م ل: ٢٦.

ناوەتەوە؟ هەر ئەو دەردەیە کە باسی دەکەین و هەموو جارێ دەیڵێینەوە، لە کوردستاندا مانەوەی و، بایەخ نەدانی رۆشنبیرانی کورد بە مامۆستا و زانایانی خۆمان، ئەمیشی بردووەتە ریزی ئەو هەموو زانایەی کە ناو و شوێنەواریان کوێر بووەتەوە.

خۆشبەختانە دوو نامیلکەی بچکۆلەی ئەم مامۆستەم دۆزیوەتەوە کە لە هیچ شوێنێکدا ناویان نەهاتووە و، کەس باسی نەکردوون، لێرەدا لە رێگەی ئەو دوو نامیلکەوە ناوی ئەمیش دەخەینە ناو ناوی زانایان و لە مێژووی زانایاندا جێگەی - با شیاویشی نەبێت- بۆ دادەنێین.

ئەم دوو نامیلکە لە تەک دانراوی تری مامۆستایانماندا گەیشتوونەتە (م، و) و لەوێ لەنگەریان گرتووە.

**یەکەمیان:** نامیلکەکە لە زانیاریی نەحودا جیاوازیی نێوان (فعل) و (اسم فاعل) دەردەخات، نامیلکەکە دوو لاپەڕەیە. سەرەتاکەی ئاوایە:

«هذا فرق بين اسم فاعل والفعل. من كلام الفاضل العالم البيتوشي ملا محمود رحمه لله. بسم الله الرحمن الرحيم الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيد الأولين والآخرين، وعلى آله وأصحابه بآدابه المتأدبين.

أما بعد: فأقول: إعلم أن الفرق بين أسم فاعل والفعل حيث قالوا... ».

کۆتاییەکەی:

«... وبسبب عدم مشابهة الفعل بالمفرد المذكور صار الفعل مع ما هو مغاير له جملة لا مفرداً، هذا الفرق بينهما استعمالي لا وضعي تأمل. تم وبالخير عم، الكاتب حسين الخواهرزاد. رەببی بدەی زاد».

ئەم نامیلکە بەشێکە لە دەستخەتێک بە ژمارە (١٩٧٨٩) لە (م، و)دا پارێزراوە.

ئەم دەستخەتە وەک لە سەرەوە نووسیم مامۆستا مەلا حسەینی خواهەرزاد نووسیویەتییەوە. بەپێی دانراوێکی تر کە هەر لەم دەستخەتەدایە مامۆستا مەلا حسەین لە گوندی تورجان لە خزمەتی مامۆستا مەلا محەمەد حەسەنی کوڕی مامۆستا مەلا عەلی قزڵجیدا ساڵی ١٣٠٠ نووسیویەتییەوە.

لەو دەستخەتەیش وەردەگیرێ کە مامۆستا مەلا حسەین خەڵکی گوندی زینوەیە کە (زینوە) گوندێکە لە ناوچەی سەردەشت.

**نامیلکەی دووەم:**

نامیلکەیەکە لە شەرعدا باسی ئەندازە و ژمارەی رکاعەتەکانی تەراویح دەکات.

ئەم نامیلکە بەشێکە لە دەستخەتی ژمارە (٤٣٣٦١ م، و) و نامیلکەی ژمارە (١٩)یە لەو نامیلکانەی لە دەستخەتەکەدان. لاپەڕە ١٠١ و ١٠٢ی دەستخەتەکەی گرتووەتەوە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

«بسم الله الرحمن الرحيم الحمد لله الذي بيّن الفروض والسنن، والصلاة والسلام على من سلك أكمل سنن. وعلى آله وأصحابه الذين لم يميلوا إلى ترويح إلا تراويح في الدين...»

كۆتاییەکەشی ئاوایە:

«ولا يكفر جاحد المجمع عليه من غير الدين كوجود بغداد. الحمدلله على ظهور الصواب. والصلاة والسلام على خير من أوتي الكتاب. استخرجه واستنبطه ونقله الفقير إلى الله الغني الصمد، خادم طلبة العلم محمود البيتوشي بن محمد. كتبه أقل الأنام إبن الإمام، واغفر اللهم لهم بحرمة سيد الأنام آمين يا رب العالمين».(١)

ئێمە ئەم دەستخەتەمان ناونا بەدەستخەتی (إبن الإمام) و ئەم مامۆستا ساڵی ١٢٩٢ک ئەم دەستخەتەی نووسیوەتەوە و، دەستخەتەکەی پڕە لە نامیلکە و دانراو و فەتوای مامۆستایانی کورد و دەستخەتەکە تێکڕا ١٢٠ لاپەڕەیە.

تا ئێستە نازانرێ مامۆستا مەلا مەحموود کەی کۆچی دوایی کردووە. ئەوەندە زانراوە تا ساڵی ١١٧٧ک لە ئیحسا بووە و دوای ئەوە لەگەڵ مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای برایدا گەڕاوەتەوە بۆ بێتووش و لەوێ ماوەتەوە تا کۆچی دوایی کردووە.

ئەوەندەی دەخەینە سەر کە مامۆستا مەلا مەحموود تا ساڵی ١١٩١ لە ژیاندا بووە و، لەو ساڵەدا وزەی لەش و توانای چاو و هەستەکانی لە جێگەی خۆیاندا بوون و، وەک لە دەستخەتی ژمارە (٤٠٣) دایە مامۆستا مەلا مەحموود و مەلا ئەحمەدی کوڕی پێکەوە ئەو کتێبەیان موقابەلە کردووە.

جگە لەمانەیش لە ڕێگەی فەقێیەکی مامۆستا مەلا مەحموودەوە شتێکی تر لە ژیانی دەدۆزینەوە:

مەلا عەبدوڵڵای ماویلی فەقێی مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشی:

**قوتابیانی مامۆستا مەلا مەحموود:**

گەلێ جار باسی ئەوەم کردووە کە بەداخەوە مامۆستایانی کورد هیچ بایەخێکیان بەوە نەداوە چەند فەقێیان بووە، ئیجازەیان بەچەند کەس داوە، لە چەند مەدرەسە دەرسیان گوتووەتەوە، ئەمەیش ئەڵقەگەلێکی زێڕینی لە ژیانی مامۆستایان و حوجرە و مەدرەسەکانیاندا ون کردووە.

مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشی، ئەو زانا مەزنە کە وێنەی لە چەرخی خۆیدا کەم بووە، کێ دەزانێ چەند فەقێ لە خزمەتیدا خوێندوویەتی؟ ئیجازەی بەچەند موستەعیدی ئاخر مادە و مەلا داوە؟ ئەمە وەک بۆ ئەم مامۆستا پرسیاری بێ وەڵامە، بۆ بەشی هەرە زۆری - ئەگەر نەڵێم سەرجەمی- مامۆستایانمان هەر وایە.

خۆشبەختانە مامۆستا (عبدالرقیب یوسف) مامۆستایەکی بەڕێزی دۆزیوەتەوە کە فەقێی مامۆستا مەلا مەحموود بووە، لە ڕێی ئەم فەقێوە چەند شتێکی پڕ بایەخمان دەست دەکەوێ:

(١) ئەم نامیلکەم دا بە مامۆستا ئومێد نەجمەدین جەمیل موفتی و ئەویش بە لێکۆڵینەوەوە بڵاوی کردەوە، بڕوانە: رسالة في بيان عدد ركعات التراويح للشيخ محمود البيتوشي، دراسة وتحقيق اميد نجم الدين جميل. گۆڤاری زانکۆی (صلاح الدين) ژمارە (٣٠) ٢٠٠٧ .

**یەکەم:** مامۆستا مەلا مەحموود ساڵی ١٢٠٧ لە ژیاندا بووە و مامۆستا و (مدرس) بووە.

**دووەم:** ئەم فەقێ ناوی عەبدوڵڵای کوڕی مەحموودی کوڕی عەبدوڵڵای ماویلی بووە، ماویل گوندێک بووە لە ناوچەی رەواندز.

**سێیەم:** ئەم مامۆستا شەرحی ئەلفیەی ناسراو بە (البهجة المرضية)ی لای مامۆستا مەلا مەحموود خوێندووە و تەحشیەی کردووە و، دوای لێبوونەوەی لە نووسینەوەی کتێبەکە باسی نووسینەوەی کتێبەکە و پلەی مامۆستا مەلا مەحموودی بە شیعری عەرەبیی نووسیوە، ئەوەی پێوەندیی بە مامۆستا مەلا مەحموودەوە هەیە لە خەتی مامۆستا عەبدوڕەقیبەوە دەگوێزمەوە ئێرە:

زينت الحـواشي بالتنقيش
في القرية المحمية البيتوشي
من عند من باح ولاح في الورى
وصار طار صيته فوق الثرى
من لبِس الوقار والسكينة
وأيقن المسائل الرصينة
من حار من أسلوبه الأفهام
وانكسرت في وصفه الأقلام
وكشف القناع والستر على
وجه ظلام الجهل والعلم جلا
ويخرج المعاني من الفاظ
ولو أشار فيها باللحاظ
للمشكلات السيف في الفرند
بل مغنطيسها وسبق هندي
وعلم روض زهت أزهاره
وأرسلت لريّها أنهاره
وفيه ما تشتهى له الأنفس
فليسق من سلافه الأكؤُس
لا زال يعلو فضله بين الورى
يموج مثل لجج بحر جرى
أحمد من صيره نحريرا
أشكر من جعله شهيرا
ها هو بحر وافر تمام

ولا تحـــــصي ثـنـاءه الانـام

ومـــا لهـ ياخلّ- من مـــثـــيل

وفــاق الخلق طرا- ياخليلي-

فـــــإنـه من عـنـده نـيل المنـى

مـع الســرور والنشـــاط والهنا

وهو الذي فــاق على الأغــيــار

بـالعـلـم والـصــــلاح، والأبـرار

لا سـيـمـا الـفـصـاحـة والبـلاغـة

مــا مـثله في المصــر والمراغــة

كـذاك في الشـام وفي شـيـراز

كــأنـه من أعــرب الحــجــار

بل عـــجـــز الكاتب واليـــراع

من كــتــبـــه، واليـــد والذراع

لـهـمّ هـيـــــأ له فـي الجـنـان

قـصـراً مـرصـعـاً من المرجـان

ولـؤلـؤ فــــيــــروزج اللآلـي

مـثل الذكـا يضـيء بالليـالي

يطيب منه المسك والعــبــيــر

من فـرشـه اسـتـخشن الحـرير

أسـود من بيــاضـه الكافــور

ويضـرب الدفـوف فـيـه الحـور

واجــعل له في الدنيـا مـا يريد

واجـعل له خـيـراً ومـا يفـيـد

دوای چەند بەیتێک مێژووی تەواوکردنی کتێبەکەی دەنووسێ کە ئەوە مەبەستی سەرەکیی ئێمەیە لێرەدا:

وجـف من مــــداده اليــــراع

يوم الخـمـيس انفطم الرضــاع

بعد ارتفاع الشمس قبل الهاجرة

وأطـلـب الـلـه ثـواب الآخـــــرة

في آخـر شـهـر الشـريف رمـضـا

ن زاده الإله قــــدراً ومــــضــــاً

من هجــرة النبي خــيــر الإلْف

ألف وســبع مع خُـمس الألْفِ(١)

١٢٠٧

واته مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشی ساڵی ١٢٠٧ی کۆچی لە گوندی بێتووش مامۆستا بووە و، فەقێ و موستەعیدی وەک مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای ماویلیی زانا و خوێندەوار لە خزمەتیدا بوون.

هەر لەسەر پشکنین و گەڕانم بەدوای شوێنەواری مامۆستایانی ئەم بنەماڵەدا دەڕۆم و هیوابڕاو نیم و، ئومێدی ئەوەم هەیە لەم شارۆدا بەرهەمگەلێ کۆبکەمەوە خەرمانی مێژووی زانایانی بێتووش دەوڵەمەند بکەنەوە.

لە بەری ئەم شارۆدا و لەو شتانەی کە پێشتر پەیی پێ نەبراوە سووچێکی ژیانی کوڕێکی مامۆستا مەلا مەحموودە لە تەک سووچێکی نادیار و نەزانراوی بەسەرهاتی باوکیدا.

خوالێخۆشبوو مامۆستای خاڵ کە لای بەلای بەسەرهاتی مامۆستا مەلا مەحموود و کۆچی بۆ ئیحسادا کردووەتەوە، ڕێگەی لە گەلێ لە هەواڵی ئەو کۆچە نەکەوتووە، یەکێکیان خێزان و خانەوادەی بووە لە (الإحساء). لە پەنای یەک دوو نووسینی مامۆستا مەلا ئەحمەدی کوڕی مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشیدا هەندێک زانیاریی بەسوود دەبینینەوە لەوانە:

١- مامۆستا مەلا مەحموود لە (الإحساء) خێزان و خانەوادەی بووە، بڕوایش ناکرێت ژن و خێزانی لە بێتووشەوە بۆ ئەوێ بردبێ. بەڵام ئاخۆ کە چووە بۆ ئیحساء لێرە خێزاندار بووە؟ ئەمەیش نازانین. بەڵام ئەوە زانراوە کە لە ئیحساوە گەڕاوەتەوە بۆ بێتووش لێرە جارێکی تر خێزانی پێکەوە ناوە و، لەم ڕووەوە مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێژوێ بۆی نووسیم:

کە ساڵی ١١٨٩ مەلا مەحموود و مەلا عەبدوڵڵای برای لە ئیحساوە دەگەڕێنەوە بۆ کوردستان، حاکمی بێتووش دەزانێ جووتە برا بەتەمای گەڕانەوەن بۆ ئیحسا؛ چونکە لەوێ قوتابخانەی گەورە و خێزان و جێگەی باش و ڕێزی زۆریان هەبووە، بۆیە دەڵێ: ئەوا مەلا عەبدوڵڵامان لە کیس چوو با کارێ بکەین مەلا مەحموودیشمان لە کیس نەچێ. حاکم کوێخایەکی زیرەکی دەبێت، دەڵێ: ئەگەر میر بفەرموێت من کارێکی وا دەکەم مەلا مەحموود نەڕواتەوە، میریش دەڵێ: لە قسەت دەرناچم. کوێخا دەڵێ: قوربان ماوەیەکی زۆرە براکەت بە ڕەحمەتی خوا شاد بووە و، برازێت ئافرەتێکی جوان و شۆخ و هەڵکەوتووە، بیدە بە مەلا مەحموود، بەهۆی ئەوەوە دڵ دادەهێنێتەوە بە بێتووشەوە و دانکەنی ئیحسا دەبێ. میر دەڵێ: تەگبیرەکەت پەسندە، بەڵام لەوانەیە مامۆستا بێوەژنی نەوێ، کوێخا دەڵێ:

قوربان من تەگبیری دەکەم.

---

(١) بڕوانە: أعلام الكرد، دانراوی عبدالرقيب يوسف (دەستخەت) ژمارەی تەرجەمە (١٠٧٤).

کوێخا دەچێ بۆ خزمەتی مەلا مەحموود و عەرزی دەکات: میر قەراری داوە نەهێڵێ جەنابت بگەڕێیتەوە بۆ ئیحساء. ئەگەر داوای شتی وای لێ کردیت بڵێ: براژنەکەتم بدەیتێ ناچمەوە ئەویش ئەوە ناکات؛ چونکە خۆی بە هیوایەتی. کە ماموستا دێتە سەر گەڕانەوە حاکم عەرزی دەکات: جەنابت نابێ بڕۆیتەوە، ئەویش ئەفەرمووێ: براژنەکەتم بدەیتێ ناچمەوە. حاکمیش دەڵێ: پێشکێشت بێت. کوێخا لە جیاتی ماموستا مەلا مەحموود هەڵدەستێ دەستی میر ماچ دەکات و، بە شایەتیی ماموستا مەلا عەبدوڵڵا لێی مارە دەکات و، ماموستا مەلا مەحموود لە بێتووش دەمێنێتەوە و، ماموستا مەلا عەبدوڵڵا دەگەڕێتەوە بۆ ئیحسا. ماموستا مەلا مەحموود ماموستا و مودەڕیسی گوندی بێتووش دەبێ تا کۆچی دوایی دەکات و لەوێ بەخاک دەسپێررێت و، گۆڕی پیرۆزی دیارە و زیارەتگای موسڵمانانە.(١)

**خانەوادەی مەلا مەحموودی بێتووشی لە (الإحساء):**

لە هەندێک لە شوێنەوارەوە کە لە دەستدان، ئاشکرا دیارە کە ماموستا مەلا مەحموود لە ئیحساء ژنی هێناوە و منداڵی لێی بووە، بەڵام نازانرێ کەی ژنی هێناوە، چەند منداڵی لێی بووە، دواتر ئەو خێزانە چییان بەسەر هاتووە.

**ماموستا مەلا ئەحمەدی بێتووشی:**

ئەوەندە روونە کە ماموستا مەلا مەحموود کوڕێکی لەو خێزانە ئیحسائییەی بووە، ئەو کوڕە ناوی ئەحمەد بووە، بووە بە خوێندەوارێکی باش و مەلا چاک و لەوانەیە جێگەی باوکی گرتبێتەوە.

ئەم ماموستا خۆی دەنووسێ کە لە (الإحساء) لەدایک بووە، وەک لە دەستخەتی (٤٠٣)ی کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزیی سلێمانیدایە، ئەم دەستخەتە ماموستا مەلا ئەحمەد ساڵی ١١٩٩ک لەگەڵ باوکیدا بەیەکەوە موقابەلەیان کردووە، دەستخەتەکە کە لە (الحدیث) دایە ساڵی ١١٨٤ ئەحمەدی کوڕی عیسای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ضاحیی نووسیویەتییەوە، دوور نییە لە ئیحساء نووسیبێتییەوە.

دەستخەتەکانی (٢٧٣) و (١٨٧)یش بەرگەکانی یەک و دووی (الکاشف عن حقائق السنن في شرح المصابیح)ی (بەغەویی)ن، کە ساڵی ١١٩٨ نووسیونییەوە و بەراوردیشی کردوون.

ماموستا مەلا ئەحمەد خۆی دەنووسێ کە لە (الإحساء) لەدایک بووە، بەڵام مێژووی لەدایکبوونەکەی دیاری ناکات.

ئەوەندە زانراوە ماموستا مەلا مەحموود ساڵی ١١٧٧ لە ئیحساء ماموستا بووە و قوتابخانەی هەبووە، جا دەبێ ئەحمەدی کوڕی کەی لەوێ لەدایک بووبێ؟ وەک لە سەرەوەیش نووسیمان ماموستا مەلا ئەحمەد ساڵی ١١٩٨ خوێندەواری باش بووە و، ساڵی ١١٩٩ لە تەک باوکیدا موقابەلەی کتێبی کردووە.

---

(١) ئەمەم لە نووسراوێکی ماموستا مەلا ئەحمەدی بێژوێ وەرگرت کە بۆی نووسیوم.

لەمانە بەولاوە شتێکی روونمان لەبارەی ژیانی مامۆستا مەلا ئەحمەد لە دەستدا نییە و، هیواداریین لەمەولا شتی ترمان دەست بکەوێ.

دەبێ ئەوەیش نەبوێرم کە مەلا ئەحمەدێکی ترمان هەیە کە باوکیشی ناوی مەحموودە. ئەم مامۆستا مەلا ئەحمەدەیش ساڵی ١٢٨٥ک لە بێتووش مامۆستا بووە و، لەوێ دەستخەتی (٢٣٨٤-٢٣٨٥)ی نووسیوەتەوە.

مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێژوێش دەڵێ:

مەلا مەحموودی بێتووشی ساڵی ١٢٤١ک توحفەی ئیبنولحەجەری نووسیوەتەوە و، لە کۆتاییەوە نووسیویە:

«کتبه محمود البیتوشي مرشد البرزنجي سنة (١٢٤١) ئەم دەستخەتە لەلای مەلا محەمەدی مەعرووفی وەرتێ ئیمامی گوندی خانەقای پیری ماویلییە، بەهۆی حاجی مستەفای گەورە دێیی بایعی ئارد لە گەڕەکی مامۆستایان لای مزگەوتی شەهیدانی مامۆستایانەوە مامۆستا مەلا ئەحمەدیان ئاگەدار کردووەتەوە کە ئەگەر نەوەی مەلا مەحموودی بێتووشیی بێن مامۆستا مەلا محەمەدی مەعرووف ئامادەیە کتێبەکەیان بداتەوە».(١)

ئەم مەلا مەحموودە مەلا مەحموودی یەکەم نییە و مەلا مەحموودی دووەمە. مەلا ئەحمەدی کوڕیشی مەلا ئەحمەدی دووەم یان سێیەم و زیاترە.

### مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا بێتووشییەکان:

وەک چەند جار باسمان کردووە لە کوردەواریدا - و بەتایبەتیی لەناو بنەماڵە زانیارییەکاندا- زۆر باو بووە کە کوڕ بۆ رێزنان لە باوکی خۆی و بە هیوای پیرۆزیی ناوی باوکییەوە کە کوڕی ئەمیش وەک ئەو دەربچێ.. گەلێ جار کوڕێک ناوی باوکی خۆی لە کوڕەکەیدا زیندە و دووبارە کردووەتەوە. ئەم نموونە لە بنەماڵەی حەیدەرییەکاندا زۆر ئاشکرایە و، چەندان جار ناوەکانی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر و، ئیبراهیمی کوڕی عاصیم و... کێ و کێ دووپات و چەند پات دەبنەوە.(٢)

ئەمەیش تایبەتی ئەم بنەماڵە نییە و گەلێک وێنەی تریان هەیە. بنەماڵەی بێتووشیش لەم نەریتە جێگەی شانازییە بەدەر نییە و، چەند محەمەد و ئەحمەد و مەحموود، وەک کوڕ و باوک، چەند جار بەدوای یەکدا دووپات دەبنەوە.

ناوی عەبدوڵڵایش بەلای کەمییەوە سێ جار لە رشتەی بنەماڵەکەیاندا هاتووە، واتە: عەبدوڵڵای یەکەم و دووەم و سێیەم. کە هەر یەکێکیان شتێکیان لەبارە دەزانین:

---

(١) ئەمەیشم لەو نووسراوەی مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێژوێ وەرگرت.

(٢) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی دەستخەتەکانیانەوە، محەمەد عەلی قەرەداغی، بەرگی شەشەم، ل: ١٨٤ .

عەبدوڵڵای یەکەم: کە بە مەلا عەبدوڵڵای عەللامەیش ناوبراوە، مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای کوڕی شێخ محەمەدە و، یەکێک لە زانا هەرە بەرزەکانی کوردستان بووە و، لە زانستەکانی نەحو و صەرف و بەلاغە و، عەرووض و... دا چەندان شوێنەواری نایابی بەجێ هێشتووە. شیعری بەرزی بە زمانەکانی عەرەبی و فارسی و کوردی هەبووە. شیعرە کوردییەکانی دیار نین و لەوانەیە تێدا چووبن. مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ کتێبێکی باشی لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی بە زمانی عەرەبی نووسیوە. لەم دواییەشدا قوتابییانی کوردی زانکۆکان بڕوانامەی ماجستێر و دوکتۆرا لەسەر دانراوەکانی دەنووسن، منیش ماوەیەک لەمەوبەر وتارێکم بە زمانی عەرەبی لەسەر هەندێ لایەنی تازە دۆزراوەی ژیان و بەرهەمی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا نووسی.(١)

**مەلا عەبدوڵڵای دووەم:**

ئەم مامۆستا بەپێی ئەو زانیارییانەی لەملاولا لەسەر مامۆستایانی بێتووش کۆم کردوونەتەوە پێش من کەس باسی ئەم مامۆستای نەدرکاندووە. ئەم مامۆستا وەک زانیومە هاوچەرخی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای گەورەی بێتووشی بووە و کتێبی ئەویشی نووسیوەتەوە.

دەستخەتێکی کتێبی (تحف الخلان لأشحاذ الأذهان)ی دانراوی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای نووسیوەتەوە، دەستخەتەکە بە ژمارە (٤١٦ /خ) لە کتێبخانەی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵدا پارێزرابوو.

ئەم مامۆستا لە کۆتایی دەستخەتەکەوە ئەمەی نووسیوە:

«تمت النسخة اللطيفة الشريفة المسماة بالألغاز النحوية، من تأليفات شيخنا وسيدنا مولانا عبدالله الكردي الآلاني البيتوشي صانه الله كل بكرة وعشي. بقلم الحقير الفقير عبدالله بن علي بن محمد البيتوشي، وذلك خدمة وامتثالا لأمر مولانا ملا [لێرەدا ناوەکە کوژێنراوەتەوە، لەوە دەچێ (خضر السنجوي) بێت] في شهر صفر المظفر، في سنة ١١٩٠ من هجرته- صلى الله تعالى عليه وعلى آله وصحبه عدد ماجرى القلم في أم الكتاب، وعدد ما كان ويكون آمين».

هەر ئەم مامۆستا دەستخەتی ژمارە (٢٨٥٠٤ م، و)ی ساڵی ١١٩١ بەشێکی لە گوندی بێتووش

---

(١) بڕوانە: البيتوشي، حياته وآثاره، رسالة تقدم بها خطاب عمر بكر الى مجلس كلية الآداب في جامعة بغداد، جزءً من متطلبات درجة ماجستير آداب في اللغة العربية، ١٤٠٤هـ- ١٩٨٤م.

هەروەها بڕوانە: الحفاية بتوضيح الكفاية دراسة وتحقيق طه صالح امين. رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين، ١٩٩٣- ١٩٩٤ .

هەروەها بڕوانە: كفاية المعاني في حروف المعاني، تأليف: العلامة الشيخ عبدالله الكردي البيتوشي، شرحه وحققه شفيع البرهاني. (رسالة ماجستير) الطبعة الأولى، دار اقرأ. سوريا - دمشق، ٢٠٠٥ .

**هەروەها** بڕوانە: محمد علي القرداغي، اطلالة جديدة على جوانب من حياة وآثار البيتوشي، گۆواری خۆری ئیسلام- شمس الإسلام، العدد: ٢٢، ٢٠٠٣ .

ئێستەیش لە (الإحساء)ی دەوڵەتی سعوودی قوتابی (خالد الجريان) خەریکی نووسینی بابەتێکە لەسەر بێتووشی بە ناونیشانی (البيتوشي وجهوده النحوية).

و بەشەکەی تری لە شاری کۆیە نووسیوەتەوە. لەم دەستخەتەیاندا رشتەی باو و باپیری ئاوا نووسیوە:

عەبدوڵڵای کوڕی عەلی کوڕی محەمەدی کوڕی رەسووڵی ئالانیی بێتووشی.

لێرەدا گومان بۆ ئەوە دەچێ ئەم مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا برازای مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای گەورە بێ، چونکە ئەو عەبدوڵڵای کوڕی محەمەدە و، ئەم عەبدوڵڵای کوڕی عەلی کوڕی محەمەدە. بەڵام باپیری مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای گەورە ناوی (إسماعیل)ە.[1]

**عەبدوڵڵای سێیەم:**

لەبارەی ئەم مامۆستا ئەوەندەم دەست کەوتووە بەگوێرەی دەستخەتی ژمارە (٢٢٤١)ی کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزی، ئەم مامۆستا ساڵی ١٣٠٧ لە گوندی بێتووش مامۆستا بووە و، عەلی ناوێک کە لە خزمەتیدا خوێندوویەتی و کتێبی (المعفوات)ی مەلا خەلیلی سعرتیی نووسیوەتەوە.

**مەلا عەبدوڵڵای چوارەم:**

ئەم مامۆستا لە شوێنێکدا رشتەی پشتەکانی بەم شێوە نووسیوە:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدی، کوڕی مەحموودی، کوڕی محەمەدی، کوڕی مەحموودی، کوڕی محەمەدی، کوڕی مەولانا ئیسماعیلی، کوڕی مەولانا ئیبراهیمی، کوڕی عیزەدینی بێتووشی.

ئەم مامۆستا دانراوێکی هەیە بە ناوی (إعقاد الدرر في إیضاع شواهد المختصر) نوسخەکەی کە بە خەتی دانەرەکەیەتی و ساڵی ١٣٢١ نووسیویەتییەوە، بە ژمارە (٢٤٠٨) لە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزیی سلێمانیدا پارێزراوە.

هەر لە شوێنەوارەکانی ئەم مامۆستا کۆمەڵە دەستخەتی (٢٥٤٣-٢٥٤٥) لە کتێبخانەی ناوبراودا پارێزراوە. کە ساڵی ١٣٢٥ لە سابڵاغ نووسیویەتییەوە.[2]

دەستخەتی ژمارە (٢٤٢٧)ش بە خەتی ئەم مامۆستا ساڵی ١٣٢٧ لە گوندی باغلوجە لە خزمەتی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای (الدری)دا نووسراوەتەوە. ناوی عەلی (پەسوێی)شی بەسەرەوەیە.

دەستخەتی (٢٤٠٠)ش شوێنەواری مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای چوارەمە و لە شاری کۆیسنجەق نووسیویەتییەوە.

هەروەها دەستخەتی (٢٤٠٢-٢٤٠٣)ش دەستخەتی ئەم مامۆستایە. بەگوێرەی دەستخەتی (٢٤٤١)ش ئەم مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا ساڵی ١٣٤٤ک لە ژیاندا بووە.

---

(١) بڕوانە: البیتوشي ص: ١٠ .

(٢) لە دەستخەتەکەدا لە شوێنێکدا نووسراوە: لەو ساڵەدا خەڵکی سابڵاغ لەگەڵ هۆزەکانی مەنگوڕ و پیران و تیرەی دیبوکریدا جەنگاون.

ئەم مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا بەپێی نووسینی کتێبی (إعقاد الدرر)ەکەی، زمانی عەرەبییەکەی زۆر پاراو نییە، بەڵام بەو پێیە ساڵانێک دوای ئەوە لە کۆیە و سابڵاغ بووە، وایش پێ دەچێت بوونەکەی بە فەقێتیی بووبێت، دەبێ ئەو کتێبەی لە کاتی فەقێتیدا دانابێ. بەڵام لەوە بەولاوە دانراوێکی ترمان لە دەستدا نییە.

مامۆستا مەلا ئەحمەدی (بێژوێ)یش لەبارەی ئەم مامۆستایانە هەندێ شتی بۆ نووسیوم تێیاندا دەڵێ:

لە گوندی بێتووشدا چوار مەلا عەبدوڵڵای ناودار بوون:

١- مەلا عەبدوڵڵای یەکەم ناسراو بە مەلا عەبدوڵڵای عەللامە.

٢- مەلا عەبدوڵڵای دووەم ناسراو بە (قاضي عبدالله‌ی ئەعوەر).

٣- مەلا عەبدوڵڵای رەش مەشهوور بە (موفتی).

٤- مەلا عەبدوڵڵای چوارەم ناسراو بە (ئیمام).

مامۆستا مەلا ئەحمەد لەبارەی مەلا عەبدوڵڵای دانەری (إعقاد الدرر) دەڵێ: ساڵی ١٢٨٦ لە بێتووش لەدایک بووە، ساڵی ١٣٢١ کتێبی (إعقاد الدرر)ی داناوە. هۆنراوەی زۆر بووە، لە شەرعدا زۆر شارەزا بووە، ساڵی ١٣٢٨ لە خزمەتی مامۆستا قادری کانی کەوەییدا ئیجازەی تەدریس و مەلایەتی وەرگرتووە. ساڵی ١٣٦٦ لە بێتووش لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

لەبارەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای رەشی ناسراو بە (موفتی)وە دەڵێ: لە دەوروبەری (١٢٨٠)دا لە گوندی بێتووش لەدایک بووە. مامۆستایەکی چاونەترس و تیانەوەستاو و بەسام بووە و، ناحەقی پێ قووت نەچووە و، لە تەک ئاغاکانی میراودەلیدا لە کێشەدا بووە. ئەم مامۆستا ساڵی ١٣٦٠ک کۆچی دوایی کردووە.

لە تەک مامۆستای قازیی کۆیە و مامۆستا مەلا عەبدوللەتیف ناوێکدا لە نامە و باسێکدا ناوی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای رەشی پشدەریی هاتووە، وا پێ دەچێت کە ئەم مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا و ئەو مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا کە لێرەدا مەلا عەبدوڵڵای سێیەمە و، بە مەلا عەبدوڵڵای رەش ناسراوە، یەک کەس بن.[1] بەڵام مێژووەکانیان لە گومان بەدەر نین.

دەبێ بەسەر ئەوەدا نەڕۆم کە دەستخەتی ژمارە (٤٣٣٦١ م، و) کە لەم باسەدا سوودی لێ وەردەگرم و نامیلکەیەکی مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشیی و چەند دانراوی مامۆستایانی تری کوردی لە خۆی گرتووە و ساڵی ١٢٩٢ نووسراوەتەوە.. نووسەرەوەکەی لە کۆتاییی نووسینەکانییەوە دەڵێ (إبن الإمام)[2] واتە ئیبنولئیمام نووسیویەتییەوە، ئیتر نازانم پێوەندی بە مەلا عەبدوڵڵای ئیمامی بێتووشییەوە هەیە یان نا؟.

لەبارەی مەلا عەبدوڵڵاکانی بێتووشی نامەیەکم لەلایە بە روونیی دیار نییە بۆ کام مەلا

---

(١) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، بەرگی یەکەم، ل: ٣٦٢ .

(٢) وێنەی ئەم دەستخەتە لە کتێبخانەکەی خۆمدا هەیە.

عەبدوڵڵایان نێرراوە، بەڵام ئەو مەلا عەبدوڵڵا کە نامەکەی بۆ چووە ساڵی ١٣١١ قازیی بێتووش بووە. نووسەری نامەکە ناوی خۆی نەنووسیوە، نامەکە بۆ ئەوەیە کە مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا نیکاحی مریەمی خێزانی ڕەحیم لە نیکاحی حەنەفییەوە بکا بە شافیعی.

چەند مامۆستایەکی ئەو سەردەمە شایەتی ئەو باسە بوون و ناویان و مۆریان بە کاغەزەکەوەیە کە ئەم ناوانەن:

مەلا محەمەد ڕەحیمی (شوی)، سەید ڕەزای واژەیی، سەید ئەحمەدی واژەیی. مەلا محەمەد حسەینی تەوەکەڵیی. مەلا (فرج الله).

هەر لەم بارەیشەوە قەسیدەیەکی شێخ مەعرووفی نۆدێیم لەلایە کە مامۆستا مەلا محەمەدی ئیبنولحاجی بانەیی بۆ برای خۆشەویستی مەلا عەبدوڵڵای بێتووشیی نووسیویەتییەوە.

هەروەها پارچەیەک شیعری عەرەبیم لەلایە لەسەری نووسراوە نامەی مەلا عەبدوڵڵای سێیەم بۆخزمەتی مەلا محەمەدی کوڕی شێخ. بەڵام نامەکە بە زمانی عەرەبییە لە رووی زمان و کێشەوە زۆر لاوازە و نووسینیم بەلاوە پەسەند نەبوو.

**مامۆستا مەلا ڕەسووڵەکانی بێتووشی:**

لەناو زانایانی بێتووشدا وەک چەند مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا هەبووە، هەروەها چەند مامۆستا مەلا ڕەسووڵیش هەبووە.

یەکەمیان:

ئەگەر وا دابنێین مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای دووەم باو و باپیرانی مەلا و مەلازادە بوون ئەوا (مەلا ڕەسووڵی یەکەم) ئەو ڕەسووڵەیە کە باپیرە گەورەی مەلا عەبدوڵڵای دووەمە و، ئەو کاتە ئەم مامۆستا بە یەکێک لە مامۆستا دێرینەکانی ئەو بنەماڵە دادەنرێت؛ چونکە سێ پشت پێش هەردوو مەلا عەبدوڵڵای یەکەم و دووەمە کە لە ١١٩١ک دا لە ژیاندا بوون.

دووەمیان:

مامۆستا مەلا ڕەسووڵی کوڕی حاجی قادری بێتووشییە. ئەم مامۆستا لە دەستخەتی ژمارە (٢٤٠٨)ی کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانیدا ناوی هاتووە. دەستخەتی ژمارە (١٦٨٧٤ م، و)ش کە کتێبی (عەبدوڵڵا یەزدییە) محەمەد تاهیری کوڕی حاجی خضر بەگ ساڵی ١٣١١ک لە خزمەتی ئەم مامۆستا مەلا ڕەسووڵەدا نووسیویەتییەوە.

سێیەمیان:

بەپێی دەستخەتی (ملتقى الأبحر) کە ساڵی ١٣٢٠ک لە شاری کەرکووک نووسراوەتەوە، دەبێ قازی ڕەسووڵێکی بێتووشیش هەبێ؛ چونکە نووسەرەوەی ئەم دەستخەتە دەڵێ: منی بێچارە کوڕەزای قازی ڕەسووڵی بێتووشی ئالانیی ئەم دەستخەتەم لە شاری کەرکووک نووسییەوە. لە مۆرەکەیشی (یا رسول مدنی) هەڵکەنراوە. لە خواریشیەوە نووسیویە: ڕەسووڵی کوڕی مەحموودی

کوڕی ئەحمەد.

جا ئەگەر ئەم خۆی ناوی رەسووڵ بێت باپیرە گەورەیشی (قازی رەسووڵ)ی ناو بێت ئەوا رەسووڵەکانیش دەبن بە چوار.

بەگوێرەی پەراوێزێکی دەستخەتی ژمارە ٤٤/٤١٢ کە لە کتێبخانەکەی خۆمدایە، مامۆستا مەلا رەسووڵی بێتووشیی ساڵی ١٣١٩ک مامۆستای مزگەوتی حاجی مەلا عومەر بووە لە شاری کۆیە.(١)

هەر لەبارەی ئەم مامۆستا مەلا رەسووڵە و نەوەکانییەوە دوکتۆر فوئاد مەعسووم بۆی گێڕامەوە:

مەلا نەجیم کوڕی مامۆستا مەلا رەسووڵی بێتووشی بووە و ئیمامی مزگەوتی گەورەی کۆیە بووە لە ساڵانی ١٩٥٦ و ١٩٥٧دا کۆچی دوایی کردووە.

هەروەها د. فوئاد بۆی گێڕامەوە کاتێک لە کۆیە فەقێ بووە پڕ سێ گونیە کتێب و دەستخەت و کاغەزیان هێناوە کە پاشماوەی کتێبخانەی مامۆستا مەلا رەسووڵی بێتووشی بوون لە مزگەوت دایان ناون. دوکتۆر فوئاد وتی: من چەند دەستخەتێکم لێ هەڵبژاردن ئەوانی دیمان خستنە تاقەکانی مزگەوت. دوایی نازانم چییان بەسەر هات.

هەر لەبارەی خانەوادەی بێتووشییەوە دوکتۆر فوئاد وتی: لەو خانەوادەدا ئەفسەرێک هەبوو ناوی حەمە ساڵح بێتووشی بوو، یەکێک بوو لەو ئەفسەرانەی لە سەرەتای دامەزراندنی سوپای عێراقدا لە کوللیەی عەسکەری دەرچووبوو. ئەو ئەفسەرە ماوەیەکیش ئامیری خەستەخانەی رەشیدی عەسکەری بوو، لەم ساڵانەی دواییدا کۆچی دوایی کرد.(٢)

زانایەکی تری بنەماڵەی بێتووشی عەبدولکەریمی کوڕی مەحموودی بێتووشییە کە ساڵی ١٢٩٧ لە ژیاندا بووە و کتێبی (شرح العقائد النسفية)ی نووسیوەتەوە کە بە ژمارە (٢٤٤١) لە کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانیدا پارێزراوە.

## چەند زانایەکی تری بێتووشی:

بێجگە لەو زانا و مامۆستایانەی کە لە رشتەی بنەماڵەی بێتووشییەکاندا ناویان هاتووە و شتێکم لەسەر نووسین، لە پەراوێز و کۆتاییی دەستخەتەکاندا ناوی چەند مامۆستای تری بێتووشیم دیوە، لێرەدا ناوی ئەوانیش دەخەمە پاڵ ئەمانی تر:

١- مەلا مستەفای بێتووشیی وا دیارە دوو مەلا مستەفای بێتووشی هەبووە:

---

(١) نازانم هەر بە رێکەوت بووە مامۆستایانی بێتووش لە شارۆکەی کۆیە خوێندوویانە و بە فەقێتی لەوێ بوون، دواتریش بە مەلایەتی و دەرزوتنەوە و نیشتەجێبوونی هەمیشەیی... یان پێوەندییەکی تایبەتییان بەو شوێنەوە هەبووە؟ لەم باسەدا بوونی فەقێ و مەلا و مامۆستایانی بێتووش لە کۆیە ئاشکرایە.

(٢) ئەم زانیارییانەی د. فوئاد مەعسووم هەندێکیانی بۆ نووسیوم و هەندێکیشیان بە دەمی لە دانیشتنێکی رۆژی ٢٠٠٧/٦/٦ دا لێم وەرگرت.

**یەکەمیان:** مستەفای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی محەمەدی بێتووشی، بە گوێرەی دەستخەتی (٣/ ١٩٢٠٩ م، و) ئەم مامۆستا ساڵی ١٢٩٢ لە مەدرەسەی مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێژوێیدا (قول أحمد)ی نووسیوەتەوە.

**دووەمیان:** مستەفای کوڕی محەمەدی بێتووشی دەستخەتی (٢٢٦٥٣ م، و) کە دانراوی (قاضي حسين ميبدي)یە لە شاری ئەربیل لە مەدرەسەی مەلا عومەر ئەفەندیی ئەربیلی نووسیویەتییەوە.

مستەفای پاپڵانیی دەستخەتی ژمارە (١٩٢٠٩ م، و) کە کۆمەڵێک دانراوی تێدایە ساڵی ١٢٩٠ بۆ مەلا مستەفای بێتووشی نووسیوەتەوە.

هەروەها ئەم مستەفای پاپڵانییە ساڵی ١٢٩٦ دەستخەتی ژمارە (٢٤٢٦)ی ئەوقافی سلێمانیی بۆ مامۆستا مەلا مستەفای بێتووشیی نووسیوەتەوە، بەڵام ناوی باوکی نەنووسیوە و، نازانین کام لەم دوو مامۆستا مەلا مستەفا بێتووشییانەیە.

لە دەستخەتی ژمارە (٦٩٣٥ م، و)دا شیعری مستەفای بێتووشی هەیە. ئەمەیش - دووبارە- نازانم کام لەو دوو مامۆستا مەلا مستەفایە.

٥- عەبدولکەریمی کوڕی موفتی بێتووشی ساڵی ١٣٥٣و ١٣٥٤ نامیلکەی (العروض والقافية) و (الفوائد الحسنية)ی مەلا عومەری (کچک مەلا)ی ئەربیلی نووسیوەتەوە، ئەم دەستخەتانەم لە لای مەلا عوسمانی موفەتیشی ئەوقاف بینی، ژمارە ١٤٨/١/ ع ١٤٨/٢ ع م دانێ.

٦- مەلا ساڵحی بێتووشی ساڵی ١٢٨٨ لە مەدرەسەی گەناو لە خزمەتی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای بێتووشیدا دەستخەتی ژمارە (٢١٣١٧ م، و)ی کە (حسامكاتي)یەی نووسیوەتەوە.

٧- لە کۆتاییی پارچە زەوائیدێکەوە کە حاشیەیەکی عەبدولحەکیمی هیندیی تێدایە. نووسراوە: (كاتبه إسماعيل بيتوشي) بەڵام نە مێژوویەک نە شتێکی تری نەنووسیوە.

## پاشماوەی کتێبخانەی بنەماڵەی بێتووشی:

ئاشکرایە بەهیچ شێوەیەک ناتوانین سەرجەمی دەستخەتەکانی کتێبخانەی بێتووشی بزانین؛ چونکە ئەو دەستخەتانە نەپارێزراون و بە گەلێ شوێنی جیهاندا بڵاوبوونەتەوە، بێگومان زۆریشیان بە یەکجاری تێداچوون، لەم باسەدا بە گوێرەی پێویست و بۆ وەرگرتنی زانیاری لێیان ناوی هەندێکیانم هێنا، چەند دەستخەتی تریش هەن ناو و نیشانە و (تملك)ی زانایانی ئەو بنەماڵەیان پێوەیە، بێ سوود نابێ ناوی ئەوانیش تۆمار بکەم، بەڵکو لەمەولایش زیاتریان بدۆزرێتەوە:

١- دەستخەتی ژمارە (٢٣٢٢ سلم) شەرحی (حرز الأماني)یە، لە کتێبخانەی مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشیدا بووە و (تملك)ی ئەوی بەسەرەوەیە.

٢- دەستخەتی ژمار (٢٨٧٣ سلم)یش کتێبی (شرح المغنی)یە، (تملك)ی مەلا محەمەدی بێتووشی بەسەرەوەیە لە تەک مێژووی ١٣١٠دا.

عەبدولکەریمی کوڕی خضری کوڕی ئەحمەد ساڵی ١٢٣٨ لە گوندی (بست) نووسیویەتییەوە.

٣- دەستخەتی (٢٥٣٠ سلم)، (تحفة الطلاب)ە لە تەک چەند دانراوی تردا کۆکراونەتەوە، (تملك)ی

مامۆستایان مەلا مەحموود و مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی لە ساڵی ١١٧٦دا بەسەرەوەیە.

٤- دەستخەتی (٤٣٦ سلم)ش (شفاء الصدور شرح الشذور)ی ئیبنوهیشامە، (تملك)ی مەلا مەحموودی بێتووشی بەسەرەوەیە. دواتریش وەقفی کاک ئەحمەدی بەسەرەوەیە کە وقفی کردووە لەسەر زانایان و قوتابییانی شاری سلێمانی. مێژووی وەقفەکە ساڵی (١٢٨٣)یە، دەستخەتەکە ساڵی ١١٨٥ لەلایەنی ئەحمەدی کوڕی عیسای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی (ضاحی)یەوە نووسراوەتەوە. دوور نییە هەر لە بنەڕەتدا ئەم نووسەرەوە لە (الإحساء) بۆ مامۆستا مەلا مەحموودی نووسیبێتەوە.

٥- دەستخەتی ژمارە (٢٢٢٩ سلم)یش (تحفة الطلاب)ە و (تملك)ی شێخ مەحموودی بێتووشی بەسەرەوەیە.

٦- چەند لاپەڕەی قورئانی پیرۆز کە سوورەتەکانی (الكهف) و (طه)یان تێدایە. بە خەتێکی جوان و بە مەرەکەبی رەش و سوور نووسراونەتەوە.

سەرەتا لەلای محەمەدی کوڕی عەلی کوڕی عوبەیدان بوون، ئەمە لە ساڵی ١١٧٤دا بووە. دوای ئەوە بە کڕین کەوتوونەتە لای مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشی، بەڵام ساڵی کڕینەکەی دیاری نەکردووە.

ئەم دەستخەتەم لەلای مەلا عوسمانی موفەتیشی ئەوقاف بینی.

### فەرمانڕەواییی بێتووش و مامۆستایانی بێتووشی

لە کاتی گەڕانم بە ناو پاشماوەی شوێنەواری مەدرەسەی بێتووش و بەسەرهاتی مامۆستایانیدا چەند زانیاریم دەستکەوت لە فەرمانڕەواییەک دەدوێن کە لەو سەردەمانەدا کارا بووە و دەوری لە ناوچەکەدا، هەندێ جار فەرمانڕەواکان یان دەستە و دایەرەیان کێشەیان بۆ مامۆستایانی بێتووش دروست کردووە.

بۆیە بە باشی دەزانم لە رووی ئەو زانیارییانەوە ئاماژە بۆ ئەو فەرمانڕەواییە و فەرمانڕەواکانیشی بکەم.

بە دروستی سەرەتا و کاتی دروستبوونی ئەو فەرمانڕەواییە نازانم. یەکەم ئاماژەیەک لەو بارەوە لە دەستدا بێ ئەوەیە پێش ساڵی ١١٥٥ک ١٧٤٢ز شێخە بەگ فەرمانڕەوای بێتووش بووە، ئەوەیش نازانم شێخەبەگ لە کەیەوە فەرمانڕەوا بووە، هەروەک ئەوەیش روون نییە ئەو یەکەم فەرمانڕەوا بووە یان پێش ئەویش فەرمانڕەوا، یان فەرمانڕەوایان بوون.

ئەوەندە دەزانین شێخەبەگ لە ساڵی ١١٥٥ک - ١٧٤٤ز کوڕێکی بووە ناوی یووسف بووە، مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی بە پارچەیەک شیعری فارسی ساڵی لەدایکبوونی ئەم کوڕەی دیاری کردووە، هەروەها لە شیعری مامۆستای بێتووشییەوە دەردەکەوێ ئەم یووسف بەگە بووە بە فەرمانڕەوای بێتووش. واتە شێخەبەگ فەرمانڕەوای یەکەمی ناسراوی بێتووش بووە و، یووسفی کوڕی فەرمانڕەوای دووەم. فەرمانڕەواییی یووسف بەگ لە ساڵی ١١٨٠ک - ١٧٦٦ز و دوای ئەو

مێژووەدا بووە، بەڵام نازانرێ تا کەی دەوامی کردووە.[1]

دوای ئەوە هەواڵێکی دروستی ئەم فەرمانڕەواییەمان لە دەستدا نییە تا ساڵی ١٢٩٣ک – ١٨٧٦ز لە دەستخەتی ژمارە (١١٥٠)ی کتێبخانەی مەرکەزیی ئەوقافی سلێمانییەوە ئەوە دەردەکەوێ کە مستەفا ئاغا لەو ساڵەدا فەرمانڕەوای بێتووش بووە.

جێگەی خۆیەتی لێرەدا باسی ئەوە بکەم کە ئەم مستەفا ئاغایە کێشە و سەرئێشەی بۆ مامۆستایانی بێتووش دروست کردووە و ژیانی لێ تاڵ کردوون، روون نییە کێشە و سەرئێشەکە چۆن بووە، بەڵام دیارە لە سنوورێکی فراواندا بووە و کار گەیوەتە ئەوە مامۆستایانی بێتووش پەنا بەرنە بەر کەسانی خاوەن دەسەڵات و خاوەن رێز و داوای لابردنی ستەمی مستەفا ئاغا و دەستە و بەستەکەی لەسەر مامۆستایانی بێتووش بکەن.

بۆ ئەم مەبەستە مامۆستایانی بێتووش پەنایان بۆ لای شێخ مستەفای بەرزنجی بردووە کە ئەو کاتە موفتیی سلێمانی بووە، مامۆستا شێخ مستەفایش نامەیەکی بۆ مستەفا ئاغای فەرمانڕەوای بێتووش نووسیوە،[2] لە نامەکەیدا سەرکۆنەی مستەفا ئاغای کردووە و داوای لێ کردووە کە رێز لەو مامۆستایانە بگرێت و ئەگەر ئەو بێڕێزییە بەرانبەر بەو مامۆستایانە بەردەوام بێ ئەوا مامۆستای بەرزنجی[3] ئەو مامۆستایانە دەهێنێتە سلێمانی و، جێگە و رێگەی شیاویان بۆ دابین دەکات. ئەوەندە لە دەستخەتەکان وەردەگیرێ کە مستەفا ئاغا تا ساڵی ١٣٠٠ فەرمانڕەوا بووە و، لە ساڵی ١٣٠١ک – ١٨٨٣ز بریندار کراوە. ئیتر دیار نییە دوای ئەوە چی بەسەر هاتووە. هەر بەگوێرەی دەستخەتی ژمارە ١١٥٠ی کتێبخانەی ناوبراو ساڵی ١٣٠٠ک – ١٨٨٢ز زاهیر ئاغای کوڕی بایز ئاغای دولکانی فەرمانڕەوای بێتووش بووە. بەڵام ئەویش نازانرێ چۆن لە یەک ساڵدا دوو کەس فەرمانڕەوای ئەو شوێنە بوون.

لێرەدا دەقی نامەکەی موفتیی سلێمانی بۆ مستەفا ئاغا دەخەمە روو:

**دەقی نامەکە وەک خۆی:**

کراما مهربانا

اولا مطلب اصلی استعلام حالات آنجناب محبت مآب است، ثانی چون مصلحت دینی و دنیایی موانف! آثار منظور نظر محبت است. لهذا بمقام مصلحت جوی آمدم آینکه بر آنجناب لازم

---

(١) بڕوانە: البیتوشي، ص: ٢٨ .

(٢) ئەم نامەم لە رێگەی مەلا عوسمانی موفەتیشی ئەوقافەوە دەست کەوت.

(٣) مامۆستا شێخ مستەفای موفتیی کوڕی شێخ بابا رەسووڵی بەرزنجییە، ساڵی ١٢٣٤ک – ١٨١٨ز لەدایک بووە. سەرپەرشتیاری ئەوقافی سلێمان پاشای بابان بووە. خاتوون مریەمی کچی کاک ئەحمەدی شێخ خێزانی بووە. پاش موفتیی چاومار بووە بە موفتیی سلێمانی. ساڵی ١٣٠٣ک – ١٨٨٥ز کۆچی دوایی کردووە. گۆڕەکەی لە تەنیشتی گۆڕی شێخ مارفی نۆدێییەوەیە لە گردی شێخ مارف لە سەیوان. (هەندێک لەم زانیارییانەم بە دەمی لە مامۆستا عەبدولرەقیب یووسف وەرگرت، مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵیش لە لاپەڕە (٧٧)ی کتێبی (الشیخ معروف النودهی)دا باسی کردووە.

وواجب است، که دایما در ترویج اسباب دین، وانجاح امور مسلمین سعی وجهد بلیغ بعمل آرند، وچونکه از زمرهء اصحاب قدرتند، دایما باید در احترام وتوقیر جانب علماء که باعث قوام وقیام ارکان دین مبین اند بکوشند، واز مال خالص خودتان ادارهء وجه معیشت ایشان ابذال صرف همت فرمایند، تاکه مثل دنیا خانه آباد آخرت گردند.

لکن عکس احوال مشاهده گردید، تأسف کلّی خوردیم، زیرا درین روزها ملایان بیتووشی، که همگی خاندان علم، وحقوق کلی بر اهل آنسامان دارند، بدینجا آمدند، بیان نقل کردن خودشان بدینطرف کردند، محب نیز چونکه اینماده موجب وهن کار دین و دنیای آنجناب واهل آنجا بود، ابدا تجویز ننمودم، وبعد از دلالت واستمالت کلی، ایشان را ازین کیفیت نادم ساختیم، و این! است ایشان را باز اعاده آنطرف کردیم، اگر چنانچه امتثال امر آلهی، وترویج دین غرای حضرت رسالتپناهی را منظور میدارند واز خاطر ما محبان ونیک خواهان گذشت نمیفرمایند، کما کان، ایشان در جای ومکان خودشان اسکان، وآنچه مخصوص ایشان بود بدیشان ارجاع و واگذار خواهند داشت، والا اگر گذشت ازهمه جهات خواهند کرد، ما ایشان را بدینجا آورده، بر حسب مطلوب ایشان را جای ومقام خواهیم داد. دیگر منتظر ارجاع مهمات وبیان اینماده...[۱] میباشم

٢٧ ذي القعدة سنة ٣٠١

مفتی لوای سلیمانی

**له پشتی نامەکە نووسراوە:**

**«بنظر انور کرام جهان خود مصطفی آغای دولکانی رسیده باد».**

***

وا دیارە کێشەی مامۆستایانی بێتووش درێژەدار بووە وەک پەنایان بۆ لای مامۆستا شێخ مستەفای بەرزنجی بردووە پەنایان بۆ لای کاک ئەحمەدی شێخیش بردووە و، کاک ئەحمەدیش بەدەنگیانەوە هاتووە و نامەی بۆ ئەو کەسانە نووسیوە کە ستەمیان لێ کردوون[٢]. بەڵام بەداخەوە مێژووی نامەکەی کاک ئەحمەد دیار نییە.

---

(١) یەک دوو وشەی نامەکەم باش بۆ نەخوێنرایەوە، ئەم نامەم لە تەک وتارێکی کورتدا لە ژمارە ٦٣ی کۆواری سلێمانیدا بڵاو کردووەتەوە.

(٢) مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێژوێیی بۆی نووسیم؛ وەک بۆیان گێڕاوەتەوە قازی مەلا عەبدوڵلای ئەعوەری بێتووشی و مەلا عەبدولکەریمی مەعنەوی لە مەلایانی بێتووش چوونەتە خزمەتی کاک ئەحمەد و شکاتیان لەو کەسانە کردووە کە ئازاریان دەدەن. کاکەحمەدیش سێ نامەی بۆ نووسیون:

یەکەم: بۆ مستەفا ئاغای باپیراغا کە ئەو کاتە سەرداری عەشیرەتی باپیر ئاغایی بووە لە ئالان.

دووەم: بۆ ئاغایانی تر.

سێیەم: بۆ سەردار و سالاری تەورێز بووە.

ئەگەر وابێ ئەم نامەی ئێرە یەکێکە لەو سێ نامەی کاکەحمەدە و دەبێ چاوەڕوانی دوو نامەکەی تر بین بەڵکو!

هەروەها لە نامەکەی کاک ئەحمەددا کە بۆ (سیف الدین خان)ی نووسیوە دیار نییە کە (سیف الدین خان) فەرمانڕەوای بێتووش بووە یان نە. ئەوەندە هەیە کاک ئەحمەد لە نامەکەیدا باسی ئەوە دەکات کە ئاغایانی ئالان ئازاری مامۆستایانی بێتووش دەدەن و سووکایەتییان پێ دەکەن و کاک ئەحمەدیش بەوە زۆر نارەحەتە.

دیارە کە ئالان سەر بە بێتووش بووە و، ئەو کاتە ئاغایانی ئەو ناوچە لەژێر دەستەڵاتی فەرمانڕەواییی بێتووشدا بووە.

لێرەدا دەقی نامەکەی کاک ئەحمەدیش بۆ (سیف الدین خان) بە دەقە فارسییەکەی و وەک خۆی بڵاو دەکەمەوە.[1]

بەڵام پێش دەقی نامەکە ئەوەندە دەڵێم: بەپێی دەستخەتی ژمارە (٢٢٤٠- ٢٢٤١)ی کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی عەلی ئاغایەکیش فەرمانڕەوای بێتووش بووە، بەڵام دیار نییە لە بەرەی مستەفا ئاغایە یان نا، هەروەک دیار نییە لە چ سەردەمێکدا فەرمانڕەوای بێتووش بووە.

**دەقی نامەکە وەک خۆی:**

بجناب حبیبي وابن حبیبی سیف الدین خان! دعای حفظ إیمان وسلامتی جان وفرزندان می رسانم. بعد السلام ودعا بحصول مرام. عرض است:

ملاّیان بیتوش من القدیم خاندان علم ودیانت وصلاحت بودەاند ومی باشند، ومحسوبیت بخاندان محب داشتە اند، بر همەکس رعایت وصیانت اهل علم از جملەء واجبات است؛ زیرا قوام دین باوهاست. حال آغایان آلان ارادە کردە اند خرج ازوها بستانند، واوهارا تضییق کردە اند، بر سر ایشان- کە لە الحمد صاحب تسلط واقتدارند- لازم است کە دفع ظلم ازوها بفرمایند، وبلکە اگر دفع نفرمایند بمفاد: (کلکم راع وکلکم مسؤل عن رعیتە) بمحل خطاب ومعاتبەء حضرت باري- جل جلالە- درمي آیند. دخیل بفریاد اوها وخودتان برسند! ورفع این ظلم عظیم از اوها بفرمانید، احسان عظیم وموجب ممنونی ودعاهای خیر محب است.

الداعی الحزین علی إهانة العالمین

السید احمد البرزنجی

مۆر: عبدە احمد

---

(١) ئەم نامەیشم لای مامۆستا عوسمانی موفەتیشی ئەوقاف دی و ڕێگەی دام بڵاوی بکەمەوە، سوپاسی دەکەم. (بڕوانە: ژمارە ٧٢ی گۆواری سلێمانی).

# بەڵگەنامەکانی کوردستان

٥٧٥

## سەرەتایەکی کورت

گەلانی خواپێداوی دنیا لە بواری کۆکردنەوەی کەلەپوور و بەڵگەنامە و دیکۆمێنتەوە گەلێ کاری گەورەیان ئەنجام داوە و، رۆژ لە دوای رۆژیش لەو بوارانەدا کارگەلی گەورە گەورە دەخەنە سەر خەرمانی سامانی نەتەوایەتییان.

بەڵام ئێمەی کورد نە دەستخەتخانەمان بۆ کۆکردنەوە و پاراستنی دەستخەتەکانمان هەیە و، نە ئەرشیفی نەتەوایەتیمان بۆ پاراستن و لێکۆڵینەوەی بەڵگەنامەکانمان هەیە، دەیان و سەدان و هەزاران بەڵگەنامەی پڕ بایەخ و بە سوودمان هەن چاوەڕوانی ئەوەن شتێکیان بۆ بکرێ و سوودی خۆیان بدەن. من لە ئاستی خۆمەوە جاروبار لە دەرگەی ئەو بابەتانە دەدەم و، هەر جارەی دیارییەک پێشکێشی کتێبخانەی کوردی دەکەم، ئەم جارەیش بەم بەڵگەنامەیەوە دێمەوە ناو ئەم بابەتە، بەهیوای ئەوەی ئەمە هاندەر بێ بۆ ئەوەی لایەک لەم سامانە پڕ بایەخە بکرێتەوە.

## بەڵگەنامەی کوردستان

لەبارەی بەڵگەنامە و ئەو دەقانەوە کە بە بەڵگەنامە دادەنرێن نابێ چاوەڕوانی ئەوە بین دەق و دیکۆمێنتەکان بە زمانی کوردی بن؛ چونکە هەموو دەزانین تەمەنی پەخشانی کوردی ئەوەندە درێژ نییە ئەو جۆرە کارانەی لە کۆندا پێ کرابێ. بۆیە دەبێ بڵێین: (بەڵگەنامەی کوردستان) واتە ئەو بەڵگەنامانەی بەشێوەیەک لە شێوەکان پێوەندییان بە کوردستان و زانا و ناوداران و کەسایەتییەکانیەوە هەیە، ئەمەیش بەهەر زمانێک بێ کە ئەو مەبەستانەی ئێمەی بەدی هێنا ئەوە بەڵگەنامەی کوردستانە و، لەم دەقانەیش - با لەلای خۆیشمان نەبن- مان زۆر زۆرە و ، تەنیا بەرنامەی گونجاو و شیاو و کەسی کارامە و لێهاتوویان دەوێت کاریان بۆ بکەن.

لە وتارێکدا لە ژمارە (١١٦)ی گۆڤاری ڕاماندا[1] یەکەم جار و دواتریش لە بەرگی هەشتەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی دەستخەتەکانیانەوەدا بڵاو بووەوە، باسی گەلێ لە سوود و بایەخی بەڵگەنامەم کرد، هەر بۆ دەرخستنی بایەخی بەڵگەنامە و جۆری بایەخدانی گەلانی تر بە بەڵگەنامە پوختەی سەر وتاری ژمارە (٥٧)ی (گنجینەء اسناد) دەکەم بە کلیلی دەرگەی ئەم بابەتە:

---

(١) **بڕوانە**: گۆڤاری (ڕامان) ژمارە (١١٦). هەروەها بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی **دەستخەتەکانیانەوە**. بەرگی هەشتەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل: ٣١٦ .

بايشان انتقال داد.

ومستأنفا جمعا بين الفريقين مسلوكا في كل من الطريقين، عين ونفع تمام مبيعات را، بالطوع والاختيار، غب اين معامله را- بالغا ما بلغ- در مقابل مبلغ مرقوم، ويك من نبات مصالحهء صحيحهء شرعيهء جامعة الشرايط والاركان خالية عن موجبات الخلل والنقصان والبطلان نمود، وجناب مشترى فورا پذيرفت وقبول كرد.

وتأسيا عين ونفع هريك از مبيعات فوق را، خالصا لوجه الله واتباعا لمرضاته، جناب مشترى معزى اليه نذر تبرر قربى خالى از شائبهء لجاج، وعالى از رائحه ومخامرهء فساد وعناد واعوجاج نمود. وهبه شرعيه مقرونه باذن جديد در تصرف عين ونفع، واعارهء مرعيهء مصحوبه به نذر عدم استرداد با مراعاة اجرة المثل زمان تصرف بايشان انتقال عينى وغبنى ونفعى داد و... صيغ ناقله، وعقود مجوزه ومنفذهء شرعيه، وقيود مخصصه ومعتبره فقهيهء مرعيهء مليهء اسلاميهء وارده بر عين ومنافع بجناب مشترى انتقال واختصاص داد، وصيغ مشروحه را طرفين، عربيةً وعجميةً، بزبان جارى وطارى نمودند، وسركار محمود خان ضامن شد بضمان الدرك شرعى: (لو خرجت المبيعات المرقومة كلا او جزءً، عينا ام نفعا، ملكا ومستحقا للغير فعليه: اما بتخليص المثمن، او رد الثمن، مع غرم الخسارات الواردة على المشتري في المشترى).

ومجددا متلفظ شد بآنكه چنانچه من بعد احدى از اقارب واجانب، از جانب او بمقام ادعاى مبيعات برايد، وضرورى وارد بياورد، علاوهء استخلاص مثمن وغرم خسارات معادل قيمت مرقومهء حاليه از مال خود مجانا بجناب مشترى معزى اليه نذرا صحيحا شرعيا برساند.

فعلى المراتب المرقومة: تمامى وهمگى قراء وقشلاقات مشروحه ومفصلهء فوق با كافهء توابع، وعامهء لواحق، هريك از آنها آنچه بسهم الارث سركار محمود خان مشخص گشته ودر تصرف داشته- بدون الاستثناء- ملك حق وحق طلق اكتسابى جناب جلالتمآب سليمان خان شرف الملك است، محمود خان وعلى اعلى خان ياور، وساير وراث مرحوم شرف الملك را در آن، وجها من الوجوه، حقى وحظى ونصيبى باقى نمانده ونيست، بلكه تمام مبيعات مشروحه كه عبارت است از سه دانگ روانسر وقشلاقات وسمنگان وقشلاقات، وششدانگ عمارت گرمخانى، وآنچه سهم سركار محمود خان است، بدون اخراج شيء منها، ملك حق جناب جلالتمآب سليمان خان شرف الملك است. وضميمهء باقى املاك موروثى ومكتسبى ايشان ميباشد. (فله ان يتصرف فيها كتصرفه في باقيها). كان وقوع هذه المعاملة المسعودة والمبايعة المحمودة في العشر الخامس، من الثلث الثاني، من السدس السادس، من النصف الثاني، من العشر السابع، من العشرة الثانية، من المائة الرابعة، من الالف الثاني، من هجرة من نزلت عليه السبع المثاني. اعني پانزدهم شهر ذى الحجة الحرام (بيجقان شد!) ١٣١٧ سنه مسعوده يكهزارو سيصدو هفده هجرى نبوى عليه وعلى آله الاف الصلاة والسلام ورحمة الله وبركاته.

[يا محمود]

ئەو مۆرانەی کە بەم بەڵگەنامەوەن و پێی مۆر کراون:

١- مراتب مبايعهء ومعاملهء مسطورهء متن را مستحضر ومطلع است، وصح وبيان واقع است، وحق بمركز جاگرفته- ان شاء الله- مبارك است، العبد الاقل (مشيرديوان)[١].

٢- مراتب مشروحهء متن گذشته مبارك است ان شاء الله. الاقل آصف ديوان.

٣- هو الله تعالى.. مراتب مسطور در متن جريان يافته بيان واقع وصحيح است، خدا مبارك فرمايد. العبد الاقل (اعزاز الملك)[٢].

٤- مراتب مسطورهء متن بيان واقع وصحيح وان شاء الله مبارك است.
الاقل شجاع لشكر.[٣] ضيا ديوان .

٥- هر حق وادعائى در خرم آباد وزين چقا داشتم... جلالتمآب عالى آقاى شرف الملك- دام اجلاله- نذر تبرر شرعى نمودم، ان شاء الله تعالى مبارك است. (لا اله الا الله الملك الحق المبين... عبده أمان الله)[٤].

٦- مراتب مسطورهء متن را اطلاع دارم، صحيح ومعتبر وبيان واقع است. ان شاء الله مبارك است. العبد الاقل (صديق ديوان).

٧- حقير حضور داشته اقرار واعتراف بمراتب مسطورهء مفصلهء مشروحهء متن- كما رقم- واجراى صيغه ومصالحه واخذ ثمن از سركار محمودخان ابتياع نموده، صحيح است، ان شاء الله مبارك است.        الحقير الحاج اعتماد الرعايا.

٨- مراتب مسطورة ومبايعهء مرقومه در متن جريان يافته إن شاء الله مبارك است. الحقير (معتمد)[٥].

٩- برادر مهربان محمود خان [به تفصيل!] ومبايعه متن اعتراف نمودند، صحيح وبيان واقع ومبارك است. الاقل (على اوسط بن على اكبر)[٦].

١٠- از تفصيل مبايعهء متن مطلع ومستحضرم صحيح وبيان واقع است. واخذ تمام قيمت را سركار محمود خان نمودند الاقل (امين الديوان)[٧].

هو الله

١١- مراتب مسطورهء متن        مطابق حق وبيان واقع. وان شاء الله مبارك است، أقل عبادالله

---

(١) موشیر دیوان: لە پیاوە گەورەکانی شاری سنە بووە.

(٢) ئیعزازولمولک: لە پیاوە گەورە و ناودارەکانی سنە بووە.

(٣) شوجاع لەشکریش: لە پیاوە ناسراو و ناودارەکانی شاری سنە بووە.

(٤) مەبەست ئەمانوڵڵاخانی والی ئەردەڵانە.

(٥) موعتەمەدیش لە کەسایەتییە ناسراوەکانی شاری سنە بووە.

(٦) عەلی ئەوسەط کوڕی عەلی ئەکبەر خانی شەرەفولمولک بووە.

(٧) ئەمین دیوانیش لە پیاوە ناسراوەکانی شاری سنە بووە.

(امين ديوان).

١٢ و١٣- مراتب مسطورهء متن جريان يافته، صحيح وبيان واقع است.

(حبيب الله بن عبدالله). و (هو الله تعالى العزيز)

١٤- مراتب مسطورهء متن صحيح است. (شرف الدولة).

١٥- حقير حضور داشته اقرار واعتراف بمراتب مسطورهء مفصلهء مشروحهء متن كما رقم، واجراى صيغه ومصالحه واخذ ثمن در سركار محمود خان ابتياع نموده صحيح است. ان شاء الله مبارك است. اقل الحاج (على اكبر).

١٦ و١٧ - مراتب مسطورهء متن جريان يافته وصحيح است. العبد الاقل (حسن) و (نواب).

١٨- مراتب مسطورهء قباله صح است، اميدوارم خداى تعالى مبارك كند بدوام عمر وعزت دنيا وآخرت. الفقير (شكرتو لله!).

١٩- وقعت المبايعة والمعاملة من البايع بالطوع والرغبة والاختيار، مع اجراء جميع الصيغ المنقولة منه، واخذ تمام الثمن باطلاع واستحضار من الحقير الاقل (عبدالرحمن)[١].

٢٠- مراتب مسطورهء قباله صحيح است وبيان واقع است، وصيغ بيع ونذور ومصالحه وساير عقود مشروحه را جارى، وتمام هيجده هزارو هفتصد تومان قيمت را اخذ ودريافت نمودام. ان شاء الله مبارك است. (يا محمود).

٢١- مراتب مسطورهء متن جريان يافته صحيح است. ان شاء الله مبارك است. العبد الاحقر (عبدُه الراجى على اصغر)[٢].

٢٢- وقعت العقود المشروحة المشروعة بحذافيرها، واخذت النقود المرقومة الى آخر دنانيرها. حرره (عبدالعزيز الحسيني).

٢٣- وقوع المعاملة من البايع الطايع للمشترى امتثالا لمدلول: (هذه بضاعتنا ردت إلينا) صحيح لا سترة فيه. بارك الله لهما حرره الفقير (على بن حسين).

٢٤- وقع الامر حسبما شرح في بسط القبالة الطويلة المقالة. العبد الأقل. (يأتي من بعدى اسمه احمد).

٢٥- وقعت العقود الشرعية المرعية وفقما شرح فيه مع قبض الثمن المعلوم. حرره الفقير (قطب الدين الحسينى).

٢٦ و٢٧ - مراتب مرقومهء متن صحيح است (ظفر الملك)، (خان خانان).

٢٩- قد وقعت المبايعة الشرعية، والمناذرة المرعية، بعد وجود ما يجوزها مع قبض تمام الثمن المسمى في العقد، حرره الداعى الجانى في شهر ذى الحجة ١٣١٧ (عبدالرزاق خلف احمد آل نبي).

---

(١) لەوانەيە ئەو عەبدوڕەحمانە ماموٚستا مەلا عەبدوڕەحمانى قازيى جوانڕوٚ بێت.

(٢) عەلى ئەسغەر كوڕى عەلى ئەكبەرى شەرەفولولك بووە.

٣٠- وقع وجرى جميع المراتب المفصلة المدونة في تلك القبالة الصحيحة الصريحة الشرعية وفقما شرح وبسط مع قبض الثمن المسمى. حرره الداعى الحقير (الراجى حسين بن احمد).

٣١- باسم الله أشرف الاسماء. قد وقعت العقود الصحيحة الشرعية، وجرت الصيغ الصريحة المرعية، حسبما ذكر وبسط وفصل في المتن، مع قبض تمام الثمن المسمى في العقد لدى الداعي الجانى (الراجى عبدالرحيم بن حسن).

## بەڵگەنامەی سێیەم

٥٧٧

بەپێی بەڵگەنامەی سێیەم محەمەد جەعفەر خانی کوڕی محەمەد سادق خان دوو دانگ لە شەش دانگی گوندی (تەمتەم)ی سەر بە ناوچەی جوانڕۆی فرۆشتووە بە گوڵشەن خانمی دایکی عەلی ئەکبەر خان بە مەبلەغی ٢٧٠ تمەن. ئەم کڕین و فرۆشتنە لە ساڵی ١٢٨٠ک بووە.

ئەم بەڵگەنامەیش شایەتی و مۆری ٣٠ کەس لە زانا و گەورە و ناودارانی ئەو سەردەمەی پێوەیە، کە دەقی شایەتییەکان و مۆرەکانیان- چەندم بۆ خوێندرابێتەوە- تێیدایە.

بسم الله اشرف الاسماء

لك الحمد يا ذا الجود والمجد والعلى. تباركت تعطي من تشاء وتمنع،

فصل على احمد مادمت معطيا،  وناجاك أخيار ببابك ركع.

بعد اهداء الحمد والصلاة على اشرف الموجودات: سبب غوطهء غواص قلم، در دريای دوات سياهی توأم، وباعث كرّ وفرّ او در ميدان صحيفهء سعادت رقم: آنكه بفروخت در حالت صحت بدن، وسلامت حواس، ونفوذ اقارير، وجواز تصرفات شرعيه، عالما عامدا مختارا، لا جاهلا او ساهيا او مجبورا، بعد از تقليد امام اعظم- رحمه الله- در جواز رجوع از وقف موقوفات، واسناد ملكيت مبيعه در حين اجرای صيغهء بما يعلم، بنفس خود عاليجاه، رفيع جايگاه، محمد جعفر خان، خلف الصدق، مرحوم محمد صادق خان- غفر له- دو دانگ تام از شش دانگ مشاع قريهء (تم تم) واقعه در خاك جوانرود را، بعليا جاه، عفت وعصمت پناه، افتخار النسوان، خاتون (گلشن) مادر عاليجاه معلی جايگاه، عمدة الخوانين العظام (علی اكبر خان) صان الله عن طروق الحدثان، بمبلغ معين، وثمن مبين، مبلغ دويستُ هفتاد تومان نقد فضی مسكوك رائج دار الخلافة طهران، بمبايعهء صحيحهء صريحهء مشتملة بر ايجاب وقبول وقبض اقباض وتسليم وتسلم، ورؤيهء كافيهء معتبره قبل العقد، حسبما يقتضيه الشرع القويم والمنهج المستقيم.

وثانيا مستأنفا عاليجاه بايع، تمامی دو دانگ مسفوره را مسندا لملكيتهما الی نفسه، مع ما يتعلق بهما، در مقابل مبلغ مزبور الی انقضای مدهء دويست سال تام شمسی، بعليا جاه مشتريهء معزو إليها اجاره داد، ومنافع دويست سالهء آن را باو نذر نمود.

بناء على المراتب المرقومة: بعد اليوم دو دانگ تام قريهء مزبوره، با دو دانگ ما يسند إليها من المزارع والمراتع والمرابع والمعالف، والجبال والتلال، والاشجار والاحجار، والقنوات والعيون والانهار والطواحين، ومحالها، وغير ما ذكر، مما لم يذكر، ملك حق وحق خالص طلق عليا جاه مشتريهء معزو إليها است، والی انقضای مدهء دويست سال در اجارهء اوست، ومنافع دويست سالهء آن اختصاص بأو دارد، وعاليجاه بايع در هر عقدی از عقود مسفوره ضامن درك است: كه (لو خرجت المبيعة المؤجرة ملكا ومستحقا للغير فعليه بردّ الثمن، او مال الاجارة، او تخليص المثمن.) وبعد جريان

العقود المرقومة صيغهء مصالحهء غبن وغبن الغبن، ولو كان فاحشا، بين المتعاقدين كما قررت في المذهب جارى شد. فللمشترية المعزو إليها التصرف فيها بعد اليوم كما تريد وتشاء.

جرى ذلك في شهر شوال المكرم في سنة ١٢٨٠ (يا امام جعفر صادق)

**مۆرەكان:**

١- سمعت المراتب المسطورة في المتن عن عاليجاه محمد جعفر خان كما سطر الداعي. (عبده محمود).

٢- وضح وصح ما رقم. الحقير (يا هادي).

٣- استحضرت تصرف وكيل المشترية بإذن البائع ورضائه. وسمعت الاشتراء بطريق الاستفاضة فمهرته. الاقل محمد القاضي بجوانرود. (محمد).

٤- مراتب مسطورهء متن استماع گرديد. الداعي الفاوجي المعاذي. (يا محمد).

٥- از قبله گاهى من جعفر خان مراتب مسطورهء متن را اقرار شنيدم. الحقير الاثيم (عباس ابن عبدالكريم).

٦- مراتب مسطورهء متن صحيح است، وخلاف ندارد. العبد الاقل (لا اله الا الله الملك الحق المبين عبده محمد يوسف).

٧- مراتب مسطورهء متن صحيح وبيان واقع است. الحقير ابن ميرزا محمد رضا (لا اله الا الله الملك الحق المبين عبده محمد يوسف).

٨- به جميع صيغهء ناقلهء شرعيهء مسطورهء متن نقل نمودام. اقل خلق الله (يا امام جعفر صادق).

٩- از محمد جعفر خان شنيدم: دو دانگ قريهء (تم تم) حصهء خودرا، بعصمت پناه خاتون گلشن، بمبلغ دوصدو هفتاد تومان فروختم. الحقير نورالله طالشى. (به بێ مۆر).

١٠- مراتب محررهء مسطورهء صحيح است. كلانتر (عبده محمد قاسم).

١١- مراتب مسطورهء متن صحيح وبيان واقع است، الاقل (فرج الله).

١٢- مراتب مسطورهء متن صحيح وبيان واقع است (يا موسى كليم الله ومعى هستى فرد!)

١٣- مراتب مسطورهء متن بيان واقع وصحيح است. الاقل (محمد ابن رضا ابن محمد صادق).

١٤- حكم اهالى شرع مطاع صحيح است. الوالى ابن الوالى ابن الوالى ضياء الملك (امان الله ضياء الملك ).

١٥- بسم الله اشرف الاسماء.. جرت المراتب المفصلة الصحيحة الشرعية بالتفاصيل المرقومة في المتن. الداعي امام الجمعة والخطيب (عبده عبدالمؤمن).

١٦- جرت المراتب المشروحة حسبما فصل. الداعى (احمد الله على كل حال)[١].

---

(١) ئەمە مۆری مامۆستا مەلا ئەحمەدی کلاشی- ناسراو بە مەلا باشی- یە کە خەڵکی کلاشی باباجانیی جوانرۆ بووە، پیاوێکی زانا و شاعیر و قسە خۆش و بە توانا و لێهاتوو بووە. ماوەیەکی زۆر لەلای =

١٧- وقع ما وقع والخير فيما وقع. الداعى (عبده محمود).

١٨- مراتب مضمون متن مسطور از سركار محمد جعفر خان استماع نمودم (حاج عبدالكريم ابن الحاج محمد).

٢/١٨- مراتب مرقومهء، حسبما فصل، صورت جريان پذيرفته. الداعى (على بن اسماعيل).

١٩- مراتب مرقومه مطلع ومخبرم. الحقير (عبده الراجى سلطان ولد).

٢٠- جرت العقود الشرعية الصحيحة حسبما زبر في المتن. الداعي (اللهم صل على محمد وآل محمد).

٢١- جرت المراتب المشروحة الصحيحة الممضاة. الداعي (حسن الحسيني).

٢٢- مراتب مرقومه بيان واقع است. حرره الداعي (عبده الراجى محمدامين).

٢٣ و ٢٤و ٢٥- مراتب مرقومه صحيح وبيان واقع است. (الداعى لدوام الدولة القاهرة يوسف. محمد الحسينى. المذنب الراجى على).

٢٦- بسم الله اشرف الاسماء. جرت المراتب المشروحة من العقود المشروعة، وامضاها مراعيا للشرائط حسبما قرر في الفقه، الداعى الجانى (محمد ابن امام الدين). ١٢٨٠ .

٢٧- مراتب مسطوره، حسبما سطر، صورت جريان يافته. الداعى الجانى (عبده الراجى فتح الله).

٢٨- صح ما زبر حسبما رقم. الداعى (لطف الله ابن فتح الله).

٢٩ و٣٠- (يا امام صادق).

---

=فەرمانڕەوایانی ئەردەڵان - بەتایبەتی عەلی ئەکبەر خانی شەرەفولمولک- جێگەی ڕێز و متمانە بووە و، کارگەلی گەورەی پێ سپێرراوە. لە تەک کەیفی جوانڕۆییدا بە نامە شیعریان بۆ یەکتر ناردووە. شیعری پەند و ئامۆژگاری هەبووە.

تا سەرەتای سەدەی چواردەی کۆچی لە ژیاندا بووە.

مۆرەکەی وەک لە سەرەوە نووسیمان (الحمد لله علی کل حال) بووە.

(بڕوانە: مشاهیر کرد ٢/٥٤ .)

# شیوەنێک بۆ کۆڕی زانیاریی کورد(*)

٥٧٨

**وتەیەکی کورت**

کە باسی کۆڕی زانیاریی کورد دەکەم وا بۆ باسەکەم مەڕوانن کە بڵێم کۆڕی زانیاریی کورد لایەنی باشەی نەبووە و هەموو کارەکانی خراپ بوون. بەڵکو دەڵێم: کۆڕی زانیاریی کورد ئەو دەستکەوتە مەزنەی گەلی کورد بوو کە بەری شۆڕش و بەهای خوێنی هەزاران لاوی خوێنگەرمی کورد بە دەستی هێنا. ئەو دەستکەوتەی کە هەموو شەڕ و تاڵییەکانی دوای بەیانی ئازاریش نەیانتوانی بیسڕنەوە و لەناوی بەرن. ئەگەر بڵێم: بەردی بناخەی بزووتنەوەیەکی بە گوڕ و تینی رۆشنبیری کوردی جارێکی تر لە تەلار و ساختمانی ئەو کۆڕەدا دانرا رەنگە زۆر نەڕۆیشتبێتم.

بەڵام مەبەستم ئەوەیە لایەنە لاواز و کەموکووڕییەکانی کۆڕ دەستنیشان بکەم کە نەدەبوو وابن و، دەبوو زۆر شکۆدارتر بووایەت و، دەبوو ئەو دەستکەوتە مەزنە بە ئەندازەی مەزنییەکەی کاری گەورەی بۆ بکرایە.

کە ساڵی ١٩٧٠ کۆڕی زانیاریی کورد لە بەغدا، وەک یەکێک لە بەرە شیرین و بەتامەکانی شۆڕشی گەلی کورد، دامەزرا، رۆشنبیران و دڵسۆزانی رۆشنبیریی کورد ئەم رووداوەیان بە ئاواتی هاتوەدیی یەدان ساڵەی هەموو کوردێک دانا و، هەر رۆشنبیرێک لە عاستی خۆیەوە وەک کۆرپەی ئاواتی چەندان ساڵەی دوای دەیان کۆشش و دوعا و نزا و قازیی بەنێ. لەدایک بووبێ ئاوا پێشوازییان لە رووداوەکە کرد و، هەر کەس لەلای خۆیەوە گەنجینەی دێرینی باو و باپیرانی کردەوە و، دەستی برد نایابترین و بەنرخترین پارچەی کولتوور و کەلەپووری سەدان ساڵی بنەماڵەکەی دەرهێنا و، بە خۆشحاڵی و شانازییەوە بەپێی خۆی بەرەو بەغدای پایتەختی برد و، لەوێ کردی بە پۆیلانەی (کۆرپەی ئاواتی کورد).

ئەگەر بڵێین: وەک لێزمە بارانی بەهار خەڵات و بەراتی دڵسۆزانی کورد لە دەرەوە و ناوەوەی وڵات بەسەر (کۆڕی زانیاریی کورد)دا باری بە لاتەوە سەیر نەبێ و، ئەگەر بڵێین: خەرمانی پۆیلانەی (کۆرپەی ئاواتی کورد) بە چەندان سەپانی کارامە و، وەرزێری دنیادیدە و دڵسۆز نەدەهاتە ناو و سوور نەدەکرا، کەممان گوتووە. بەڵام ئەو خەرمانە چی بەسەرهات؟ بەری رەنجی باو و باپیران کە خۆی لە دیاریی دەستی نەوەکانیاندا بۆ کۆڕ دەدییەوە، بە چ جۆرێ چاودێریی لێ

---

(*) لە سیمینارێکدا ئێوارەی ٢٠٠٩/١/١٨ لە ئەکادیمیای کوردی خوێندمەوە. دواتریش لە ژمارەکانی: ٣٠٨٤، ٣٠٩٠ی رۆژنامەی خەباتدا بڵاو بووەوە.

کرا و بەرهەم هێنرا؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەم چەند دێرە بۆ مێژوو دەنووسم. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە من هەموو شت دەزانم، وەک مانای ئەوەیش نییە هەرچی دەزانم دەتوانم بینووسم.

لە جێگەی داخی گەورەوە دەست پێ دەکەم، کە ئەوەیە ئەو دڵسۆزییەی ڕۆشنبیرانی کورد و ئەو هیوای ئەوان بە کۆڕ و کارمەندانی کۆڕیان بوو لە جێگەی خۆیدا نەبوو. ئەوەی ئەوان لە دوورەوە دەیانبینی و گومانیان وابوو کانگای پیاوی کارامە و دڵسۆز و لێهاتوو و خەمخۆری سامانی دێرینی کولتوور و کەلەپووری ئاینی و ڕۆشنبیریی کوردە، وا نەبوو. مەبەستم ئەوە نییە کەسێک یان کەسانێک تاوانبار بکەم، وەک گوتم دەمەوێ بۆ مێژوو ڕووی شاراوەی چەند شتێک هەڵبماڵم کە من ئاگام لێیانە و، کەمێک لە قەوارەی ئەو زیانە گەورە دەربخەم کە لە مێژووی کەلەپووری کورد کەوتووە. ئەوەیش کە هانی دام بۆ نووسینی ئەم کورتە باسە هەواڵی دیمەنێک بوو کە دەکرێ بە دوا تابلۆی ئاگر تێبەردانی سامانی کەلەپووری کورد دابنرێت، وەک لەمەودوا باسی دەکەم.

**ئەم زیانانە چۆن لە کورد کەوتن؟**

وەک گوتم ڕۆشنبیران و دڵسۆزانی کورد وەک لێزمەی بارانی بەهار کۆڕیەی ئاواتی کوردیان بە نایابترین بەرهەمی باو و باپیران پۆیلانە کرد، بەڵام ئەو بەرهەمانە دەست پیاوی شارەزا و دڵسۆز نەکەوتن و، کارێکیان بۆ نەکرا کە شیاویان بێت.

بەپێی بۆچوونی من و، وەک ئەوەیش کە شوێنگەل و کارگەلی ئاوا پەیرەو کراوە و دەبێ هەمیشەیش پەیڕەو بکرێت، دەبوو:

هەر بەڕێزێک شتێ یان شتگەلێکی بە بایەخی دەکرد بە پۆیلانەی کۆڕ، ئەو شتانەی بەهۆی لێژنەیەکەوە لێ وەربگیرایەت و، بە ناوی خاوەنەکەیەوە تۆمار بکرایەت و، لە دەفتەر (سجلی)ێکی تایبەتیدا تۆمار بکرایەت و، بە درێژیی باسی بکرایە، شتەکە چییە؟ چۆنە؟ قەوارەی چەندە؟ چەند لاپەڕەیە؟ کەی نووسراوەتەوە؟ کێ نووسیویەتییەوە؟ چەندان شتی تریش کە ببوایەن بە پێناسەیەکی تایبەتیی بۆ ئەو شتە و، وەها بناسێنرایەت کە هەرگیز لە تەک شتگەلی تردا نەگۆڕێت و، دواتر ئەمانە هەموویان لە (ئەندکس)ی کتێبخانەی کۆڕدا بە چەند نوسخە و دانە هەڵبگیرایەن و، بەرهەمە کەلەپوورییەکانیش لە کتێبخانەی کۆڕدا لە جێگەی پاک و دوور لە مەترسیدا بپارێزرایەن و، پاش ئەمانەیش ناوبەناو ئەو شتە پێشکێشکراوانە بە درێژیی، یان لە گۆڤاری کۆڕدا، یان لە نامیلکەی سەربەخۆدا لەسەریان بنووسرایە و، بەمەیش خاوەنەکانیشیان و جەماوەری کوردیش لە بەخشندەییی ڕۆشنبیران و دڵسۆزانی کورد و کۆڕی زانیاریی کورد ئاگەدار دەبوون، بەمەیش تۆماری شەرەف و ڕێز بۆ هەردوو لا پارێزراو دەبوو، دەبوو بە بنەمایەک بۆ چاولێکەری و شوێنپێ هەڵگرتنی ڕێبوارانی سەر ڕێگەی ئەو قۆناخەی کاروانی گەشەپێکردنی پاراستنی سامانی کەلەپووری نەتەوایەتی. بەڵام سەد مخابن! ئەم کارە ئەنجام نەدراوە، ئەو دیارییە بێ وێنانە چۆن دەهاتن وەها دەدرانە دەست چارەنووسی نادیار و، کەسان و دڵسۆزانی ڕاستەقینە نەبوون لێیان بپێچنەوە و لەسەریان هەڵبدەنێ و، هەوڵ بۆ پاراستن و بڵاوکردنەوە و

بووژاندنەوەیان بدەن.

ئەوەی من ئاگەداربم کارێکی کەم لەو بوارەدا کرا، ئەویش پاش چەند ساڵێک لە تەمەنی کۆڕ و، پاش ئەوەی گەلێ شتی بە بایەخ لە سامانی کەلەپووری کە بە دیاری بۆ کۆڕ هاتبوون بەڵگوین کرابوون، بە بڕیارێک من و خوالێخۆشبوو کاک فاتیحی مامۆستا مەلا کەریم دیاری کراین بۆ ماوەیەک کە دەستخەتەکانی کۆڕی زانیاریی کورد تۆمار بکەین و، ناو و بابەت و بەشیان جیا بکەینەوە. ئێمە کارەکەمان ئەنجام دا، بەڵام هەر ئەو ئەنجامدانە بوو ئیتر هیچی تری بە شوێندا نەهات و، کاری تری بۆ نەکرا، وەختە بڵێم: ئەنجامی کارەکەی ئێمەیش بزر و شوێنەون کرا.

ئەگەر وا نەبووایە دەبوو هیچ نەبێ دوای ئەوە کەسێکی کارامە کتێبێکی لە بەرگێک یان چەند بەرگێکدا بە ناونیشانی (فهرست مخطوطات مكتبة المجمع العلمي الكردي) دابنایەت و، لە کتێبخانەی کۆڕدا بەشێکی تایبەتیی بکرایەتەوە، (قسم المخطوطات) یان ناوێکی وەهای لێ بنرایە و، دەستخەتەکانی بە جیا تێدا بپارێزرایەن و، لێکۆڵەران بیانزانیایە چی تێدایە و، هان بدرایەن و پشتگیریی بکرایەن بۆ لێکۆڵینەوە و بڵاوکردنەوەی شتە نایابەکانی. ئەمانە هیچیان نەبوون و، روویان نەدا و، ئێستا و ئەوسایش کەس نەیزانی چەند شتی نایاب پێشکێشی کۆڕی زانیاریی کورد کرا. بەشی دەستخەتەکان لەدایک نەبوو، ئاواتی نووسینێکی- با کورتیش بێت- لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری کۆڕ یان هەر چاپەمەنییەکی تر نەهاتە دی. ئەو هەموو شوێنەوارە نایابەی کەلەپووری کوردی وەک بەردی بنگۆم بێدەنگ و رەنگ کران. ئەمانە جگە لەوەی کە چەند گرووپ و لێژنە و کۆمەڵ پێکهێنران، ئەرکیان ئەوە بوو دەگەڕان بە گوند و لادێ و شوێنە چەپەک و دوورە دەستەکانی کوردستاندا، لە دەمی شوان و گاوان و سەپان و دنیادیدە و پیرەپیاوان و پیرەژنان... پەند و بەیت و باو و فۆلکلۆری کوردەوارییان بەدەنگی خۆیان لەسەر کاسێت تۆمار بکەن و، لەم بوارەیشدا لەو کاتەدا کە وڵات نەشێوابوو و، کوردستان وێران نەکرابوو، سامانێکی کەموێنە کۆکرایەوە، ئەمانەیش هەموو هەروا کران بە گەرووی ئەو ئاشە بێ ئاشەوانەدا و، هەر کەس دەستی بەهەرچیدا دەگەیشت بۆ خۆی دەیبرد و کەس نەبوو بڵێ بۆ وا دەکەیت؟

رەنگە ئەو قسانەم لای گەلێ کەس لێ وەرنەگیرێت و بە تۆمەتی گەورە و ناڕەوای بدەنە قەڵەم. بەڵام دەڵێین: ئەی ئەو دەیان کاسێت و نووسراو و کەرەستە فۆلکلۆرییانە چییان بەسەر هات؟.

جگە لەمانەیش و لەوانەیش - وەک لە ژمارەیەکی گۆڤاری کۆڕی زانیاریدا باسی کراوە- لە ناوەوە و لە دەرەوەی وڵاتەوە سەدان دانە کتێبی دەگمەن و نایاب بە گەلێ زمان لەلایەن رۆشنبیرانی کورد و بیانییەوە پێشکێشی کۆڕی زانیاریی کورد کران، ئەمانەیش، هەرچەند زۆریان تۆمار کران و لە کتێبخانەی کۆڕی زانیاریی کورددا پارێزران، کەمتەرخەمیکردن لە عاستیاندا زۆریانی کرد بە گەرووی پیاوانی کتێبخۆردا و[1]، دوای دەرچوونی دەیان دانەی نایابیان بە ناوی

---

(١) یەکێک لەوانەی کە - من بزانم- لە هەموو کورددا کەس نەبووە بە قەد ئەو دەستخەتی خۆشویستبێت، کە کتێبی نایابی کردووە بە پۆیلانەی کۆڕی زانیاریی کورد، مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ بوو -خوا لێی خۆشبێت- ئەم مامۆستا گەڕاوە بە کتێبخانەکەیدا کۆنترین و نایابترین دەستخەتی کتێبخانەی =

(استعاره- خواستن)هوه، لهلایهن ئهندامانی کۆڕ و کهسانی ترهوه، جارێکی تر نهگهیشتنهوه شوێنهکانی خۆیان لهسهر رهفهکانی کتێبخانهی کۆڕی زانیاریی کورد.

جگه لهوهیش گهلێک لهو کتێبه دهگمهن و نایابانه که له دڵسۆزانهوه پێشکێش به کتێبخانهی کۆڕی زانیاریی کورد کرابوون، یان ههر تۆمار نهکرابوون، یان دوای مۆرکردنیان به مۆری کتێبخانه و پێش تۆمارکردنیان، بۆ ماستاوکردن و خۆبردنه پێشهوه لای ئهم و ئهو، لهلایهن بهرپرسی کتێبخانهوه برابوونه دهرهوه و، کرابوون به دیاریی بۆ کهسانێک که نه پێیان رهوا بوو نه شایستهی ئهوه بوون.

ههروهک نموونه دهیهێنمهوه یهکێک لهو کتێبه نایابانه نامیلکهیهکی بچکۆلهیه به ناونیشانی (کردستان- او بلاد الأکراد) دانراوی (یوسف ملك) که یهکێکه لهو کتێبه دێرینانهی به شێوهیهکی جوان و باش باسی کوردستان دهکهن، پاش ئهوهی لهلای کوردێک یان دۆستێکی کوردهوه گهیشتووهته کۆڕی زانیاریی، بهرپرسی کتێبخانهکه، پێش ئهوهی بێڵێ جێگهی خۆی بگرێت، بردبووی پێشکێشی جێگری وهزیرێکی کردبوو، که ئهو جێگره کورد بوو، ئهمیش لای ئهو خۆی بردبووه پێشهوه، جێگرهکه دیارییهکهی ئهوی نهدابووه دواوه و دڵی نهشکاندبوو، بهڵام به رێکهوت پاش ماوهیهک دوای ئهو رێگهم کهوته لای ئهو جێگره و، دهیزانی من بایهخ بهو شتانه دهدهم، دهستی برد له چهکمهجهی مێزهکهی ئهو کتێبهی دهرهێنا و وتی: ئهمه بۆ تۆ باشه و من نامهوێ. لهو کاتهوه تا ئێستهنزیکهی ۳۰ ساڵه ئهو کتێبهم وهک خۆی پاراستووه و، ناو و ئیمزای پێشکێشکهر و پێشکێشکراوی پێوهیه.

ههر له تاوهۆی تۆمارکردنی دهستخهتهکانی کۆڕدا بوو رێگهم کهوته (مدیریة الآثار العامة) بهشی دهستخهتهکان و، که چوومه ژووری بهڕێوهبهر چاوم به نزیکهی ده دهستخهتدا ههڵتۆقی، ههر له دوورهوه سهرنجیان راکێشام و، بهڕێوهبهریش که ئهو سهردهمه (اسامة النقشبندي) بوو وتی: ئهمانه دهستخهتن! کۆمهڵهکهی ئێوهیش – مهبهستی مامۆستا و قوتابیانی کورد بوو-

---

= خۆی که (الموطأ)ی ئیمامی مالیک بووه و تهمهنی نزیکهی ۸۰۰ ساڵ بووه پێشکێشی کۆڕی کردووه. ئهم ههواڵه له ژماره یهکی گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورددا بڵاو کراوهتهوه.

بهڵام ئهم دهستخهته چی بهسهر هات؟ دوکتۆر خالیدی کوڕی مامۆستای خاڵ بۆی گێڕامهوه وتی: دوای ئهوهی باوکی کتێبهکهی پێشکێشی کۆڕ کرد (۲٤) سهعاتی بهسهردا تێ نهپهڕی ئهو کتێبه نایابه بێ وێنه دزرا! دوکتۆر خالید دهڵێ: باوکم تا شهش مانگیش دوای ئهوه خهریک بوو شێت ببێت؛ لهپڕ شهو لهخۆیهوه ههڵدهستا و دهگهڕا و هاواری دهکرد.

عهباس عهزاوی یهکێک لهوانهی خاوهنی نایابترین کتێبخانهی دهستخهت بوو له (شرق الاوسط)دا، نهیدههێشت کهس دهستخهتی ببینێ، هاتبوو دهستخهتی (سلسلة الذهب) که بۆ کورد قیمهتی ههر تهواو نابێ- به خهڵات دابوو به کۆڕی زانیاری کورد، بهڵام بهرپرسێکی کۆڕی زانیاریی بێ ئهوهی ئهمه به خیانهت بزانێ دابووی به زهلامێک له بنهماڵهی ئیبنوئادهم و دواییش دهستخهتهکه سهری تێداچوو.

مامۆستا فوئاد عارف قورئانێکی نایابی دهستخهتی شێخ ئیسماعیلی کونهکۆتری باپیره گهورهی کردبوو بهدیاریی کۆڕ ئهمیش بێ سهروشوێنه...!

دەستخەتمان بۆ دێنن؟.

کە زیاتر لە دەستخەتەکان نزیک بوومەوە و ئەمدیوە و دیوێکم کردن گومانم لەوەدا نەما کە دەستخەتی کۆڕی زانیاریی کوردن و، داوای مۆڵەتم لە مامۆستا ئوسامەی بەڕێوەبەر کرد و تەلەفۆنم بۆ کۆڕ کرد و، ئاگەدارم کردن کە کۆمەڵێک دەستخەت لێرەیە، من بە دەستخەتی کۆڕیان دەزانم. پاش ئەوە لە کۆڕەوە دوو کەسیان نارد و دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە، دوایی دەرکەوت دەستخەتەکان لە ڕێگەی بەرپرسی کتێبخانەی کۆڕی زانیاریی کوردەوە- بۆ شوێنە ونی- دراون بە ئافرەتێک کە بیانفرۆشێ بەو کتێبخانە.

ئەوە بوو دواتر بەرپرسی کتێبخانە گیرا و درا بە دادگە و، زۆریشی پێ نەچوو رزگار کرا و! دەستخەتەکان گێڕرانەوە بۆ کتێبخانەی کۆڕی زانیاریی کورد.

دەبێ لێرەدا ئەوەندە بڵێم: ئەو دەستخەتانە بەشێک بوون لە دەستخەتەکانی کتێبخانەی خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی، کە لە ڕێگەی سامی خوندەوە پێشکێشی کردبوون بە کتێبخانەی کۆڕی زانیاریی کورد و، ئەو دەستخەتانە لە نایابیدا کەموێنە بوون و، بە جوانترین شێوە بەشی زۆریان نوێ کرابوونەوە و، بەرگی نایابیان - هەموویان لای یەک بەرگتێگر- تێ گیرابوو، هەر ئەوەیش بوو وای کرد بە یەکەم چاوپێکەوتن من ناسیمنەوە.

هەر لێرەدا دەبێ ئەوەیش بڵێم: ئەمانەی من دەیاننووسم سەرەمەقەست و سەرەبڕشتن و، بە ڕێککەوت ڕێگەم لێیان کەوتووە و بیستوومن و، بێگومان چەندان جۆرە کارەساتی وا بەسەر شوێنەوارە نایابەکانی کەلەپووریی و کولتوورییەکانی کوردا هاتوون و، کەس پێی نەزانیون و تۆمار نەکراون و، ئەو کەسانەیش ئەنجامیان داون وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون.

من لەو سەردەمانەدا هیچ پێوەندیەکی ڕەسمی و نیوە ڕەسمی و بەشداریم لە هیچ کاروبارێکی ناوەوە و دەرەوەی کوردا نەبووە و، وەک هەر ڕۆشنبیرێکی کورد بۆ کڕینی چاپەمەنی و شت سەردانی کۆڕم دەکرد.(١) کە ئەم کوتەڵ و شیوەنە بۆ ئەو سامانە نابە سامان چووە دەکەم بە ناچاریی دەبێ ناوی کەسانێکی زیندوو و مردوو بهێنم و، ناچارم لەمەودوا باسەکە بۆ لای ئەوانەم ڕادەکێشێت و، دەبێ تۆزێکیش بۆ هۆی ئەم کارەساتانە بگەڕێین.

هۆیەکی سەرەکیی ئەم کارەساتانە بایەخ نەدانی سەرۆک و بەرپرسانی ناو کۆڕی زانیاریی کورد بوو بە دەستخەت و کەلەپوور و، هەستنەکردنیان بوو بە بەرپرسیی لە عاستی ئەو ئەرکە مێژووییە و ئەو سامانە مشە و فرەدا، کە بێ ئەوەی ئەوان پێیەوە ماندوو بن، یان بۆی بگەڕێن، بە لافاو و لێشاو بەسەریاندا ڕژابوو.

وەک نموونە خوالێخۆشبوو مامۆستا مەسعوود محەمەد دەهێنمەوە کە خۆی کوڕە مەلا و، لە بنەماڵەیەکی پشتاوپشت مەلا زادەی ناوداری کوردستان کەوتبووەوە و، بەشێکی زۆری ژیانی - ویستبێتی یان نەیویستبێ- لەناو دەستخەت و دانراوی باو و باپیرانی خۆیدا بەسەر بردووە،

(١) تۆمارکردنی دەستخەتەکانیش لەلایەنی من و کاک فاتیحەوە بەرانبەر بە پاداشتێک بوو وەک کرێ دایان پێمان و لە ماوەی کەمتر لە مانگێکدا ئەنجامامان دا.

دەزانن ئەم مامۆستا چ بایەخێکی بەو دەستخەتانەی خودی بنەماڵەکەیان داوە و چۆن پارێزگاریی لێ دەکردن؟.

ئوسامە نەقشبەندی بۆی گێڕامەوە وتی: ڕۆژێک مەسعوود محەمەد هات بۆ لام وتی: وەرە دەستخەتەکانی کتێبخانەکەمان بێنە بۆ ئێرە. منیش وتم: باشە سوپاست دەکەم، ڕۆژێک دێم پێکەوە بچین بیانهێنین.

وتی- واتە مامۆستا مەسعوود-: من کاتم نییە و بۆم ناکرێت و ناونیشانت دەدەمێ خۆت بچۆ بیانهێنە! ئوسامە وتی: لەگەڵ کارمەندێکی دەسگاکەدا چووین دەستخەتەکانمان لەژێر تۆز و خۆڵ دەرهێنا و، لە گونیە و کارتۆن و سندووقدا بارمان کردن و هێنامانن.

لێرەدا بەسەر ئەوەیشدا ناڕۆم: بەهۆی ئەوەوە لەم ساڵانەی دواییدا و لە ساڵی ١٩٩١ بەدواوە لە (د. ع)دا کارم دەکرد و، لە نزیکەوە ئوسامەم دەناسی، گەلێ شتم لێ دیوە و بیستووە لەبارەی دەستخەت و شوێنەوارەکان.

یەکێک لەو شتە سامناکانەی لێم بیستووە و داوای لە خۆم کردووە، ئەوە بوو دەیگوت: لە سەرکردایەتییەوە خاترخۆ کراوم هەر دەستخەتێک زیانی بۆ بیروڕای حزب و ئاسایشی نەتەوەیی هەبێت بێ پرسکردن بە کەس و گەڕانەوە بۆ سەرەوە لەناوی بەرم! لەمانەیشدا بەزۆری دەستخەتەکانی سەر بە کورد و شیعەی دەگرتەوە و، سوپاس بۆ خوا ڕێگەم پێ نەدا - ئەوەی من ئاگەدار بم- پەڕەیەکی شرپیش چییە لەناوی بەرێ.

جا دەگەڕێمەوە بۆ لای دەستخەکانی مامۆستا مەسعوود و دەڵێم: دووگ بدرێتە دەست پشیلە دەبێ چۆنی بپارێزێ؟ ئوسامە و داروودەستەیەک کە خاوەنی ئەو بیرە شۆڤینییە بن دەبێ چ کارەساتێک بەسەر شوێنەواری ڕەسەنی کورددا بێنن؟ یان دەبێ ئوسامە بۆ سوودی تایبەتیی خۆی چەند دەستخەتی نایابی لەو سامانە وەلاوە نابێت و بۆ خۆی هەڵگرتبێت؟.

مامۆستا مەسعوود ئەو ماوەی سەرۆکی کۆڕی زانیاریی کورد بوو چی بۆ کەلەپووری کورد کرد؟

ئەوەی ئەو وەک حیکایەت لەسەر باو و باپیر و بنەماڵەی خۆیان بۆ حاجی قادریی کۆیی کرد، دەکرا لە قاڵبێکی زانستییانە و لە ڕێگەی دەستخەتەکانی ناو کۆڕەوە ئەنجام بدرایەت و، لەوەیش کەمتر و بەپێزتر و بەسوودتر دەبوو، ئەگەر بهاتایە - کەمێک خۆی ماندوو بکردایە- لە ڕێگەی دەستخەتەکانی بنەماڵەکەیانەوە - کە ئەو لە هەموو کەس چاکتر دەیزانی چییان تێدایە- مێژوویەکی بنەماڵەی جەلی بنووسیایە و، ئەو مێژووانەی لە کۆتایی و پەراوێزی دەستخەتەکانیانەوە بوون کۆی بکردایەنەوە و، بابەتبەندیی بکردایەن و، بڵاوی بکردایەنەوە چ کارێکی گەورەی بۆ خۆی و بنەماڵەکەی و مێژووی کورد ئەنجام دەدا؟.

یان بهاتایە وەک خوالێخۆشبوو مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ بۆ کتێبخانەکەی خۆی کرد، بیلبیۆگرافیای بۆ دەستخەتەکانی بنەماڵەکەی خۆیان بکردایە و، لە کتێبێکدا یان لە چەند بەرگێکی گۆڤاری کۆڕدا بڵاوی بکردایەتەوە، هیچ نەبێ ناوی دەستخەتەکانی بنەماڵەکەیانی بۆ دەپاراستین و، ئێستە دەمانزانی چییان بووە و چییان تێدا چووە.

هەر لە رووی بایەخ نەدان بە کەلەپووری کوردەوە دەڵێین: لەو سەردەمە زێڕینەی کۆڕی زانیاریی کورددا کۆڕ و چاپخانەی کۆڕ و دەرامەتی کۆڕ و کادرانی کۆڕ، بە کاری لاوەکیی واوە سەرگەرم کران دەبوو وا نەبووایە، ئەگەر لە بری ئەوانە لا لە کەلەپووری کورد بکرایەتەوە و، پەلاماری شتگەلی نزیکە بەڵا و بڵاونەکراوە بدرایەت ئێستە کار بەجۆرێکی تر دەبوو.

(توحفەی مظفریە) کە کاتی خۆی کۆکراوەتەوە و چاپ کراوە نەدەبوو ئەولەوییەتی بدرایەتێ. (دایك)ی مەکسیم گۆرکی چی وای لێ دەکات پێش دەیان و سەدان دەقی کۆنی رەسەنی کوردیی بکەوێ؟ هەروەها گەلێ کتێب و بابەتی تریش کە یان هەر کاری کۆڕ نەبوون و، نەدەبوو کۆڕیان پێوە خەریک بکرێ، یان نەدەبوو بایەخ و ئەولەوییەتیان بدرێتێ.

ئەندامەکانی کۆڕ و سەرۆکەکانیشی- بە زۆری- هەرکەس کاری بۆ خۆی دەکرد و، گونجان یان نەگونجانی کارەکەی لە تەک رەوتی کۆڕدا شتێکی تر بوو، وا دەبوو بە رێککەوت کاری فلان کەس یان فلان دوکتۆر کارێکی وا دەبوو لەگەڵ رێباز و خواستی کۆڕدا دەگونجا، وەک گەلێ جاریش وا نەدەبوو. پلان و نەخشە دانەنرا بۆ کاری گەورە و سەرەکی، یان پلان دادەنرا، بەڵام هەر بڕیار و مەرەکەبی سەر کاغەز دەبوو و بەس. بۆ نموونە بڕیار درا کار بۆ فەرهەنگێکی گەورە و گشتگیر و رەسای زمانی کوردی بکرێت، دوای تێپەڕبوونی (٣٥) ساڵ بەسەر ئەو بڕیارەدا هێشتا شتێکی دیاریی دیار نییە. هەروەها داواکردن و پێشنیازکردنی چەند کار و کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی دیوانی چەند لە شاعیرانی گەورەی کورد بێ ئەنجام مایەوە.

ئەم قسانەم بۆیە کرد ئەو کاتە بە خەڵات و پۆیلانەی دڵسۆز و رۆشنبیرانی کورد کەرەستەی چەندان بابەتی رەسەن هاتبووە ناو کۆڕ و بەشوێنداگەڕانی نەدەویست، هەر ئەوە بوو داوا لە کارمەندی کارامە بکرێت و دەستبەکار بێ.

بەڵام لەم رووەوە هیچ نەکرا. بۆ نموونە لە مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمم بیست وتی: لەناو ئەو دەستخەتانەدا بۆ کۆڕ هاتبوون (١٧)- یان (٢٧)- نوسخەی جیا جیا و جۆراوجۆری دەستخەتی (دیوانی مەلای جزیری)م دی، جگە لەوەی ئەم دەستخەتانە هەموو بەڵگوین کراون و لەناو براون، ئەو کاتە چی بۆ ئەو دەستخەتانە کرا؟ چ لێکۆڵینەوەیەک لەسەر دیوانی مەلای جزیری لە عاستیاندا کرا؟.

نایابترین نوسخە و کۆنترین نوسخەی زانراوی دەقی (مەم و زینی) ئەحمەدی خانی لەناو کتێبخانەی شێخ مستەفای قەرەداغیدا بوو- کە سەرلەبەری کتێبخانەکەی پێشکێشی کۆڕ کرد- و تا ئێستەیش لەو نوسخە پوختتر لە دەقی مەم و زینی خانی نەدۆزراوەتەوە.. لە کۆڕدا چۆن پێشوازیی ئەو دەقەیان کرد؟ چ کارێکیان لەسەر کرد؟ یان هەر هیچ نەبێ بە وتارێک لە کۆوارێ یان رۆژنامەیەکدا باسیان کرد؟ ئەوەیش هیچ، ئایا وەک هەواڵێک- کە لە ژمارە یەکی گۆڤاری کۆڕدا باسی پێشکێشکردنی کتێبخانەکەی شێخ مستەفا نووسرا و،[1] باسی ئەوە کرا ١٢٢

---

(١) کاک ئەحمەد و شەهرزاد خانی مامۆستا شێخ مستەفای قەرەداغی بۆیان گێڕامەوە وتیان: کە هاتن کتێبخانەکەیان بار کرد زیاتر لە پڕ یەک پیکابی دوو تەنی بوو بردیان.

دەستخەتی نایابی تێدایە- خوێنەران لەوە ئاگەدار کران ئەو نوسخە بێ وێنەی دەقی مەم و زین لەناو دەستخەتەکاندایە؟.

ئەم جارەیش دەڵێمەوە: من لە نزیکەوە تا درەنگانێک ئاگەداری کاروباری ناو کۆڕ نەبووم و نەمزانیوە چی تێدا ئەنجام دەدرێت، وەک بۆ دەستخەت و پۆیلانەکانی کۆڕیش کە من لەم نووسینەدا زیاتر دەستی لێ دادەگرم بە بۆنەی ئەوەوە، ئەو دەستخەت و دیارییانە لە دەفتەر و (سجلی) تایبەتیدا تۆمار نەکراون و، ژمارە و چەند و چۆنییان نەخراوەتە روو، ناتوانین - و رەنگیشە هەرگیز نەتوانین- قەوارەی ئەو زیانە دیاریی بکەین کە بەهۆی کەمتەرخەمیکردنەوە لە عاستی کەلەپوور و شوێنەواری پێشکێشکراو بە کۆڕەوە لە سەرجەمی گەلی کورد و رۆشنبیریی کوردی کەوتووە.

بەڵام هیوادارم کەسانێکی تریش کە وەک من لاوەکیی سووچگەلێکی تری ئەو زیانانە دەزانن دەنگیان بخەنە پاڵ دەنگم و، چی دەزانن بینووسن، بۆ ئەوەی: لەلایەکەوە قەوارەی ئەو زیانە - کەم تا زۆر- بزانرێت و، لەلایەکی تریشەوە ئەمە زەنگی خەتەر بێت - هەرچەند زۆر درەنگە- بۆ ئەوەی کارەساتی وا جارێکی تر روو نەداتەوە.

هەر لە نموونەی ئەو زیانانەی لابەلا من زانیومن و کارێکی وایان بۆ نەکراوە لەم ساڵانەی دواییدا و دوای دامەزراندنی (کۆڕی زانیاریی کوردستان) لە رێگەی (کتێبخانەی فێربوون)ەوە لە هەولێر کۆمەڵێک دەستخەت برا بۆ کۆڕی زانیاریی کوردستان و، پێشانی مامۆستا شوکور مستەفا دران بۆ ئەوەی بیانکڕێت، بەڵام بە بیانووی گرانییان و زۆریی پارەی داواکراو بەرانبەریان، دەستی لێ بەردان. مامۆستا شوکور دوایی ئاگەداری کردم کە بە سکانەر وێنەی گرتوون. ئیتر نازانم وێنەکان لە کوێن و چییان بەسەر هات.

مەبەستم لەم هەواڵە ئەوە بوو مامۆستا شوکور دواتر بۆی باس کردم کە ئەو کتێب و دەستخەتانەیش هەر بەشێک بوون لە دەستخەتەکانی کتێبخانەی کۆڕی زانیاریی کورد لە بەغدا و، لە هەمان رێگە و جێگەوە هاتوون کە پێشتر چەندان شتیان تیا تەرفەنە کردووە.

لێرەوە و دوای ئەم قسە و باسە دێمە سەر ئەو هەواڵە کە لە ناخەوە هەژاندمی و بە کۆستی کەوتووی کۆڕی زانیاریی کوردم داناوە، لام وایە دەبێ هەموو رۆشنبیرانی کورد و دڵسۆزانی کەلەپووری ئەم گەلە کۆتەڵی بۆ بکەن.

هەواڵەکەیش بە کورتی بەم جۆرە بوو:

ماوەیەک پێش رووخانی رێژیمی دیکتاتۆریی بەعس، رۆژێک لە کۆبوونەوەی دەستەی کوردی کۆڕی زانیاریی عێراقدا بووین لە بەغدا، ئافرەتێک، کە تا ئەو کاتە لە نزیکەوە نەمدەناسی، هات و وتی: مامۆستا دوای کۆبوونەوەکە زەحمەت نەبێ سەرێک لە کتێبخانە بدە.

ئەو کاتە کتێبخانە بووبوو بە یەک کتێبخانە و، کتێبەکانی کتێبخانەی کۆڕی زانیاریی کورد گوێزرابوونەوە بۆ کتێبخانەی کۆڕی زانیاریی عێراق.

کە چووم بۆ کتێبخانە زانیم ئەو ئافرەتە ناوی (جوان) خانە و، ئەمینەی مەکتەبەی کۆڕی

زانیاریی عێراقە و، ئافرەتێکی دڵسۆزی رۆشنبیری و کەلەپووری کوردییە.

دوای دانیشتن دەستی برد لە دۆلابێکدا، کە لە ژوورەکەی خۆیدا بوو، زەرفێکی دەرهێنا، وتی: مامۆستا زەحمەت نەبێ دەتوانی یارمەتیم بدەیت بۆ ئەوەی بزانم ئەمانە چین؟ کە لە کیسەکەم دەرهێنان و تەماشام کردن، بینیم پاشماوەی چەند دەستخەتی دانراوی ئیبنولخەیاتی قەرەداغی و، چەند کەسی تر بوون. ئەوەی بۆم کرا لە جیاکردنەوە و سەروبەرگرتنیان و یەکخستنەوەیان.. کردم.

دوایی وتم: ئەمانە چین؟ بە ترس و پارێزێکی زۆرەوە گوتی: ئەمە ماوەیەکە سەرۆکی کۆڕ سەری کون کردووم؛ هەموو رۆژێ پێم دەڵێ: برۆ ئەو شرەوپڕانە لەوبەر- واتە لە تەلاری کۆڕی زانیاریی کورد- بسووتێنە. تا لەم رۆژانەدا چووم لە ژوورێکدا- وەک جوان خان وتی-: بە قەد خەرمانێک پاشماوەی دەستخەت و تۆمار و کاغەزی پتورکاو و مۆرانە خواردوو دانرابوو، بەشی زۆری وای لێ هاتبوو کە دەستم دەدایە دادەڕزا و هەڵدەوەری، هەندێکیان کاتی خۆی لوولە بوو بە پەت بەسترابوو، کە دەستم دەدایە پەتەکە، لوولەکە هەڵدەوەری تەنیا پەتەکە بەدەستمەوە دەهات و دەما! لە گەڵێ شوێنیدا پەڕە پەڕە و پاشماوەی کتێبە کۆنە مابوو، بە دزیی ئەوانەوە بە ترس و لەرزەوە ئەمانەی کە دەیانبینی کۆم کردنەوە و، دوایی پێم ڕاگەیاندن کە ئەوانەم لێ جیا کردووەتەوە و دەیانخەمەوە ناو کتێبەکانی کۆڕ.

جوان خان گوتی: ئەوانی تری ئاگریان تێ بەردرا و سووتێنران!

لێرەدا جێگەی ئەو پرسیارەیە: دەبێ چەندە کەمتەرخەمی لە عاستی ئەو سامانەدا کرابێت تا بەو دەردە چووبێت و، وای بەسەر هاتبێت کەڵکی هیچی پێوە نەمابێت؟ دەبێ بە درێژاییی ئەو ساڵانە چۆن چاودێریی ئەو سامانە کرابێ.

ئەمە لە کاتێکدا گەلانی خواپێداوی وڵاتان بچووکترین شتی کەلەپوورییان لە جوانترین شوێندا و، لە کەش و هەوای ساز و شیاوی ئەو شوێنەوارانەدا، لەژێر چاودێری پسپۆڕ و شارەزا و، لە بەردەم توندترین بارودۆخی ئاسایشیدا، وەک سامانێکی نەتەوەیی دەپارێزن.

**دوا وتە:**

لە کۆتاییی ئەم کورتە نووسینەوە لەبارەی (کۆڕی زانیاریی کورد) دەڵێم: خۆشبەختانە لە لاوە ئاگەداری قۆناخگەلێکی بە بایەخی رەوتی کۆڕی زانیاریی کورد بووم و، وەک بینیت - با کەمیش بێت- تیشکم خستە سەر گەلێ لایەنی نەزانراو یان باس نەکراو.

دوا تیشکیش دەخەمە سەر لایەنێک وا بزانم کەسانی تر ئاگەدارییەکی ئەوتۆیان لەسەری نییە و، بە رێککەوت بۆ من لوا بیزانم.

لە سەروبەری خۆ ئامادەکردنی رێژیمی دیکتاتۆریی گۆڕکراودا بۆ بەرەنگاربوونەوەي هێزی هاوپەیمانان لە دوا شەڕدا کە رێژیم تێیدا دۆڕاو و گۆڕ بەگۆڕ بوو، هەندێ کاری باشیان کرد، کە بە سوودی سامانی کەلەپووری عێراق تێکڕا شکایەوە. لەوانە قایمکردن و هەڵگرتنی دەستخەتەکانی (م، و) لە شوێنێکی دوورە دەست و دوور لە بەڵادا.

هەروەها هێنانی دەستخەتەکانی کۆڕی زانیاریی عێراق بۆ (م، و) ئەو دەستخەتانەیش بریتیی

بوون له پاشماوەی دەستخەتەکانی کۆڕی زانیاری کورد و، به بۆنەی ئەوەوە گەلێکیان فارسی و کوردی بوون، ناونووسکردن و ئامادەکردنیان بۆ وێنەگرتنەوەیان لەسەر (مایکرۆفلم) خرایە ئەستۆی من منیش لەو ڕێگەوە توانیم وردە زانیارییەک لەسەر ئەو دەستخەتانە دەست بخەم.

ئەو دەستخەتانە وەک گوتم تێکڕا پاشماوەی دەستخەتەکانی کتێبخانەی کۆڕی زانیاریی کورد بوون و، له (٦٦٠) دەستخەت زیاتر بوون جگە لە چەند دەستخەتیان کە زۆر شڕ و پواو بوون، هەموویان وێنە گیران و خرانە سەر (مایکرۆفلم) و، بەشێکیان لە کتێبە جوانەکانی کتێبخانەی (تۆفیق وهبی)و، شێخ مستەفای قەرەداغی و، کەسانی ترە. کتێبی بە بابەخی بە زمانی کوردی تێدایە. دەستخەتە نایابەکەی مەم و زینی خانی لەناو ئەو دەستخەتانەدایە.

ئەوەندەی من ئاگەدار بووم، تا دوا قۆناخ ئەو دەستخەتانە بە ئەمانەت پارێزراون و، نەخرانە ریزی دەستخەتەکانی کتێبخانەی (م، و- المركز الوطني للمخطوطات)و، بەزۆریی مۆری (کتێبخانەی کۆڕی زانیاریی کورد)یان پێوەیە و، گەلێ سەرچاوەی بە بابەخی ئەدەب و زمان و مێژووی کوردیان تێدایە و، سەرجەم ماڵی کورد و کتێبخانەی کوردن.

**سەرەنجامی دەستخەتەکان و چارەنووسیان**

بەداخەوە وەک گوتم دەستخەتەکان بران بۆ ئەو شوێنەی ئەوسا پێی دەگوترا (دار صدام للمخطوطات) و ئێستە پێی دەڵێن (المركز الوطني للمخطوطات)، بەڵام چۆن بران؟ ناردنەکەیان بەپێی لیستەیەک بوو کە ئێستە نوسخەیەکیم لەلایە دەکرێ هەزار فڕوفێڵی تێدا بکرێت. بۆ نموونە وەک لە گۆڤاری کۆڕدا باسی کراوە بەڕێز فوئاد عارفیش پۆیلانەی خۆی بۆ کۆڕ نارد کە بریتی بوو لە قورئانێکی دەستخەتی شێخ ئیسماعیلی کونەکۆتری. لە لیستەکەدا باس لە قورئانێک بەم جۆرە نییە، ئەوەی کە هەیە دەڵێن: قورئانێک بێ هیچ تەفسیلات و باسی بە درێژیی. واتە ئەو قورئانە چەند نایاب بێت دەکرێ قورئانێکی تری دەستخەتی بخەنە شوێن و بیگۆڕن بە قورئانێک کە لە رووی بابەخی نووسینەوە و تایبەتمەندیی مێژوویی و جوانیی نووسینەوەی و لایەنەکانی ترەوە زۆر جیاواز بێت لەگەڵ قورئانە دەستخەتەکەی شێخی کونەکۆتریدا. ئەمە بۆ زۆر لەو دەستخەتانە دەکرێ کە لە لیستەکەدا تۆمار کراون.

---

(١) لە بەرگی دووەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایاندا... ل: ٩٣ تا ١٠٠ گەلێ زانیاریم لەبارەی ئەم مامۆستا نووسیوە. هەروەها لە چاپی دووەمی کتێبی (هوية كركوك الثقافية والادارية)دا لە لاپەرەکانی: ٣٧، ٣٨، ٣٩، ٤٠، ٤١، ٤٢، ٥٩، ٩٣، ١٥١دا لەبارەی ئەم مامۆستا گەلێ شتم نووسیوە. (هوية كركوك الثقافية والادارية الطبعة الثانية، دار آراس، اربيل، ٢٠٠٧).

# سووچێکی تری ژیانی مامۆستای مەزن مەلا مەحموودی مەزناوی لە رووی دەستخەتێکییەوە

٥٧٩

لە چەند بۆنە و جێگەی جیا جیادا چەند شتێکم لەبارەی ژیانی ئەم مامۆستا مەزنە نووسیوە،[١] بەڵام نە ئەوانە و نە ئەمانەیش ئێستە لێرەدا دەیاننووسم تەواوکەری بەشێکی ژیان و بەسەرهاتی ئەو مامۆستا بەڕێزە نین، بەڵام هەوڵ دەدەم هەرچیم لەبارەی ئەم، یان هەر مامۆستایەکی تری کورد، دەست بکەوێت تۆماری بکەم، بەڵکو بە هەموویان ببن بە کەرەستەی ژینامەی مامۆستایانی دێرینمان.

لەم ماوەدا چەند دەستخەتێکی بنەماڵەی شێخ محێدینی قەرەداغیی کەرکووکیم دەست کەوت کە هەر یەکێکیان لە بواری خۆیدا سەرچاوەیەکی بە نرخی مێژووی زانایانی کوردە.

ئەم دەستخەتەی لێرەدا باسێکی کورتی دەکەم بریتییە لە کۆمەڵێک دانراوی چەند مامۆستایەک، لە گەڵێ شوێنیدا خەت و شیعری مامۆستا مەلا مەحموودی مەزناوی پێوەیە، لە تەک مێژووی رووداو و بۆنەدا کە تێکڕایان سووچێکی تری ژیانی مامۆستای مەزناوی روون دەکەنەوە.

لە لاپەڕەی دووەمی دەستخەتەکەدا چەند بەیتێکی عەرەبی و فارسی بە خەتی مامۆستای مەزناوی نووسراون، هەرچەند کوژاندنەوەیان تێدایە و باش ناخوێنرێنەوە، چۆن بۆم ساغ بکرێنەوە دەیاننووسمەوە:

من السريع في تأريخ مسجد نائبزاده:

سئلت عن تأريخ دار السلام
وما به اسس قلت: رخام
حين ترقى الباني للجنة
محمد الاسعد كشف الظلام
وان بقى اولاد الفضل
صار عزاما من بكاء الكرام

لكاتبه محمود المزناوي

دوای ئەمەیش نووسراوە:

---

(١) جگە لە پواوی و کووژانەوە لێرەدا سووچی لاپەڕەکە دڕاوە.

فحين ما قارب للانهدام
جدد عبدالقادر بالرخام
فاز ومن عاون بالمغفرة
من ربهم شاكر سعى الانام
كما أتى تأريخ تعميره
بمغفرة من عين حسن الختام

هەر لەو لاپەڕەدا نووسراوە:

سلام الله مادام الزمان
على من من محياهُ الامان
سميّ جده المختار احمد
وقاه الله ربي المستعان

لە خوار ئەمیشەوە نووسراوە:

داشت یکی یکدو زنی دلپذیر
هر دو بخوبی چو دو بدر منیر
زان دو یکی بر پسر غیررا
از سر نادانی خود دادشیر
گشت برو آن زن دیگر حرام
تا بقیامت نشود دل...(؟)

دوو پەڕە دوای ئەمەیش نووسراوە:

دەردی زۆر و دەردی نەبوون
دوشمن قەوەی طالیع زەبوون
دۆست بێ پەروا فەلەک بێ
رەحم و دەوان بێ سکوون!
ئافەرین شاعیری کوردیی.

کتبه احمد الحیاوي از وقت غم خواری.

لە لاپەڕەی دوای ئەمەوە لە کۆتاییی مەسئەلەیەکی تەڵاقەوە قسەیەکی مامۆستا مەلا ئەحمەدی نۆدشی بەرانبەری مامۆستا مەلا عەلی قزڵجی نووسراوە، بۆ زانینی نموونەیەکی رێزگرتنی مامۆستایانی دێرینمان لە یەکتری دەقی نووسینەکەی مامۆستای نۆدشی دەنووسم:

«مولاي وسيدي هذا هو الذي يخطر بقلبي في جعل قوله المذكور صريحاً. وانما القبول والرد إلى جنابكم، فإن تلقّاه طبعكم المحقق المدقق النقاد بالقبول فهو غاية المأمول، ونهاية المسؤول، وإلا فانا

أخسّ تلميذ، ومتجرّع قطرة من جرّتكم. فأينَ السهى من القمر، واللؤلؤ من المدر؟! احمد النودشي ادام الله بركته.»

ئەوەندە بەسە کە بزانین کە ئەم (احمد النودشي)یە بە (علامەء دهر) ناوبانگی دەرکردووە.[1]

***

دوای ئەمانە لە دەستخەتەکەدا کتێبێکی (فەرائیض) نووسراوە کە (١٣٦) لاپەڕەی لە دەستخەتەکە گرتووەتەوە.

دوای ئەوە لە لاپەڕەیەکدا بە خەتی مامۆستای مەزناویی چەند شیعر نووسراوە کە دەچنە قالبی جەبر و ئیختیارەوە و، وەڵامیش دراونەتەوە، سەرەتا بە شیعری خەییام دەست پێ دەکات و، نەصیرەدینی طووسی وەڵامی دەداتەوە و، دوای ئەو موفتیی زەهاوی، دوای ئەوانیش مامۆستای مەزناویی بە پارچە شیعرێک کۆتاییی بە باسەکە دەهێنێ، بەرو دوا وەک خۆیان چۆنم بۆ خوێنرانەوە دەیاننووسم؛ چونکە خەتەکە کوژاندنەوەی زۆری تێدایە:

خیام:

گــر بادە پرستُ دغلم ســـهل بود
بر من چە عتابُ طعن نا اهل بود؟
مي خوردن من حق ز ازل دانستە
گر مى نخورم علم خدا جهل بود

***

نصیر طوسی:

گـفتی کـە گنە نزد من سـهل بود
این نکتــە نگوید آنکە او اهـل بود
علم أزلي علت عـصـيـان کـردن
نزد عـقـــلا ز غـــایت جـــهل بود

***

زەهاوی:

خیام! جواب شبهە ات سهل بود
علـم ازلی هـم تبـع فـــــعل بـود

---

(١) بڕوانە: علامـە دهر النودشی، تحقیق وتألیف یحیی مظهری، چاپ دوم ١٣٨٤ش، ٢٠٠٥ز. انتشارات کردستان.

(٢) دیارە مامۆستای مەزناوی مەبەستی بووە ئەم بابەتە بخاتە بەر باس و شتی لەسەر کۆبکاتەوە؛ ئەوەتا لە دەستخەتی ژمارە (٣٦٢٣٥٦ م، و)دا نامیلکەی جوزئی ئیختیار و، هۆنراوەی مامۆستایان: حافز و، نالی و، خانای قوبادی و، مەلا مەحموودی مەزناوی لەبارەی هەمان بابەت یەک خراون.

با قطع نظر ز علم هر معلومی
واقع نشود علم کجا جهل بود؟

***

مزناوی:

متبوع که ذی صورت علم ازلست
مصنوع خدای عالم لم یزل است
صنعش چو بعلم است چو علمش بحضور
دعوی دوی درو بوجه جدلست
گر علم ازل تابع فعل عبد است
او حاکم و، محکوم خدای اجلّ است
محکومی مولی بعبد اولی نیست
این حکم سراسیمهء عکس زلل است
گر خلق ایاز حاکم لطف شه است
خلقش اثر لطف شه بی بدلست
ایجاب غیر نافی امکان نبود
تکلیف عباد بر جواز عملست
گر علم ازل رافع عصیان باشد
تبلیغ پیمّز عبث بی امل است

....

مصداق قضاوقدر حق جبراست
لکن نه مسلّم [زائیم!] دغل است[۱]
ای مفتی دهد عذر خیّام منه
تا مرتکب راه خطاو خطلست
وقتی که موحّد شد تسلیم نمود
دعوای اجلّ دین جوابش اجل است
کثرت شجر شریعت بی ظلت (!)
وحدت شکر حقیقت بی دجل است
تکثیر صفات و ذاتُ اخلاص عمل
بروایهء عابدان شرع جلل است

---

(۱) لێرەدا بەیتێک هەیە لەبەر تێکەڵبوون و کووژانەوەی بۆم نەخوێنرایەوە و بواردم.

توحـیـد صـفـات ذات کـردار وجـود

[ســـــريهء!] واصـــــلان راه نبل است

تهليلهء مـخلصـان نداى جـبليـست

در شـرعُ حـقـيـقـةً صـداى جـبلست

چون نشـئـهء احـوال ندارد (مـحـمـود)[١]

در شـيـوهء اقـوال حـزينُ خـجل است

دواى ئەم لاپەڕە هۆنراوەيەكى فارسى دێت لە (٩) لاپەڕەدا شەرحى (اسماء الله)ى تێدا كراوە بە فارسى. بە خەتێكى خۆش نووسراوەتەوە، بەڵام نە ناوى دانەرى هۆنراوەكە و، نە ناوى نووسەرەوەيى و، نە كات و شوێنى نووسينەوەى ديارى نەكراوە.

دواى ئەمەيش هەندێک دوعا لە (مجربات الديربى) وەرگيراوە.

دواى ئەويش شەرحى دوو بەيتى شێخ عەبدوڕەحمانى جامى بە فارسى كراوە. ئەمەيش پێنج لاپەڕەيە. لە كۆتاييیەوە نووسيويە:

«كتبه محمود المهاجر المزناوي بالعجلة في سنة ١٢٩٥ .

قـد ذاب من الفراق لحـمي ودمي

وازداد من الشـــوق اليكم ألمي

كم أكـتب قـصـتي بدمـعي ودمي؟

كم أصبر؟ يا ليت وجودي عدمي!

دواى ئەمە چەند لاپەڕە دوعاى جۆراوجۆرى نووسيوە.

دواى ئەمەيش لاپەڕەيەک شيعرى فارسى لە دوو سێ بۆنەدا نووسراوە، بەشێكيان هەندێک لە شيعرەكانى وەڵامى (خەيام)ە كە پێشتر نووسيم. بەشێكى شيوەنێكە بۆ عەبدوڵڵا ناوێكى نووسيوە، كە لە ساڵى ١٣٠٣دا كۆچى دوايى كردووە.[٢]

**لەسەر بەشێكى تريان نووسيويە:**

«لكاتبه محمود المهاجر في جواب شيخ رؤوف ابن مرشد الانام شيخ علي- قدس سره-

ئەتۆ مەولاى منى، ئوستادى منى، باوكى منى، في مجلس يوسف پاشا المنكر لهما.

حـــال تعليـــمي لكم حـــال ابيْ

ابن كـعبٍ، كـــعب أشـراف لوي

---

(١) لێرەدا مامۆستاى مەزناوى ناوى خۆى نووسيوە، بەڵام نازناوى شيعريى (هجرى)يە و لە شوێنانى تردا دەينووسێ.

(٢) دوور نييە ئەم عەبدوڵڵا كوڕێ يان كەسێكى نزيكى خۆى بووبێت.

مع رسـول الله خـتم الانبـيـا

اشـرف المخلوق مـخـتـار قـصي

انت مـولاي واسـتـادي لكم

الف آلاف امـتـنانات علي

لن تزالوا مـرشـدي الاسـلام مـا

دام في الأقـوام والأحـيـاء حي

***

پێش ئەمەیش لە سەرووی لاپەڕەکەوە دوو بەیتی کوردی نووسراوە باش بۆم نەخوێنرانەوە، ئەمەم لێ هەڵکڕاند کە لە خوارەوە نووسیومە:

یارەببی (کجوت) جەوت و بەڕو یەک نەفەس...

جـووتم بکە بە تازە گوڵی سەروی قـامـەتی

شـەو بێ ئەنیس و ڕۆژ جـەلیسی جـەمـاعـەتێ

بەس پێم بچێژە ئەذیەتی قەبر و قیامەتێ![1]

دوای ئەمە دوعایەکە لەسەر ئامۆژگاریی مورشیدەکەی دوای تەوبەکردن دەخوێنرێت.[2]

دوای ئەوەیش فەتوایەکی مەلا ئەحمەدی موفتیی سلێمانییە لە مەسئەلەی تەڵاقدا.

هەر لەو لاپەڕەدا نووسراوە:

«قد أنعم الله علي بتولد قرة عيني محمد صالح في سنة ١٣٠١ في ضحى السبت، ثالث الشوال، اللهم عمّره صالحا، واجعله عالما عاملا بحرمة حبيبك محمد- ص-».

دوای ئەوەیش مەولوودنامەیەک بە عەرەبی نووسراوە، بێ ئەوەی ناوی دانەری یان کات و شوێن و ناوی نووسەرەوەی نووسرابێ.

دوای ئەمەیش نامیلکەیەک نووسراوە کە کورتکراوەی مەسئەلەی تەڵاقە کە نە ناوی کتێبەکە و نە ناوی دانەرەکەی نەنووسراوە.

لە کۆتاییەوە دەڵێ سەید محەمەد ساڵی ١٢٦٠ نووسیویەتییەوە.

(ڕەنگە سەید محەمەدی جەباری بێت).

دوای ئەمەیش نامیلکەی (ایقاد الضرام على من لم يوقع طلاق العوام)ی ئیبنولحاجە. ناوی

---

(١) مامۆستای مەزناوی هەر لەم مەعنادا لە دەستخەتی ژمارە (٢٦٦٤، م، و)دا دوو بەیتی نووسیوە. (بڕوانە مێژووی زانایانی کورد، بەرگی دووەم، ل: ١٠٠).

(٢) وا دیارە مامۆستای مەزناوی مەنسووب و هەواخوای ئەو شێخ عەلییە بووە کە لەبارەی گوتراوە:

خـوا بۆ خـۆی خـەللاق و عـەلیـمـە

لە کەرکووکێ دوعاگۆی (شێخ عەلی)مە.

نووسەرەوەی دیاریی نەکراوە، لەوە دەچێ هەر خەتی سەید محەمەد بێ.

لە کۆتاییی ئەم نامیلکەیشەوە فەتوایەکی مەلا رەسووڵی زەکیی نووسراوە.

دوای ئەوەیش نامیلکەیەکی تری فەرائیض نووسراوە بێ ئەوەی ناوی دانەری دیاری کرابێت.

دوای ئەمەیش فەتوایەکی مەلا یەحیای مزووری نووسراوە.

لە خوار ئەمەوە نووسراوە:

«قد انتقل هذا الكتاب ببيع صحيح شرعي الى تصرفي، وأنا اقل عبادالله محمود المزناوي».

دوای ئەمەیش حاشیەی مەلا یەحیای مزوورییە بەسەر فەرائیضی ئیبنولحەجەرەوە.

کۆتاییی ئەم دەستخەتە (المنبهات على الاستعداد ليوم الميعاد)ە، بەڵام نامیلکەکە بە ناتەواوی ماوەتەوە و دەستخەتەکە کۆتاییەکەی نەماوە.

**زانیاریی تر:**

مامۆستا کەمال رەئووف محەمەد لە هەوڵی ئەوەدا بووە زانیاری لەسەر مامۆستایانی مەزناوی کۆ بکاتەوە. لەم رووەوە چەند شتی کۆ کردووەتەوە نووسینیان بە پێویست دەزانم بۆ ئەوەی لە تەک ئەوانەی تردا لە یەک بدرێن:

**«محەمەد مەزناوی، مەزناویی دووەم کێن؟**

لە زیندانی مەنفادا سەرچاوەم بەدەستەوە نییە تەواو رۆشنیان بکەم، بەڵام هێندەی رەنجم بۆ داوە، ئەنجامەکەی ئەمەیە:

١- محەمەد مەزناوی- یان مەلا محەمەدی مەزناوی کوڕی مەلا رەسووڵە. لە مزگەوت، فێرگەی مەڵکەندی- سلێمانی و لەلای مەلا محەمەدی دەنگ گەورە خوێندوێتی و ئیجازەی زانستی وەرگرتووە و بە مەلا ناسراوە. ساڵی ١٩٢٠ز کۆچی دوایی کردووە.

٢- مەزناویی دووەم- یان مەلا مەحموودی مەزناوی کوڕی مەلا رەسووڵە، وەک برا گەورەی پێشووە، ئەمیش هەر لە هەمان فێرگەدا خوێندوێتی و، ئیجازەی زانستی وەرگرتووە و بە مەلا ناسراوە. ئەمیان لە «تەکیەی شێخ عەلی تاڵەبانی» لە کەرکووکدا جێگیر بووە.

رۆژنامەی کوردی مردنەکەی نیشان کردووە کە رێککەوتی سەعاتی دووی پاش نیوەڕۆی ١٠ی نیسانی ١٩٢١ز- یە. تەمەنی نزیکەی نەوەد ساڵان بووە. رۆژنامەکە پەسنیشی کردووە و دەڵێ: (دوو بەشی ساڵانی ژیانی بە دەرزدادان و زانستەوە رابواردووە و ئیجازەی بە چەند کەسێ داوە، زاتێکی گەورە و باش و بە تەقوا بووە، لە عیلمیشدا تەواو بووە!)[1]

---

(١) بڕوانە: بابی لالۆ، کەمال رەئووف محەمەد، عەقیدەی ئیمان- عەقیدەی کوردی «لوببەلعەقایید». کۆ و کورتکردنەوەی خالید شارەزووریی نەقشبەندی. دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، چاپی یەکەم. ل: ١٥٢

### پارچە شیعرێکی تری مەزناوی:

لەو پەڕە پەڕانەدا کە کۆم کردوونەتەوە یەک پەڕە کاغەزی کۆنم پاراستووە لە سەری نووسراوە شیعری مەلا مەحموودی مەزناوییە لەبارەی کاک ئەحمەدی شێخ، خەتەکەی خۆش نییە، هەڵەی نووسینەوەی هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی هەر ئەوە لە دەستدایە و رەنگە دوای ئەم جێگەیش جێگەی لەمە لەبارتری دەست نەکەوێ بۆ بڵاوکردنەوە وام بە باش زانی هەرچۆن هەیە بۆ رزگارکردنی لێرەدا وەک خۆی بینووسم. ئەوەیش ناشارمەوە کە پارچە شیعرەکە ناتەواوە و، لە کۆتاییی پەڕەکەوە ئاماژە بۆ سەرەتای بەیتێکی تر دەکات کە دیارە لە لاپەڕەیەکدایە کە تێدا چووە.

**ئەمەیش بەیتەکان وەک نووسراون:**

من كلام ملا محمود المزناوي فی حق حضرت كاك أحمد الشيخ

اســـری بدامـــاءِ دمـــاء العین ام
ســار الكرى انســان ظبي بالحــرم؟
عــيني بمســمــار الجـفــون ســمّــرت
بالنجم والبــيــضــاء من عــيني الالم
نـام الاخـــــلاء خـلـيـــــاً بـالـهـم
من طيف سكان الخـــيــام بالعلم
اصــبــحت في زفـرات شــوقٍ دائمــاَ
حـــتی یظنّ العـــاذل انی یـهم
یا عـــاذلي ان ذقت من راح الهـــوی
أقـــســـمتَ ان الله بالعـــشق حكم
لو لم يكن بالبـــال بلبـــال الجـــوی
مـــا ذاب ذوب الثلج في نار الوجم
احشائي بين الصدر صارت جمرة
روحي كلهب النار بالجــسم اضطرم
من احـــمــد المعــروف بالنور الجلي
هادي ســبـيل الحق كـشـاف السـدم
غـوث الورى غـواص دامـاء اليــقين
مــزن الندا فــيــاض حـسناء الشــيم
تقـــــريره شــــاف لا رباب العلل
تحـــــريره كــــاف لطلّاب الحكم
قد ضــاء في المشــتق معنى المصدر
في ورع جـد الشـرع بالجدّ احــتـرم

دام الليــالي منه ليل القــدر وإن

ايّام يوم العــيـد والعلم الشـيم

والله عــافــاه وأبقــاه كــمـا

ولاّه في ملك الفــؤاد والنّسم

ابناؤه بيــضــاء انوار الهــدى

اوتاد فلك الارض اطواد الهــمم

رامـوا سعيدا مصطفى معروفا

احـداقـا لعين العلم مـادام القلم

يا ربّ قـاليـهم بظهـر الكفّ في

المذى في سـجن خـسـران اِذم

كي يهـتـدي بالنور قـوم اضـمروا

في حـقـهم بالقلب نارا من اضم

لا زالت الاذيال منهم قـبّلت

مـا قـبّل الحـجـاج خـيـر المستلم

يا فـضل من مِن يمنه البـدر الجلي

يا نسل من مِن وجهه الصبح ابتسم

الروح عطشـان وقلبى مـدنف

انت المروّى والمداو للسـقـم

امتاز نار [الفسق!] من نور الهدى

لكن نفـسى مـا يردّ باللجم

والنفس والشـيطان في اغـوائنا

قــوّاد نار الشـرّ سـواق الدّقم

كم من كبار الذنب قد قارفتها

غـيـر الذي صـادفت في بحـر اللمم

بالكذب قــوّال لسـانى دائمـا

في الصدق خـرسـان كـأنى في بكم

من رؤية المأمـور عـيني غـمـضت

في نظرة المنهي عـينى للعـشم

والاذن مـشـتـاق استـمـاع الباطل

حين استـمـاع الحق من عين العـمم

انفى الى شمّ الحـرام مـائل

من ريح ريحـــان الحـــلال انخـــذم
باعى جناح البـــاز في صـيـد القطا
حين ابتـغـاء الشـرّ فـي بر الجـعم
صيت....

# شیوەنێک بۆ شێخ عەبدوڕەحمان

## "ابو الوفا"

٥٨٠

وا بزانم زیادەڕۆیی نییە و، دوور نەڕۆیشتووم ئەگەر بڵێم: بەسۆزترین و ناسکترین پارچەی ئەدەبیی- بە شیعر و پەخشانەوە- ئەو پارچانەیە کە بەهۆی کۆچی دوایی زانایەکەوە، یان لەدەستدانی ڕۆڵە و خۆشەویستێکەوە، یان لە دنیا دەرچوونی شێخ و گەورە و مورشیدێکەوە گوتراون؛ چونکە گەلێ جار هەستی بە سۆز و جۆش و کوڵی دەروون لە دوای ئەو کارەساتانە ئەوەندە بە تاو دەبێت کەسانی شاعیر و هەست ناسک لە ناخەوە دەهەژێنێ و کەف و کوڵی ئەو سۆزەیان کاتێ دادەمرکێتەوە جوانترین شیعر و پەخشانی ئەدەبی لێ بێتە بەرهەم و، نایابترین مانا و تەعبیری تێدا تۆمار بکرێ.

خوێندنەوەی چەند دەقێک لەوانە - ئەوانەیان کە لە دەستدان- گەواهیدەری ئەم ڕاستییەن و، خوێنەر کە کاتێ مووچڕکە لەشی دادەگرێت، یان دەیان ساڵ دوای کارەساتەکان فرمێسک لە چاویەوە هۆنە هۆن ڕێگەی کوڵم و ڕوومەت دەگرێتە بەر، هەموو جارێک وا هەست دەکات کە تازە کۆستەکە کەوتووە و، هەر خوێندنەوەیەکی سووکوار و شینەکە شینێکی نوێ بەرپا دەکات.

وەک گەلانی جیهان ئێمەیش دەیان و سەدان لەو پارچە سووکوارە ئەدەبییە زیندووانەمان بووە، بەڵام بەداخەوە ڕێزمان لێ نەگرتوون و، بە دەستی نەزانان بە زیندوویی لە چاڵی کەمتەرخەمیکردن لە عاستیاندا ناشتوومانن.

ئەم بابەتە- ئەگەر چەند سەرە نەبێت- دوو سەرەیە؛ لەلایەکەوە بابەتێکی ئەدەبیی سەرشار لە مانای ورد و ناسک و پڕ هەست و سۆزە، لەولایشەوە سەرچاوەیەکی مێژوویی دروست و ورد و جێگەی باوەڕە، بەتایبەتی بۆ زانینی مێژووی کۆچی دوایی ئەو زانا و ناودارانە کە پارچە ئەدەبییەکانیان بۆ گوتراوە؛ چونکە ئەو شاعیرە یا ئەو ئەدیبە لە کاتی کۆچی دوایی ئەو کەسەدا شیوەنەکەی بۆ نووسیوە، پارچە ئەدەبییەکەی نووسیوە و، گەرماوگەرم و، گەرموگوڕ ئاگای لە بەسەرهاتەکە بووە و بە وردی کات و ساتەکەی، بە ڕۆژ و مانگ و ساڵەوە، لە دەقەکەیدا گونجاندووە.

ئەم دەقانە وەک لەم ڕووەوە سەرچاوەیەکی مێژوویی- مێژووی کۆچکردنی ئەو کەسەن سووکوارەکەی بۆ نووسراوە، لەولایشەوە - دواتر- دەبێت بە سەرچاوەیەکی مێژوویی و ئەدەبیش لە هەمان کاتدا بۆ ئەو کەسەی سووکوارەکەی نووسیوە؛ لە ڕوویەکەوە، لە ڕووی دەقەکەوە

دەزانرێت لە چ سەردەمێکدا ژیاوە و هاوچەرخی کێ بووە و کێ هاوچەرخی بووە، لە رووبەکی تریشەوە ئەو پارچە ئەدەبییە دەبێتە نموونەیەکی ئەدەبی بۆ لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی وزە و توانای ئەدەبیی ئەو کەسە و دیاریکردنی پلە و پایەی لەناو ئەدیبانی هاوچەرخی خۆیدا.

ئەم بابەتە: سووکوار و شین و شەپۆڕ، بۆ زانایان و ناودارانمان - تا ئێستە- بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە و، بەشێوەیەکی تایبەتی جیا نەکراوەتەوە و لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە.

**ئەم بابەتە چەند لایەن و دیمەنی هەیە:**

**یەکەم:** وا دەبێت یەک کەس کە کۆچی دوایی کردووە بەهۆی پلە و پایەیی و جێگەی گەورەی لە دڵی ئەدیب و زانایانی سەردەمی خۆی، یان مورید و مەنسووب و شوێنکەوتووانیدا، چەندان کەس بە چەندان شێوە و زمان بە شیعر و پەخشان سووکواریان بۆ کردووە. نموونەی نزیکی ئەم لایەنە پیاوانی وەک: مەولانا خالید و، کاک ئەحمەدی شێخ و، شێخی سیراجەدین و هاووێنەکانیانن..

**دووەم:** وا دەبێت یەک کەسی ئەدیب و بەتوانا و دڵسۆز و بەسۆز شیوەن بۆ چەندان کەسی هاوەڵ و هاورێ و هاوسەر و هاوچەرخی خۆی دەکات و، لەو رووبەشەوە دیوان و شوێنەوارەکانی تۆمارگەیەکی مێژوویی ئەو سەردەمەی کەسانێکی زۆر دەبن کە ئەو شاعیر و ئەدیبە لە ناویاندا و لە تەکیاندا ژیاوە. لەم بارەیشەوە لەناو دیوانی شاعیرانی کورددا بۆ نموونە دانامێنین و چەندان شاعیری ناسراوی ئەم بوارەمان هەیە کە دیوانەکانیان بەشێکی باشی ئەو تۆمارگەیان لەخۆ گرتووە.

لەناو ئەمانەیشدا دەکرێ رەنجووری و مەولەوی و بێخود و... هتد بخەینە سەر لاپەڕەی پێشەوەی باسەکە.

**سێیەم:** لەوانەیە لە پەنای ئەم دوو جۆرەدا جۆرێکی سێیەمیش بخرێتە روو کە لە هەردوو سەرەوە پێچەوانەی خاڵەکانی پێشوو بێت. چونکە دەگونجێ شاعیرێک یان ئەدیبێک یەک جار بۆی لوابێت، یان یەک جار بە کۆچی زانایەک یان خۆشەویستێکی هەستی بزوابێت و، دڵی هاتبێتە جۆش و سووکوارێکی پڕ سۆزی بۆ گوتبێت. هەروەها نموونەی ئەو کەسانەیش کەم نین کە دوای کۆچی دواییان لە شوێنی دیار و ناو کۆڕ و کۆمەڵی ئەدیب و شاعیراندا نەبوون و، یەک کەس زیاتر- لەوانەی ئەوەیان لێ دەوەشێتەوە- ئاگەداری ئاکامی مەرگی نەبووە و، بە یەک پارچە شیعری هەتیو شیوەنی بۆ کراوە، یان هەر ئەوەندەیان گەیوەتە دەست دیوانی ئەدیب و مێژوو.

## پاشماوەی سووکوارێکی باڵای بێناز

وەک گوتم ئەم بابەتە تا ئێستە لای ئێمە بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە و، مێژوونووسان و ئەدیبانمان بۆی دانەهاتوونەتەوە تا بە شێنەیی شوێن مادە و کەرەستەکانی بکەون و، وەک پێویست لێیان بکۆڵنەوە و خزمەتیان بکەن. دیارە لە وەها بارودۆخێکیشدا کەرەسەی ئەو بابەتە بێناز و مادەکانی پەرتەوازە و لەناوچوو دەبن. بەڵگەی ئەم قسەیەش ئەم پارچە شیعرەی بەردەستمانە کە نازانین شیعری کێیە، بەڵام لەبەر رۆشنایی ناوەڕۆکی شیعرەکەدا دەزانین بۆ کێ

گوتراوە و شیوەنی بۆ کێ تێدا کراوە.

لەناو ئەو پەڕە پەڕە و پارچە کاغەزە دەستخەتە کۆنانەدا کە لەملاولا دەستم خستوون و پاراستوومن پارچەیەک شیعری ناتەواوە، یان باشتر بڵێم لاپەڕەیەکە لە پارچەیەک سووکواری جوان بە شیعری عەرەبی بە خەتێکی (ثولث)ی نایاب نووسراوەتەوە. سەرەتا و کۆتایی نەماوە، لێرەیشەوە نازانین چەند بووە و درێژی و کورتی پارچە شیعرەکە لە چ ئاستێکدا بووە. ئەوەندەی کە ماوە ٢٠ تاک شیعرە.

بە وردبوونەوەیەک لەو ئەندازە ماوەی سووکوارەکە دەزانین کە پارچە شیعرەکە شیوەنێکە بۆ شێخ عەبدوڕەحمان ئەبولوەفای کوڕی شێخی سیراجەدین کراوە، کە لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە و، لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە خزمەت گەلێ لە زانایانی کورددا کە ئارامگای هەمیشەییان ئەوێ بووە بە خاک سپێرراوە.[1] لەناو شیعرەکاندا هاتووە کە دەڵێ:

فانطفاء (السراج) أعمى عيوني

اذ لفقد (الوفا) نهاري مساء

لەم بەیتەدا بە (السراج) ئیشارە بۆ شێخی سیراجەدین دەکات، وەک بە (الوفا) ئاماژە بە شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی دەکات.

وەک لە بەیتی:

يا ابا صالح الكريم ويا من

لي وللعالمين فيه غناء

ئیشارە بۆ شێخ عەبدولقادری گەیلانی دەکات کە کونیەی (أبو صالح)ە.

بە بەیتی:

هو وفّى وفاته عند مثوا

ك هنيئا له ونعم الوفاء

ئیشارە بۆ ئەوە دەکات کە (وەفاتی، ئەبولوەفا) لای ئارامگای شێخ عەبدولقادری گەیلانیدایە و،

---

(١) شایانی باسە ئەو گۆڕستانە تەرمی گەلێ کەڵەزانای کوردی تێدا نێژراوە، ئەوانەی کە من نووسراوی کێلیانم دیوە یان بیستوومە کە لەوێدا بە خاک سپێرراون: مامۆستا مەلا یەحیای مزووری، شێخ عەبدوڕەحمانی ئەبولوەفا، مامۆستا مەلا هیدایەتوڵڵای ئەربیلی، مامۆستا سیبغەتوڵڵای حەیدەریی یەکەم و دووەم. شێخ رەزای تاڵەبانی، مامۆستا عەلادین سەجادی.

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسیش لە خۆشی ئەو زاتانەوە هەر لە ژیانی خۆیدا لە نێوانی ئەو مامۆستا کوردانەدا جێگە گۆڕی خۆی دیاری کردبوو، چەند جار لە خزمەتیدا چوومەتە سەر ئەو شوێنەی بۆ خۆی دیاریی کردبوو. یەکێک لەو زاتانەی کە دراوسێیەتی و کەس نەکەوتووەتە بەینیانەوە مامۆستا مەلا یەحیای مزوورییە. شتێکی تریش لەم بارەوە ئەوە بوو هەموو جارێ مامۆستا دەیفەرموو: زۆرم پێ ناخۆشە قاچم دەکەوێتە لای سەری ئەبولوەفاوە.

ئەبولوەفا میوانی ئەو زاتە زانا و گەورە و بەڕێزەیە.

دەمێنێتەوە ئەوە کە بڵێم: نازانین ئەم شاعیرە کە ئەم شیوەنەی بۆ ئەبولوەفا کردووە کێیە. وەک نایشزانین نووسەرەوەی ئەو خەتە خۆشە کێیە، ئاخۆ هەر خەتی شاعیر خۆیەتی و، وەک شاعیر بووە خۆشنووسیش بووە، یان هەر خۆشنووسێک دوایی بەو خەتە خۆشەی پارچە شیعرەکەی نووسیوەتەوە؟.

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە دەبێ چاوەڕوان بین بەڵکو نوسخەیەکی تری ئەم سووکوارە لە شوێنێکدا پارێزرابێت و لەلایەکەوە سەر هەڵبدات و، هەندێ گرێکوێرەی ئەم باسە بکاتەوە.

دەبێ بەسەر ئەوەیشدا نەڕۆم کە خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس چەند بەتەنگ ئەوەوە بووە ژیانی ئەم زانا و شێخانە بە روونی و دروستی بنووسێت هیچ هەواڵێکی لەم سووکوارە نەبووە.

**ئەبولوەفا کێیە؟**

ماوەتەوە بە کورتی ئەو پیاوە بناسین کە ئەم شیوەنەی بۆ کراوە.

ئەم زاتە ناوی شێخ عەبدوڕەحمانە کوڕی شێخ عوسمانی سیراجەدینە، ساڵی ١٢٥٣ لەدایک بووە.

سەرەتای خوێندنی لە خانەقای خۆیاندا لەگەڵ شێخ محەمەد بەهادینی برایدا لای مەلا مەحموودی دشەیی بووە و، دوایی عیلمەکانی لای مەلا حامیدی کاتب و مەلاکانی تری خانەقا خوێندووە و تەریقەتیشی لەسەر دەستی باوکیا وەرگرتووە و ئیجازەی خەلافەتی لەوەوە دراوەتێ. وەک لە مەیدانی تەریقەتدا بە وەسیەتی باوکی بووە بە مورشید لە مەلایەتیشدا پایەیەکی بەرز و بڵندی بووە.

دوای کۆچی دوایی باوکی ماوەیەک لە تەک شێخ محەمەد بەهادینی برایدا ئیرشاد و ڕێنوێنیی خەڵک دەکات، دوای ماوەیەک دەچێتە گوڵپ و ماوەیەک لەوێ دەبێ، دوایی دەچێتە بەغدا و یەکجاری لەوێ جێگیر دەبێ، ماوەیەک ئیرشادێکی باش دەکات و خەڵکی زۆر سوودی لێ وەردەگرن، لەوێوە دەچێ بۆ سەفەری حەج دوای گەڕانەوەی لە سەفەری حەج نەخۆش دەکەوێ و، لە بەغدا کۆچی دوایی دەکات و جێگەیەکی گەورە چۆڵ دەکات و[1].... داخێکی سەخت دەبێت لە دڵی مورید و مەنسووبانیدا و ئەم سووکوارە ناتەواوە شوێنەوارێکی ئەو جێگە و داخەیە.

بعـــد ضـــوء الهـــدى ونور
النـار الحـــشـــا بذاك انطفـــاء
اخـبـروني: أقـاطِنٌ عـيـســهمُ ام
ضـعنوا بالفلا سَرَوْا حيث شاؤا؟

---

(١) بڕوانە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، بەرگی دووەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاریی عێراق، بەغدا، ١٩٨٣ . ل: ١٠٢ .

مالِيَ اليومَ ما ارى غير ضُرّي
تعتريني الهمومُ والبأساء؟
فانطفاء (السراج) أعمى عيوني
اذ لفقد (الوفا) نهاري مساءُ
كلُّ داءٍ له الدواء سوى المَوْ
تِ، فما منه مخلص وشفاء
يا أبا صالحِ الكريم ويا من
لي وللعالَمين فيه غَناء
جاءك الضَّيف أملا ودخيلا
فاحمهِ في حماك، مني الرَّجاء
هو وفّى وفاته عند مثوا
ك، هنيئا له ونعم (الوفاء)
فوق أتلال ربعه الورق ناحَتْ
ورثت في فنائها الورقاء
ولأجل الفراق بعد اخيهم
بكت الفرقدان ثم السماء
رجفت ارضُ بابلٍ في عزاه
بكت الامّهات والآباء
ضعن الصبر، والعويل قطين
راح مني الهنا وجاء البكاء
سال بالدَّمع دجلةُ وفراتُ
مثلَ ما سال من عيوني الدماء
بكت الكرخ والرصافة بل با
بلَ، والنهروانُ، والزوراء
قبره روضة كروض جنان
وهو الخلد فيهما الخُلَداء
زهرها زُهرة السماء (ضياءً)
نَوْرها نُور أعينٍ والسَّناء
مرقد للعروج مرقاتُ فضل
وبه للمعارج الإتقاء
هو غيث، ابوه غوثُ سماءٍ

المكرمـات، ومنهـمـا الإهتـداء
وهو عثمان عهده صاحب النو
رين في ربه: الغنا والبـــقـــاء
كـان للدين من (ســراج، وفــاءً)
فالسراج انطفى ومات (الوَفاءُ)
اعز عرش...

## چەند پارچە شیعری بڵاونەکراوەی (ئەبولوەفا)

جێگەی خۆیەتی لە دامێنی ئەم کورتە باسەدا لا بەلای ئەم بەرهەم و شوێنەواری ئەم زانا مەزنەدا بکەمەوە. چونکە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس هەوڵی داوە بۆ دەستخستنی هەموو بەرهەمەکانی ئەم زانا و شاعیرە، بەڵام شتێکی ئەوتۆی دەست نەکەوتووە جگە لە بەشێکی دیوانە فارسییەکەی، کە باسی هەوڵ و کۆششی لەم بوارەدا دەکات و دەفەرمووێ:

«حاجی شێخ عەبدولڕەحمان ئەدیبێکی ناسک و شاعیرێکی پایە بڵندی چەرخی خۆی بووە. دیوانێکی شیعری بە فارسی هەیە، بیستوومە لای کوڕەکانی شێخ سادقی برازایەتی کە جاران لە دێی (گوڵپ) دادەنیشتن. بەشێکیشی لە کەشکۆڵەکەی حاجی مەحموودی یارەویس لە دێی (تەپی سەفا)ی شارەزوور و، بەشێکی کەی لە کەشکۆڵەکەی مەحموود پاشای جافدا نووسراوەتەوە، کە ئێستا لە کتێبخانەی خوالێخۆشبوو حەسەن بەگی عەلی بەگی کوڕەزایدایەتی. هەروا سەید طاهیری هاشمیی دەوڵەتاواییش بۆی نووسیبووم کە لای ئەویش هەیە. بەڵام بارودۆخی ڕۆژگار مەیدانی نەدا وێنەیەکیم بۆ بنێرێ. من خۆم گەلێکیم دەسگیر بووبوو، بەڵام ئەویش لەبار و کۆچدا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی کە بەشێکی فەوتا. ئێستا ئەو ئەندازەیەی لە بەردەستدایە لێرەدا دەینووسمەوە و بەهیوام ئەگەر لە هەلێکی ترا ئەوی کەیشیم دەست کەوت هەمووی بە جارێ بڵاو کەمەوە... »[1]

منیش لەلای خۆمەوە کەشکۆڵی شێخی حیسامەدین گەڕام[2] چەند پارچە شیعری فارسیی ئەم مامۆستای تێدا بوو دوای بەراورد دەرکەوت دووانیان لەوانە تا ئێستە بڵاو نەکراونەتەوە. بۆیە ئێرەم بە شوێنی ئەوە زانی شیاو بێت بۆ ئەوەی ئەو دوو پارچە شیعرەیش بخرێنە بەرچاوی خوێنەران، بەڵکو لە هەلی داهاتوودا بچنە سەر ئەو بەشەی مامۆستای مودەڕیس بڵاوی کردوونەتەوە.

هەروەها مەلا فەتاحی کاگردەڵیش لە کەشکۆڵە ڕەنگینەکەیدا بەشێک لە بەرهەمەکانی (وەفا)ی

---

(١) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ل: ١٠٥

(٢) بۆ زانینی زیاتر لەبارەی ئەم کەشکۆڵە و شارەزابوون بە ناوەڕۆکەکەی بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغی، بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی چوارەم، چاپخانەی (الخنساء). بەغدا، ١٤٢٢ک - ٢٠٠٢ز، ل: ١٨٣ .

نووسیوەتەوە، لەوانەیش سێ پارچەیان لەوانەن دەست مامۆستای مودەڕیس نەکەوتوون.

کەشکۆڵێکی تریشم لەلایە بە ناوی کەشکۆڵی (تۆفیق) لەوێشدا دوو پارچە شیعری بڵاونەکراوەی (وەفا) هەیە. لەم دەرفەتەدا ئەم پارچە شیعرانە بڵاو دەکەمەوە، بەڵکو بۆ چاپی داهاتووی (یادی مەردان) یان بۆ کۆکردنەوەی دیوانی (وەفا) ئەمانیش بچنە پاڵ شیعرە بڵاوکراوەکانی تری (وەفا).

١

نسبت خودرا بیار خویش میدانیم ما

همچو گیسویش ز سر تا پا پریشانیم ما

یا چو آنخال سیه بر عارض اش در بین زلف

برزخ جامع میان کفرو ایمانیم ما

ابروا ست آن بر رخ زیبات یا قوس قزح

یا دم شمشیر تقدیر است؟ حیرانیم ما

نیست ما را الفتی با سیر صحرای ختن

بهر این شهری غزالان سینه بریانیم ما

حیرتی دارم که این فوّارهای دیدگان

از چه میجوشد مگر طنّور طوفانیم ما؟

روز اول آتش عشقت بجان ما فتاد

تا ابد زان آتش جانسوز سوزانیم ما

شورش و غوغای طفلان پیش و پس خوش عالمی است

چون (وفا) از دولت عشق توسلطانیم ما[1]

٢

تا گل روی ترا دیدم ببازار آمده است

هر که در عالم بچشم نقش دیوار آمده است

تا سحر از بیم چشمم فتنه خیزی رهزن است

در دو چشمم کاروان خواب بیدار آمده است

هیچ نقاشی چنین صورت نبسته بر خیال

فکر مانی هم درین سودا چو برکار آمده است

کاش دیگر در چمن میدیدم آن گل پیرهن

تا شدی حل عقدهء مشکل که درکار آمده است

---

(١) ئەم پارچە لە تەک کەمێک جیاوازیدا لە کەشکۆڵی مەلا فەتاحی کاگردەڵیشدا هەیە.

حوریست آن یا فرشته یا بشر یا خود پری؟
کی چنین در عالمی اظهار دیّار آمده است؟
در لطافت شیوهء حورو ملك دارد ولی
طبع وخویش در دل آشوبی پریوار آمده است
ناله و فریاد و افغان (وفا) بیوجه نیست
فتنهء بهر بلای جهان پدیدار آمده است[١]

٣

ای ز حسن جلوهات آیینهها رات صد جلا
چهره ات ز آب لطافت میزند موج صفا
شعلهء حسنت بگلها آتش خجلت زند
سرمهء حیرت کشد خالت بچشم مدّعا
تا نهال سرو سیم اندام او بالا کشد
در دل ما بینوایان میکشد بالا بلا
لعل جان بخشش گر از جوش تبسّم دم زند
خندهها ریزد بفرق چشمهء آب بقا
بیتو چندان دیدهء امیدواری جوش زد
پای نومیدی بخون أشك ما بندد حنا
درد هجرشرا کجا تدبیر درمانی کنیم
بعد ازین دست امید ما ودامان دعا؟
جای شبنم مردمك از دیدها پالد (وفا)
ز آب تاب چهره چون آفتاب (بوالبها)[٢]

٤

الحمد لمبدع البدیع
والشکر لخالق البرایا
در روز دوم صباح جمعه
ساعت ز دو بود نه ز بالا

---

(١) ئەم پارچە بەهەمان دەق لە کەشکۆڵی (توفیق)یشدا هەیە.
(٢) ئەم پارچە لە کەشکۆڵی (مەلا فەتاحی کاگردەڵیی) وەرگیراوە.

از ماه رجب که مشعل مهر
من مطلعـــــه اذا تجلّی
شیپور سرور کرس بهجت
در زد بجهان خروش غوغا
ناگـاه بگوش من سروشی
من حضرة قدسه تعالی
در داد یکی نویدُ گفتا:
ای خاص بفیض فضل مولا
چوبک زنِ بام تو سکندر
در کوی تو هندویست دارا
ای مهبط واردات غیبی
درویش خرابه گرد شیدا
باز از سرنَوْ نوازش حق
بر کام تو گشت جلوه فرما
دادت پسری که مهر چهریست
رخشنده چو لؤلؤ ایست لا لا
شد بخت به یمن او مباهی
هم توئم تست سعد کبری
در کسوت فضل صدر أنبیا
در خلعت فقر فخر آبا
گردید بنام پیر احرار
مخصوص تفؤلا باسما
در عالم غیب تاج دادند
اورا لقب ز جناب مولا
یا رب به کمال فضل رحمت
این اختر عزت شَرَفرا
با علمُ عمل قرین دولت
توفیقُ رفیقُ عقل برجا
مقرون بصفا و طول مدّت

مسعود سعید سعد فرما
تأریخ ظهور این کرامت
جستم ز خرد، بناز گفتا:
لا ترغب، ثم قلت فارغب
١٢٨٣
الصبح به اذا تجلّی
١٢٨٣
گفتا: که بگوی (بو الوفا) را:
بشراك وحبذا واهلا[١]
١٢٨٣

٥

تا بما آنلب یاقوت تو خندان شده است[٢]
حالت سینهء صد چاك نمایان شده است
جمع گردید حریفان بتماشا کامشب
کوی ما از شراره چراغان شده است
تا دلم بستهء آنگیسوی مشك افشان شد
چمن سینه لگد کوب غزالان شده است
ز آتش سنگ شده گلخن ما گلشن ناز
شکر طفلان که شب هجر چراغان شده است
تیره ایّام چنان است (وفا) در ره عشق
همچو زلف تو سراپاش پریشان شده است

***

(١) ئەم پارچەیش لە کەشکۆڵی مەلا فەتاحی کاگردەڵیی وەرگیراوە.
(٢) ئەم پارچە لە (کەشکۆڵی توفیق) وەرگیراوە.

## مامۆستایەکی قەرەداغیی تری لەبیرکراو

٥٨١

لە بابەتێکدا لە ژمارە (٥)ی گۆڤاری ئەکادیمی و دواتریش لە بەرگی هەشتەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوەدا بڵاوم کردەوە باسی حامیدی قەرەداغیم کرد کە مامۆستایەکی کۆنی کوردە و لە سەرچاوەکانی مێژووی زانایانی کورددا ناوی نەبوو، ناوی و شتێک لە مێژوویم نووسی.

دوای ئەوە لەناو ئەو دەستخەتانەدا کە برای بە نرخم مامۆستا ئەحمەد عەبدولوەهاب پێشکێشی کردم ناوی مامۆستایەکی تری قەرەداغیم دی کە بە گوێم ئاشنا نەبوو- وابزانم- سەرچاوەکانی مێژووی زانایانی کوردیش لێی بێ ئاگان.

ئەو مامۆستا لە ڕێگەی دەستخەتێکییەوە دەناسرێت و دەناسێنرێت، هیوادارین دەستخەتی تریشی مابێت و لەمەولا دەربکەون تا زیاتر و باشتر بیانناسین.

**باسی دەستخەتەکە:**

ئەم دەستخەتە ئێستە لەلای من بە ژمارە ٥١٢/٤٤ پارێزراوە دەستخەتێکی نایابی جوانی باش هەڵگیراو و پارێزراوە. بەشی هەرەزۆری دەستخەتی مامۆستای باسەکەمان خۆیەتی بە خەتێکی وردی خۆشی جوان نووسیویەتییەوە، خەتی پەراوێزەکانی وردترە.

**دەستخەتەکە ئەم دانراوانەی تێدایە:**

١- ریسالەی مەسعوودی لە ئادابدا.

٢- نامیلکەی قزڵجی لە باسی (أجزاء القضية)دا.

٣- نامیلکەیەک لە باسی (اللزوم)دا وا دیارە دانراوی (شمس الدين) ناوێکە.

٤- شەرحی (داشکبری زادە) لە ئاداب و مونازەرەدا.

٥- (داشکبری زادە) لە ئادابدا.

٦- شەرحی (داشکبری زادە) خۆی بەسەر نامیلکەی پێشووەوە.

٧- الرسالة الحنفية في الآداب.

٨- نامیلکەیەکی تر لە باسی (اللزوم)دا.

٩- پارچەیەکی حەوت بەیتی شیعری شێخ مەعرووفی نۆدێیی، لەوە ناچێت پێشتر بڵاو کرابێتەوە.

١٠- هۆنراوەی عەرووزی شێخ مەعرووفی نۆدێیی.

١١- نامیلکەی (أبو الجیش الانصاري الاندلسي) لە عەرووزدا.

هەشت دانراویان یەک لە دوای یەک بە خەتی مامۆستای باسەکەمان مامۆستا مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا عەبدولقادری قەرەداغییە. سیانەکەی دوایی بە خەتی مامۆستا مەلا محێدینی کوڕی شێخ محەمەد قەسیمی پایگەلانییە.

مامۆستا مەلا ئەحمەدی قەرەداغی دانراوەکانی لە نێوانی ساڵانی ١٢٩١- ١٢٩٤ی کۆچیدا نووسیوەتەوە.

لە دوای نووسراوەکانییەوە واتە لە کۆتاییی نامیلکەکانەوە مێژووی نووسینەوەیانی نووسیوە.

لە کۆتایی گەلێ لە پەراوێزەکانەوە نووسیویە چ کاتێکی شەو و رۆژ نووسیویەتییەوە، وەک: دوای عەسر، شەو، کاتی هەتاو کەوتن، چێشتەنگاو... هتد. بەڵام بەداخەوە - جارێکیش چییە- نەینووسیوە لە چ گوندێ یان شارێ یان مەدرەسەیەک نووسیویەتییەوە.

لەبارەی رشتە و بنەماڵەی خۆیشییەوە تەنیا دەنووسێ: ئەحمەدی کوڕی مەلا عەبدولقادری قەرەطاغی. لە کۆتایی یەک دوو پەراوێزیشیەوە نووسیویە (احمد الحمدي).

رەنگە لەم دەستخەتەوە ئەوە وەربگیرێت کە مامۆستا مەلا ئەحمەد لە کاتی فەقێتیدا ئەم کتێبانەی نووسیبێتەوە - رەنگە وایش بێت- بەڵام گومان لەوەدا نییە - ئەگەر وایش بێت- موستەعید و ئاخر مادە خوێن بووە و، موستەعیدێکی بە توانا و لێوەشاوە بووە. وەک دەیشگونجێ لە کاتی سەرەتای مەلایەتیدا نووسیبنیەوە. بەتایبەتی کە دەبینین پیاوێکی بە توانای خەتخۆشی وەک مامۆستا مەلا محێدینی پایگەلانیی کتێبی بۆ نووسیوەتەوە و، لە نووسینەکەیشیدا بە مامۆستا - نەک بە هاوڕێ و برا- ناوی دەبات.

بۆ دەرخستنی پلەی مامۆستا مەلا ئەحمەد و توانای مامۆستا مەلا محێدین دەقی نووسینەکەی مامۆستا مەلا محێدین وەک خۆی لێرەدا دەنووسم:

«تم تحریر هذه العروض المنظومة یوم الثلاثاء سابع من شهر ربیع الاول سنة ١٢٩٢ علی ید الفقیر الحزین محي الدین ابن الشیخ محمد قسیم الپایگلاني، لاجل استاذي الامجد الملا احمد بن ملا عبدالقادر القرەطاغي. والحمد لله رب العالمین. وصلی الله علی سیدنا محمد وعلی آله واصحابه أجمعین».

الذي يعجز المعلل عن اقامة الدليل على مدعاه ويسكت وذلك
ذلك هو الافحام او يعجز السائل عن التعرض له وذلك
العجز هو الالزام فح تنتهي المناظرة وتتم اذ لا قوة لهما
على اقامة وظائفهما الا انهما في ذلك فرق وأما
ادب المناظرة فهي انه ينبغي للمناظر ان يحترز عن الايجاز
والاختصار وان يحترز عن الاطناب في الكلام
وان يحترز عن استعمال الالفاظ الغريبة في البحث
وان يحترز عن استعمال اللفظ المجمل في البحث ولا بأس
بالاستفسار وان يحترز عن الدخل في كلام الخصم
قبل الفهم ولا بأس بالاعادة وان يحترز عن التعرض
لما لا دخل له في المقصود وان يحترز عن الضحك و

رفع الصوت في اثناء المناظرة وامثالهما وان
يحترز من المناظرة مع اهل المهابة والاحترام و
ان يحترز لا يحسب المناظر للخصم حقيرا هذا الذي
ذكرنا غاية ما يراد في هذا الباب قد تمت الرسالة
المنسوبة الى العالم العامل مولانا الشهير بطاش كبرى
زاده على يد الحقير الفقير الى المولى
القدير الخبير احمد بن ملا امين القادري

الفراغ في يوم الاربعاء غرة
جمادى الآخر سنة

الف ومائتين واحدى وتسعين من الهجرة النبوية
المصطفوية صلى الله عليه وآله وصحبه وسلم تسليما

## دانراوێکی مامۆستا شێخ ئیبراهیمی عەباسی

٥٨٢

ئەو سەرچاوانەی لە دەستدان بەتایبەتی (إمارة بهدينان العباسية)[1] گەڕام بۆ ناو و شوێنەواری ئەم مامۆستا هیچم لە بارەیەوە دەست نەکەوت.

خۆشبەختانە دانراوێکی ئەم مامۆستام بە خەتی خۆی دەست کەوت، لێرەدا ناوی مامۆستا خۆی و دانراوەکەی تۆمار دەکەم:

ناوی: وەک مامۆستا خۆی لە سەرەتا و کۆتاییی کتێبەکەیەوە نووسیویە و منیش دەینووسم، ناوی ئیبراهیمی کوڕی مستەفای کوڕی عەباسە، لەسەر لاپەڕەی یەکەمی دەستخەتەکەیش لەقەبی (العباسي) نووسراوە.

ژیانی: وەک نووسیم لە هیچ سەرچاوەیەکدا ناوی ئەم مامۆستام نەدیوە، بەڵام خۆی دوای نووسینەوەی پاکنووسی دانراوەکەی ساڵی ١١٣٨ک ی نووسیوە، واتە لەو مێژووەدا لە ژیاندا بووە.

**باسی دانراو و دەستخەتەکە:**

وەک گوتم ئەم دانراوە بە خەتی مامۆستای دانەریەتی بە خەتێکی وردی جوان نووسیەتییەوە. دەستخەتەکە باش هەڵگیراوە و پارێزراوە بەرگێکی پێستی قاوەیی لە هەردوو دیوەیەکەیەوە نەخشێنراوی هەیە.

لە کتێبخانەکەی خۆمدا بە ژمارە: ٤٠٩/٤٤ پارێزراوە ١٦١ لاپەڕەیە، لاپەڕەی ٣١ دێری تێدایە.

**سەرەتاکەی:**

دوای (الحمدلله) و (صەلات و سەلام) «وبعد: فيقول أفقر العباد إلى فيض فضل ربه العلي إبراهيم بن مصطفى بن عباس الموصلي: لما رأيت همم الطلبة على أبواب النهجة المرضية واقفة، وعلى النظر إلى خفايا خبايا زواياه عاكفة، حركني مفيض الانعام، على الخاص والعام، ان أعلق عليه ما عسى أن يكون سببا لاتصال عملي، بعد انقطاع أجلي، والمرجو من إخواني أن يصلحوا ما فيه من سهو او خلل، ويستروا ما ظهر من وهم او زلل، وان يعتبروه كالذيل لحاشية شيخ مشايخنا فريد دهره ووحيد عصره الشيخ محمد الاحسائي، تغمده الله برضوانه وأسكنه اعلى غرف جنانه، فإنها جليلة المقدار عند ذوي الاعتبار، غير انها لم يقع منها على ثلث الأخير إلا النزر اليسير، فجعلت هذه بمنزلة التتمة لها، ليعود علي من بركات مؤلفها، والمسؤل من رب البرية، ان يجعلها مقبولة مرضية، إنه على ما يشاء

(١) بڕوانە: محفوظ عمر العباسي، إمارة بهدينان العباسية، مطبعة الجمهورية – الموصل، ١٣٨٨هـ – ١٩٦٩م.

قدير، وبعباده خبير بصير... ».

بۆیە ئەم سەرەتایەم گواستەوە ئێرە تا لە دەست و قەڵەمی مامۆستا خۆیەوە مەبەستی لە دانانی کتێبەکەی وەرگیرێت.

**ئەمەیش کۆتاییی کتێبەکەیە:**

«... اللهم إني أسألك واتوجه إليك بنبيك محمد صلى الله عليه وسلم نبي الرحمة بأن تنفع بهذه التعليقة الخاص والعام، وترزقنا النظر إلى وجهك الكريم في دار السلام، وان تعيذنا من شر حسود يفضح، ولئيم لا يصفح، فإن النسيان من خصائص الإنسانية، والخطأ والزلل من شعار الآدمية، والمنصف من غفر قليل خطأ المرء في كثير صوابه، فإن الله يأبى العصمة لكتاب غير كتابه، مع أني بذلت جهدي وطاقتي ولم آمن الزلل، معترف بكثرة السهو والخلل، راجيا ممن حسن خيمه، وسلم من داء الحسد أديمه، ان يصلح ما تحقق خطأه إلى الصواب إن يمكنه عن ذلك الجواب، ويطلب جزاء ذلك من الكريم الوهاب، وأستغفره تعالى مستعيذا به من حسد يسد باب الانصاف، ويصد عن جميل البيان والاوصاف.

وكان الفراغ من تسويد هذه المباركة الميمونة في العشر السابع من الثلث الثالث من المحرم الحرام، بعد صلاة الجمعة سنة ثمان وثلاثين بعد المائة والألف، في جامع سيدي وسندي وملاذي ومعتمدي، القطب الرباني الشيخ محي الدين عبدالقادر الگيلاني قريبا من مرقده المنور، اعاد الله علي وعلى المسلمين من نفحاته، ومن علومه الشريفة ومن بركاته، في الدنيا والآخرة، إنه على ما يشاء قدير، وبالاجابة جدير، حسبي الله ونعم الوكيل، ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم، وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين. والحمدلله رب العالمين. وأنا الفقير اليه سبحانه إبراهيم بن مصطفى بن عباس، اعوذ بالله من شر الجنة والناس، وأسأله اللطف يوم يؤخذ بالأقدام والنواص. سنة ١١٣٨هـ.

ثم إني لما بيضتها ظهر لي قصور كثير، فزدت ونقصت وبدلت على حسب ما بدا، والحقت في آخرها نبذة مما لا يستغنى عنه من علم الرسم.. فمن وقف على ذلك فليصلح كما ذكرنا وله الأجر. كتبه إبراهيم بن مصطفى».

ئەم کۆتاییـیـەیشم بە درێژی نووسی، چونکە گەلێ شتی لێ وەردەگیرێ، یەکێک لەوانەی کە جێگەی سەرنجە ئەوەیە: مامۆستا لەو کاتەدا لە بەغدا چی کردووە؟ کە ئەو توانای دانانی کتێبێکی ئاوای بووبێت بڕوا ناکرێت بە فەقێتی لە بەغدا بووبێت. دەبێ مامۆستا و (مدرس) بووبێت لە مەدرەسەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی وەک چەند مامۆستای کوردی تری کۆنمان؟ ڕەنگە!

الضم والكسر لانها حركة التقاء الساكنين في الاصل فان لم يتصل بالفعل هاء الغائب او الغائبة او الساكن ففيه ثلاث
لغات الفتح مطلقا وهو مبني على الاصل وكغيره نحو رد وعض وفر والكسر مطلقا وهو لغة كعب وغيره والاتباع لحركة الفاء وهو
الاكثر في كلامهم قوله او نحو اسمع التعجب الزم اي باجماع العرب كما نص عليه في شرح الكافية نحو احبب الى زيد واشدد بحمرة
وجه عمرو ومنه واحبب الينا ان تكون المقدما قوله والزم الادغام ايضا في هلم باجماع كما في شرح الكافية لثقلها بالتركيب
بالتركيب ونزل هلم منزلة اخرها لم يجز فيه ما اجازوه في اخر نحو رد من الضم للاتباع والكسر لالتقاء الساكنين لعدم
التركيب وحكي الجرمي فيها الفتح والكسر عن بني تميم ويفتح في هلم والضم ولو دهي اسم فعل بمعنى احضر في المتعدي واقبل
في اللازم فتلزم طريقة واحدة ولا يختلف لفظها بحسب من هي مسندة اليه وهي لغة اهل الحجاز قوله او فعل امر اتصل
بها الضمائر البارزة بحسب من هي مسندة اليه فتقول هلما هلموا هلمي هلممن بالفك وهي لغة بني تميم وفي كيفية تركيبها
ثلاثة اقوال احدها المذكور وهو قول جمهور البصريين والثاني والثالث قول الخليل والفرا وقيل انها بسيطة و
هذا هو الصحيح حتى نقل بعضهم الاجماع عليه قوله بضم العين هذا احد الافعال التي قيل انها لازمة للبناء للمفعول
ابدا ونها جن وسل وبهت وطل دمه واهدر واولع بكذا وزهي علينا اي تكبر وحم ووعك وزكم ونلج وسقط
في يده ورهصت الدابة ونفست المراة ونتجت الناقة وغم الهلال واغمي على زيد واخواتها مما لم اطلع عليه و
عنيت هنا بمعنى اعتنيت به قوله على حل المهمات هو بضم الجيم ولو قال على حل المهمات بالحاء المهملة لكان احسن
[illegible] ما قال بعض المشايخ بان هذا ينافي قوله في الخطبة مقاصد النحو بها محوية والمقاصد
هي المهمات فعبارته هناك تدل على انه التزم ان يجري جميعها اذ هو مقتضى عموم الاضافة وعبارته هنا تدل على انه
جرى على جلها اي معظمها لا كلها قوله هو فعل ماض بمعنى جمع اي لا اسم تفضيل كما قيل مختصرا بكر الصادر فيفيد ان فاعل
احصي ضمير راجع الى الناظم مدلول عليه بقوله عنيت على طريق الالتفات من التكلم الى الغيبة ويجوز ان يكون الفاعل
ضميرا مستترا في كل اي جمع كل من منظومتي الكافية الشافية اخلاصة اي العاني ما يكمل دعى مفعول احصي ومن الكافية
بيان لما قدم للغزيرة ولا يخفى ما فيه من البلاغة ولا يبعد ان يكون اشارة الى انه انتقط وانتخب لباب الكافية حيث اخذ
منها الشطر والشطرين والبيت والبيتين مع بعض تغيير ودونه كما هو الواقع المشاهد وفي قوله كما اقتضى غنى بلا
خصاصة الطباق وهو كناية عما جمع من المحاسن الظاهرة ثم قابل بالشكر نعمة الانعام وثنا بالصلوة على خير الانام وعلى اله
البررة الكرام واصحابه الخيرة العظام ليكون على طريق البدء الختام معا رحمنا الله واياه في دار السلام فاحمد الله مصليا
على محمد خير نبي ارسلا الحمد لله اولا واخرا باطنا وظاهرا وصلى الله وسلم على سيدنا ومولانا محمد النبي الامي الامين
وعلى اله وصحبه ما قامت الاشياء رب العالمين اللهم اني اسالك واتوجه اليك بنبيك محمد صلى الله عليه وسلم نبي الرحمة بان
تنفع بهذه التعليقة الخاص والعام وترزقنا النظر الى وجهك الكريم في دار السلام وان تعيذنا من شر حسود
يتبع ولئيم لا يصفح فان النسيان من خصائص الانسانية والخطا والزلل من شعائر الادمية والمنصف
من يغتفر قليل خطا المرء في كثير صوابه فان الله يابى العصمة لكتاب غير كتابه مع اني بذلت جهدي وطاقتي ولم امن الا
معترف بكثرة السهو والخلل راجيا ممن حسن خيمه وسلم من داء الحسد اديمه ان يصلح ما اغمض خطاه الى الصواب
ويطلب جزاء ذلك من الكريم الوهاب واستغفره تعالى مستعيذا به من حسد يسد باب الانصاف ويصد عن جميل
البيان والاوصاف وكان الفراغ من تسويد هذه المباركة الميمونة في العشر السابع من الثلث الثالث من شهر [illegible] بعد
صلوة الجمعة سنة ثمان وثلثين بعد المائة والالف في جامع سيدي [illegible] وملاذي ومعتمدي القطب الرباني الشيخ محي الدين
عبد القادر الكيلاني بغربها من مرقده المنور اعاد الله علينا وعلى المسلمين من نفحاته ومن علومه الشرعية ومن بركاته في
الدنيا والاخرة انه على ما يشاء قدير وبالاجابة جدير وحسبنا الله ونعم الوكيل ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم وصلى
الله وسلم على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين [illegible] ابرهيم بن مصطفى [illegible]
اعوذ بالله من شر الجنة والناس [illegible] يوم يؤخذ بالاقدام والنواصي [illegible]

# دوو پارچە شیعری شێخ ئەحمەدی سنەییی گۆرانیی

٥٨٣

ئەم مامۆستا بەهۆی ئەوەوە لە کوردستان هەڵکەنراوە و لە بەغدا جێگیر بووە و نەوەکانیشی پاش خۆی خوێندەوار بوون و لەسەر رێبازی باو و باپیرانیان رۆیشتوون.. شتێک لە مێژووی ژیانی زانراوە.

ئەم مامۆستا ناوی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ محەمەد قەسیمی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ محەمەد قەسیمی یەکەمە.

بەگوێرەی ئەوەی لە دەستخەتی ژمارە (٥٩٤٦ م و)دا دۆزیمەوە ئەم مامۆستا ساڵی ١٢٠٨ک-١٧٩٣ز لەدایک بووە. شوێنی لەدایکبوونی دیاری نەکراوە.

مامۆستا شێخ ئەحمەد یەکەم پیاوی بنەماڵەی مەردۆخییە کە گەیشتووەتە بەغدا و لەوێ نیشتەجێ بووە، بۆم روون نییە کەی گەیوەتە بەغدا و لە کوێوە چووە، ئەوەی روونە ئەوەیە باو و باپیری لە کوردستانی ئەودیوەوە - ئەردەڵانەوە- هاتوونەتە کوردستانی عێراق و لێرە نیشتەجێ بوون و لق و پۆپیان لێ بووەتەوە و، لە قەرەداغ و سیاگوێز و شوێنانی تر دامەزراون و خزمەتی زانست و ئاینیان کردووە.

ئەوەی زانراوە و لە بەڵگەنامەکانی ناو کتێبخانەکەیان وەردەگیرێ ئەوەیە ئەم مامۆستا ساڵی ١٢٤٧ک - ١٨٣١ز لەلایەنی حکوومەتی ئێرانەوە پلەی قازیی عەسکەری دراوەتێ. ساڵی ١٢٤٩ک - ١٨٣٣ز لە بەغدا کراوە بە سەرپەرشتیاری مزگەوتی مورادییە. واتە دەبێ لە دەوروبەری ساڵی ١٢٤٨ک - ١٨٣٢ز دا لە ئێرانەوە هاتبێتە ئەم دیوەوە.

دوای ئەوەی لە بەغدا نیشتەجێ بووە گەلێ کار و فەرمانی پێ سپێرراوە لەوانە:

١- وەک وتمان ساڵی ١٢٤٩ کراوە بە (متولی) سەرپەرشتیاری کاروباری مزگەوتی (موراد پاشا) لە بەغدا.

٢- مودەڕیس و مامۆستای مزگەوتی (عتیق حسن پاشا) بووە.

٣- ساڵی ١٢٦٠ مووچە و بەراتی (٣٢٥) قورووش بووە.

٤- ساڵی ١٢٦٦ مووچە و بەراتەکەی بووە بە (٨٧٥) قورووش، هەر لەو ساڵانەدا دوو تەغار گەنم و دوو تەغار جۆی ساڵانە بۆ ماڵ و خێزانەکەی بۆ بڕراوەتەوە.

٥- بەپێی بەڵگەنامەیەکیش - یان باشتر بڵێم- بەپێی ئەوەی خۆی نووسیویەتی دەردەکەوێ ساڵی ١٢٥٣ لە هەرات بووە، بەڵام چۆن و بۆچی چووە بۆ هەرات؟ بە کارێک نێرراوە یان خۆی چووە؟ نەمزانیوە.

ژیانی لە بەغدا نووسراوە و ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە ئەم ماموّستا لە بەغدا ماوەتەوە و نەوە و کوڕ و کوڕەزاکانی لە بەغدا بڵاو بوونەتەوە و تا ئێستەیش هەر لە بەغدا و دەوروبەری بە ناوی (سنوی)وە ناسراون و، گەلێکیان شوێن و پلەی دیاریان هەیە. رشتەی زاناکانی نەوەکانی بەم شێوەیە:

شێخ تەها کوڕی شێخ ئەحمەد بووە زانایەکی کەم وێنەی چەرخی خۆی بووە. چەندان دانراو و شوێنەواری نایابی لێ بەجێ ماوە. چەندان پلە و فەرمانی دیار و بەرزی لە درێژایی و پانایی دەوڵەتی عوسمانیدا هەبووە. چەندان دانراو و شوێنەواری شاکار و پڕ بایەخی لێ بەجێ ماوە، ساڵی ١٣٠٨ لە شاری مووسڵ کۆچی دوایی کردووە.

کوڕی دیاری شێخ تەها شێخ عەبدولمەجید بووە کە ئەمیش لە بەغدادا ماوەتەوە و کار و فەرمان و پلەی بەرز و دیاری زۆری هەبووە. بەپێی رشتەی زانایانی بنەماڵەکە، دوای ئەم پیاوی دیار و ناوداریان شێخ عەبدوڵلای کوڕی ئەم ماموّستا شێخ عەبدولمەجیدە بووە کە لە خانەوادەکەدا جێگەی تایبەتی هەبووە و، میرات و کولتووری زانستیی بنەماڵەکە کەوتووەتە لای ئەم و، ئەمیش بەپێی توانا و بۆچوونی خۆی خزمەتی کردوون و هەوڵی پاراستنیانی داوە.

شێخ عبدوڵلا لەبارەی بنەماڵە و پیاوانی بنەماڵە و شوێنەواریان و کتێبخانەکەیانەوە شتێکی نووسیوە کە کتێبێکی خنجیلانەی لێ پێک هێناوە بە ناونیشانی (الموجز في تواريخ حياة الاسلاف الكرام) منیش پێشەکیم بۆ نووسیوە و پێیدا چوومەتەوە و ساڵی ٢٠٠٧ لە (بنکەی ژین) لە سلێمانی چاپ کراوە.

ئەو کتێبە سەرچاوەی ئەم نووسینەیە.

هەروەها لە کتێبی (ورود الكرد في حديقة الورود)یشدا هەندێک بە درێژی - لە چاپی دووەمدا- لەسەر پیاوانی ئەم بنەماڵە - بەتایبەتی شێخ تەها- نووسیومە و، بەشێک لە شوێنەواری ئەدەبیی ئەم ماموّستام خستووەتە روو.

هەردوو چاپەکەی ئەم کتێبە لە دەزگای ئاراس لە هەولێر ساڵی ٢٠٠٢ چاپی یەکەم و ساڵی ٢٠٠٧ چاپی دووەم ئەنجام دراون.

**باسێکی دەستخەتەکە:**

ئەم دەستخەتە لە (ئەلبوومی کەشکۆڵ)یشدا کەمێک باسیم کردووە دەستخەتێکە لە شێوەی بەیاضدایە، بەرهەمی چەند شاعیری فارس و هەندێک شوێنەواری ماموّستا مەلا ئەحمەدی گۆرانیی- نووسەرەوەی-شی تێدایە، ئەمە باسی ناوەڕۆکەکەیەتی بە کورتی:

١- سەرەتای پارچەیەک شیعری فارسیی خاوەن نەزانراو.

٢- سەعدی.

٣- لە لاپەڕە (٥)دا نووسراوە (مسمط بلغاري).

٤- لە لاپەڕە (٧)دا سەلمان و حافظ

(بەیاض)ەکە ١١٠ لاپەڕەیە وا دیارە هەمووی بە خەتی شێخ ئەحمەدی گۆرانییە. مێژووی ١٢٣٠ تا ١٢٥٣ی تێدایە. پێوانەکەی (٢١×١٠)یە بە ژمارە ٩٥/٤٤ لە کتێبخانەکەی خۆمدا پارێزراوە.

١

(هـو الـغـــــــفـــــار)ن...

ئومـــێـــدم وه لوطف (هـو الغـــفـــار)ن

(رحـــمن الرحـــيم) كـــارســـاز كـــارەن

نـەجـــات دەهـەندەی خـــەلیل جـــە نـارەن

یوونسش جـە بـەتن مـاهـیی خـەلاص کـەر

ئەیوویش نـە دەست کـــرمـــان هـەزارەن

تۆ کـــەردی ئەیووب نە کــرمـــان خـــەلاص

مـــەلجــەء بێ کـــەســـان هەزار هـەزارەن

یە چـەندێ وەخـــتـــەن جـــۆیای خـــاصـــانم

جـــــەو بۆنـە خــــــەرجم هـەزار هـەزارەن

نـە هـەر مـــــەکـــــانێ رەند بدان ئاشکار

مـــامـــا وه دەســـتم دڵ جـــێش بێـزارەن

چەند سـاڵەن دایم جـســـتـوجـۆی رەندم

نمە گـنـۆم وه دەسـت دڵ پڕ غــــــوبارەن

داس ســـاڵ عـــومـــر یاوان بە چـل ســـاڵ

دڵ نە داخ و داخ مــــاویـی خــــاڵانـەن

پـەرێشـــان حـــاڵم جـــە بەد بـەخـــتی وێم

دایم الـمدام خـــــــــــەم وەنـەم بـارەن

دڵ پـەراگـــــەندەن پـەرێ رەند خـــــاص

[بـوینـــا وه دەم تـا بـەیـنـەت دارەن!]

ئیـســـتـــە شـوهـرەت رەندیی منمـــانان

تـەمـــەننام وه لوطف هـەشت و چەهـارەن

جـــە ســـەرتا وه پا بێ عـــەیبـــەن باڵاش

رەندەن مـەحـبـووبەن شـیـرین گوفـتـارەن

نـەزاکـــــەت فــــــرۆش یانـەی بـاوانـەن

خــەط و خـاڵ شـیـرین گـۆنا گـوڵنارەن

ســــوەیل گـــۆنـا و غـــەبغـــەبش- رەژیدە

نـەفح بۆی بـەیان گـــــوڵ وه بـەهـارەن

تـەقـــریر تەعـــریف ئـەو نـەورەســـیـــدە

ســـــــەنـەیش یـاونـا دەو و چـەهـارەن

شــــەریفی ئەو رەند شـــەكـــەر ڕازانـەن
پـەروەردەی [مكـان!] طـەهـران طەهـارەن
یا حـــەق باجـــەتی لیـقــای مــصطەفــا
بـەشق ئـەبوبـەكـــر كــــە یار غـــارەن
بە صـیـدق و ئیـخـلاص عـومـەر خـەطاب
قـــاطیع كـــونەندەی قـــەوم كـــوفـــارەن
بە [نیّت!] پاك عــوثمـــان عـــەفـــفـــان
جەمعش كەرد قورئان صوورەت [هزارەن!]
بە عـــەشق ئـەمـــیـــر بنچـینـەی عـــەبا
شـــێـــر صـــەف شكەن دولّدولّ ســوارەن
ئەو نـەورەســـیـــــدە تا (یوم القـــیـــام)
ســـپــــــەردم وە دەست هـەر چار یارەن
یـانە بـاوانش ئـەو نـەورەســـــــیـــــــدە
قـــــەریب وێمـــــــەن دلّ بێ قـــــەرارەن
تـەحـــــریـر نـەفــــیـــــر نـەبۆ نیگارش
ئامـــال قـــەلبـــەن [صـــەلامـــە!] وارەن
قـــادر قـــــودرەت كـــەرۆ نـەصــــیـــبـم
پـەی بەژن و بـالاش دلّ بــێ قــــــەرارەن
بدەۆن تەحـــریز جـــە قـــەضـــا و قـــەدەر
حــــــەق بپــــــارێزۆش ئاهـووی شكارەن
تـا (قـــاب قـــوسین) ، (ومـــا ارسلناك)
ســـپـــــەردەی [قـــادر!] لەیل و نەهـارەن
هـێـــمـــای دولّدولّ نـە كـــەفـــتـــەن نـە دام
بـە وێنـەی كــــــەلرەم ئـاهـووی تـەتارەن
چونكە دولّدولّی جـــە گـــــەل رەم كــــەرۆ
دەمــــاغش نە ئەوج بـەرز كـــۆهـســــارەن
ئەبرووان دوو قـەوس وە هـەم پەیوەســتــەن
مـــــوژانان چەنی عـــەینان خـــومـــارەن
زولّفـــان ئەســـوەدی نـە بـەین ئەگـــریج
زنج و غــەبغــەبش ســێب خــوانســـارەن

گـۆنـا ئەحـــمـــەریی ژاڵە [لی دشـــتـــە!
لە بان عـــەقـــیـــقـــیـی یاقـــووت ئابدارەن
گـــوڵبـــون نە طـەرح غـــونچـــەی گـــوڵابیی
ئەر صـــەد وێنەی گـــوڵ پەرچینش خـــارەن
گـــــەردەن مـــــینای صـــــاف بلوورەن
مـــاویی خـــاڵانش [بیـــســـو!] تیـــمـــارەن
ترنجـــان پەیوەند بەو ســـینەی مـــەڕمـــەڕ
نەســــیم ترنج حــــەیی مــــەزارەن
ئەر نەصـــیب کـــەرۆ خـــودای ذولجـــەلال
ئامــــاڵم چەندش حــــەڵاڵە وارەن
بە لوطـفت بکەر رەحـــــمێ وە حـــــاڵم
ئینتـــیظار لەیل شـــیـــرین گـــوفـــتـــارەن
مـــازا حـــەســـــرەتان ببـــەروون وە گڵ
ئەو نەورەســــــیـــــدە بۆ بە شکارم (!)
نامش (مـــەنیـــجـــە) حـــەق یاونا بۆ
فـریشـتـــەی بەخـتـم ئەمـجـار بێـدارەن!
بەخت پەراگـــەندەی ســـەفـــەر (هەراتەن)
دوو ســــاڵ (کـــــامڵ) تەمـــــام تەیارەن
جـــە زێد و مـــەکـــان کـــوردســـتـــان زەمین
ئاوارەی وەتـەن، ئـەردەڵان شـــــــارەن
[یاد دون!] وێم مـــەندەن وە بێ کـــــەس
دوســــــتــــــاخ طەهران نە یار دیارەن
ئەســـیـــر دوســـتـــاخ نە دەست گـــەبری
مـەنیـجـەی طەهران تورک خـونخـوارەن
کـافـرەن مـوطلـەق، بێ دین ئەرمـەنیی
رافـــضـــیی صـــەریح [مـــرک!] نازارەن
دایم المدام ئامـــــادەی جــــــەنگەن
تورک ئەرمـــەنیی جــــە دین بێـــزارەن
فـــەلاح و نەجـــاح پەرێمـــان نیـــەن
خـوشـووع و خـوضـووع مـودام هەزارەن

***

٢

میرزام دیم گۆڵی...

نە قەلعەی هەرات دیم جەمین گوڵێ
سەرتاپا بێ عەیب نیگارین گوڵێ
لار و لەنجەی خاص وینەی بوڵبوڵێ
دەستە بە دەستە حەی تاران حەی
دەستە بی وە بان کەتفان وەی
پێشانی چون جام خورشید ئەنوەر
مەدرەوشۆ نە طەرح چون قورس قەمەر
ناصیەی ئەو نوور حۆری زادەی حوور
سۆ مەدۆ نە جەرگ چون تیر فەخفوور
کۆرپە حەی وەچان دەور ناصیە
سەنعان وێڵ کەردەن وێڵ چە [کریوار!]
ئەبرووان دوو قەوس پەیوەستەن وە هەم
موژانان تیپ تیپ حەم مەدان وە حەم
دوو عەین مەخموور خەرامان دەستوور
تیپ موژانان مەدرا وە زەروور
صەف صەف بەستەن سوپای کێومەرز
وەی پەی قەتڵ ناحەق ئەولاد هورمز
بینی [شەمس!] زەڕ نوقرەی [فطانی!]
صەیقەل دادە یەد ئوستای فەڕەنگیی
زوڵفان ئەسوەدی سیای دەیجووریی
مەدرەوشۆ چون تووک طاوس بەحریی
چین چین خەم وەردەن نە دەور گۆنا
تیپ ئارا کەردەن چون سوپای دارا
هەر وەقت شەمیمش مەدۆ نە دەماغ
عەظم پوسیدە زیندە کەرۆ چاغ
ئەو نەفح زوڵفەین چون نەفەس عیسا
زیندە مەکەرۆ موردە نە صەحرا
گۆنا ئەحمەریی ئەبیەض داخل
گوڵناری و ئەبیەض بە هەم مەدا خل!

فـەم غـونچـەی نیـهـان یاقـووت نە تێـدا!
سـی و دوو لوئلوء عـــەکس مـــەدۆ پێـــدا
لوئلووی غـەڵطانیی پەیوەسـتـەن وە هـەم
سـی و دوو ددانـەن بـێ زیـاد و کـــــەم
چای فـــەم چون فنجـان حـــەوز کـــەوثـەرە
هـەر کێ مـــەنۆشـــۆ جـــە دین بێ بـەرە
طـوول گـــوڵناریی ئەبیـــەض [مـــداخل!]
ســۆ مـــەدۆ نە جـــەرگ لەت لەت مـــەبۆ دڵ
لەبان عـەقـیـقی سـفـیـدی پەیوەست
سـەفیدی و ئەحـمـەر جا گـەرتەن وە قـەصت
زنج و غـەبغـەبش چون سـێب خـوانسـار
مـەدرەوشـۆ نە طەرح شـووڵەی خـۆر ئێـوار
گـــەردەن مـــینای صـاف سـینە بلوورین
سـینـە لەوح سـیـم جـام فـــەخـــفـــوورین
چەند دانە زەمـڕووت تێ نیـشـان کـەردەن
نەقش نەقـاشـان مـەسـتـوو بـەردەن
پێـوە بـەند بیـیـەن دوو لیـمـۆی سـاوا
نـەفح و ئـەو لیـــمـــۆ رۆح مـــەدۆ جـــەلا
(دایم المدام) مـــــەخـــــفـی نە پـەردە
مـــەر وێش بـەو پـەنجـــە یەخـــە وا کـــەردە
ئەو عـــەطر لیـــمـۆی رۆح ئەفـزای حـــەیات!
مـــوردە مـاوەرۆ نـە رووی سـەر بیـسـات
چەند خـال مـیـشکیی نە دەورش تەندەن
رەژیدەی قـــودرەت پەس و پیش تـەندەن!
نـاف بـە وێـنـەی نـاف ئـاهـووی تـەتـاران
مـەملووەن جـە مـیـشک مـایەی عـەتاران
طەلیـسم ئەو گـەنج کـەسێ نەشکوفـتـە
کلیـدش نە دەست ئوسـتـای دوڕ سـوفـتـە
ئەو صـەفـحـەی شیشـەی سفید شیر مـاهی
مـەمـانۆ چون تووک بـەط سـەراویی

نەرمیی پاو پووز سفیدیی پەنجە
عالەم وێل کەردەن بەو لار و لەنجە
ئەو شۆخ [موورادم!] من کەرد ئەراگێل
دیسە مەگێلۆ نەهەردەی دوجەیل
بمانۆ ئەو شەخص تا قاف قیام
پەی دەردەداران زیندە کەرۆ رام
هانا بەو مەرقەد پادشای لەولاک
شای (قاب قوسین، وما ارسلناک)
تا دنیا نە پشت گاو ماهی بۆ
... ئەلطاف لا تناهی! بۆ
میرزام ئەو شەخصە ئەگەر مەونێش
... دوور مەوی بە وێنەی دەروێش
یە شەخصێ واتەن دوورکەفتەی وڵات
دووستاخ خاڵ خاس مەحبووب هەرات
ا ح م د دڵ پێوە بەندەن
پەی هەراتییان مات دەرمەندەن

تاریخ ٥ شهر ذی الحجه در سال هزارو دویست پنجاه و سه، در هنگام قلعهء هرات محاصره بود تحریر گردید.

٣

یا حەق زگارم
یا حەق جە ناحەق زار و زگارم
ئەر صەد شەرمەسار هەم غیصیان بارم
ئەگەر صەد هەزار بار گوناهکارم
ئەر صەد بار گونام جە قاف تا قافەن[١]

(١) ئەم پارچە بەم شێوە بەناتەواوی ماوەتەوە.

# کەشکۆڵی "سێتا"یش سەرچاوەیەکی تری ئەدەبی کوردی

٥٨٤

لەناو ئەو پاشماوەی کەشکۆڵ و بەیاضانەدا کۆم کردوونەتەوە و پاراستوومن، پاشماوەی کەشکۆڵێکی کۆنەی دڵۆپەلێدراوم لەلایە لە سەریم نووسیوە:

(کەشکۆڵی سێتا) و لە (ئەلبوومی کەشکۆڵ)یشدا تۆمارم کردووە.[١]

بەڵام تا ئێستە بە وردیی باسی ناوەڕۆکەکەیم نەکردووە و - وەک پێویست- بە مێژووی ئەدەبی کوردیم نە ناساندووە. لێرەدا شتێکی لەسەر دەنووسم.

**باسی دەستخەتەکە:**

دەستخەتەکە لە قەوارە و شێوەی پانی و درێژیی لاپەڕەکانیدا لە کەشکۆڵی (گوڵزاری بەهار) دەچێت. بەڵام دیارە ئەم خەتی مامۆستایەکی ترە.

ئەوەی کە ماوە (٣٠) لاپەڕەیە. سەرەتا و کۆتاییی دیار نییە.

لە ناوەوەیشیدا لێی کەوتووە. لە هەندێ شوێنیدا دڕاوی هەیە.

دڵۆپە لێی داوە و کەوتووەتە ناو ئاو، یان لە تاقدا ئاو بەسەریدا رژاوە و هاتووەتە خوارەوە. بەهۆی ئەوەوە مەرەکەبەکەی باشە نووسینەکەی نەکوژاوەتەوە، بەڵام چەند لاپەڕەی ئەمدیوە و دیوی تارمایی مەرەکەبەکەی کەمێک تێکەڵاویی لەناو دێرەکانی چەند لاپەڕەیەکیدا بەدی هێناوە.

ژمارەی دێری لاپەڕەکانی وەک یەک نییە، لاپەڕەی وای هەیە (٢٠) بەیتی تێدایە، لاپەڕەی وایشی هەیە (١١) بەیتی تێدایە.

پێوانەکەی (٢٠×١٦)ە.

نووسەرەوەی ئەم دەستخەتە کە دیارە لە هەواخواهانی تەریقەتی نەقشبەندی و مورید و مەنسووبی شێخ عومەری بیارە بووە، لە کەشکۆڵەکەیدا بایەخی تایبەتی بەو شیعرانە داوە کە لە پیاهەڵدان و ستایشی شێخ عومەردا بوون، واتە زۆرتر شیعری مورید و مەنسووبانی ئەو شێخەی لە کەشکۆڵەکەیدا کۆ کردووەتەوە. ئەمەیش بە ئاشکرا لەو باسە وەردەگیرێ کە لەسەر ئەم کەشکۆڵە نووسیم.

نووسەرەوەی کەشکۆڵەکە لەبارەی خۆی و مێژووی نووسینەوەی کەشکۆڵەکەیەوە هەندێ شتی

---

(١) بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغی، ئەلبوومی کەشکۆڵ، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم. چاپخانەی خانی دهۆک -٢٠٠٨.

نووسیوه، نووسینەوەیان هەندێک تیشک دەخاتە سەر خاوەنی کەشکۆڵەکە.

بەپێی ئەو مێژووانەی لەم چەند لاپەڕەدان دیارە ئەم کەشکۆڵە ماوەیەکی باش بە دەست ماموستا مەلا عەبدوڵلای خاوەنیەوە بووە و هاوڕێی هەمیشەیی بووە.

لە لاپەڕە (٥)دا دوای شیعرەکانی مامۆستای موسەنیف نووسیویە:

«تمت شد از ید عبدالله سیتاه* همگی گویم آه صدآه* برای محبوبهء چون ماه* در خانهء دەخدا* بیست و هفتم ماه رمضان المبارك* وقت چاشت خوردن بي چاشت* زیرا که روزه خوردن خطا است* سنة الف وثلاثمائة وخمسة بعد الهجرة النبی صلعم. سنة ١٣٠٥»

لە لاپەڕە (١١)دا نووسیویە:

«تمت شد از دست عبدالله سیتاه، تولدش در سنهء هزارو دوصدو شیصت و هشت هجری است. ١٢٦٨ هندو سهء عجم است»

لێرەدا هەندێکی دەستخەتەکە دڕاوە و شتێکی نووسینەکەی تێداچووە.

لە لاپەڕە (٢٤)دا نووسیویە:

«تمت شد از دست عبدالله سیتاه ١٣٠٧»

دەبێ ئەوەیش بڵێم: نازانم مەبەستی لە وشەی (سیتاه) چییە، ئەگەر (سیتاه)یش نەبێت. بە هەر حاڵ ئەگەر (سیتاه) بێت بە نووسینی کۆن هەڵدەگرێت (سێ تاه) بێت وەک نووسیومە. هەڵیش دەگرێت (سی تاه- ٣٠-) بێت. وەک هەڵدەگرێت (سەیتاه) بێت. هەر چۆن هەیە ئەمانە بۆچوونن.

ئەوەی روونە ئەوەیە مامۆستا کەشکۆڵەکەی - ئەوەی لەم بەشەدایە- لە نێوانی ساڵانی (١٣٠٥- ١٣٠٧)دا نووسیوەتەوە، خۆیشی لەو کاتەدا تەمەنی لە دەوروبەری (٤٠) ساڵدا بووە. ئیتر هیچی تر لە ژیانی و بەرهەمی تری نازانم.

**ناوەڕۆکەکەی:**

ئەم کەشکۆڵە - ئەوەی کە ماوە- ئەم بابەتانەی تێدایە:

١- پارچەیەک شیعری ئەحمەدی کۆر کە سەرەتاکەی بە:

ئاستانەی دڵبەری شیرین کەلام

(جنة الفردوس) و هەم (دار السلام)

دەست پێ دەکات. دیارە سەرەتاکە بەیتێکی کەمە و، نایشزانم پێش ئەوە چەندی تری تێداچووە. ئەم پارچە لە دیوانی ئەحمەدی کۆردا[1] هەیە، لە کەشکۆڵەکەدا (٥٠) بەیتە.

٢- لە لاپەڕە (٤)دا پارچەیەک شیعر نووسراوە، لە سەری نووسراوە (کلام کردی). پارچە

---

(١) بڕوانە: دیوان و شەرحی حاڵی شێخ ئەحمەدی کۆر (موکریانی)، لە: عەزیز موحەمەد پور (داشبەندێ) و لەگەڵ پێداچوونەوەی: مامۆستا هەژاردا. چاپخانەی پەیام، تاران، چاپی یەکەم، ١٣٧٨ (هەتاوی). ل. ٢٢١.

شیعرەکە بە زاراوەی گۆرانییە و، ئەمە سەرەتاکەیەتی:

صەدای زرەی زەنگ

شەبێ دیم ئاما صەدای زرەی زەنگ

هەندێک لە (قەتارییە)ی[1] مەولەوی دەچێت. ٢١ بەیتە.

ئیشارەی بۆ ناوی کەس تێدا نەکراوە، بەڵام بەپێی دوا بەیتی دەبێ شیعری شاعیرێک بێت کە نازناوی (زەلیل)ە، ئەمەیش دوا بەیتەکەی:

زەلیل (نو دقت) فامش بییەن کەم

هەرچەند شادیش بی داش وە مەتای غەم

٣- بەدوای ئەمەدا پارچەیەک شیعر دێت لەسەری نووسراوە:

(ولە ایضا) واتە ئەمەیش هەر شیعری شاعیری پێشووە. ئەم پارچەی دووەم دوو جار بڵاو کردووەتەوە، وام بیستووە کە شیعری مامۆستا مەلا ئەبوبەکری موسەنیفە.[2] ئەگەر وابێ دەبێ مامۆستا مەلا ئەبوبەکر لە شیعرەکانیدا (زەلیل) و (حەسەن)ی بەکار هێنابێت، چونکە لە کۆتاییی ئەم پارچەی دووەمەدا نووسیویە:

ئەر بە رەحـم وێت ببەخشای (حەسەن)

حەسەنات مەبۆ ئەحسەن هەی ئەحسەن.

***

لەبەرئەوەی بە بیرما نایێ ئەو پارچە شیعرەم بە بڵاوکراوەیی دیبێت و، ئەگەر شیعری مامۆستای موسەنیفیش بێت ئەوا تەمەنی لە چوارسەد ساڵ زیاترە لە کۆتاییی ئەم کورتە وتارەوە بڵاوی دەکەمەوە.

٤- لە لاپەڕە شەشدا پارچەیەک شیعری کوردیی لە ستایشی شێخی ضیائەدیندا هەیە، لەوە دەچێت شیعری شاعیرێک بێت کە نازناوی (کەیفی) بێت.

دوای ئەوە بچڕان و کەوتن هەیە کە نازانرێت کەوتووەکە چییە و چەندە، یەک بەیتی کوردی لە سەرەتای لاپەڕەی دوای کەوتنەکەوە بە کوردی هەیە کە ئاوایە:

وەکوو تیکرار و تەصریفی فەقێیان

لە بەحثی زوڵفی تۆیە قیل و قالم

***

---

(١) بڕوانە: دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە، لەسەر نووسینی مەلا عەبدولکەریمی مدرس. چاپی یەکەم. ل: ٤٩٩ .

(٢) دوو جار ئەم پارچە شیعرەم بڵاو کردووەتەوە؛ جارێکیان ناتەواو بوو، جاری دوایی تەواوم کرد. بڕوانە: کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، بەرگی چوارەم، ل: ٥٩

٥- دوای ئەوە پارچەیەک شیعری نالی دێت.

٦- دوای ئەوە پارچەیەک شیعری ئەحمەدی کۆر نووسراوە کە لە دیوانەکەیدا نییە، هەوڵ دەدەم لەم هەڵەدا ئەمەیش بنووسمەوە.

٧- لە دوای ئەوەوە پارچەیەک شیعری کوردیی خاوەن دیارینەکراو نووسراوە، حەوت بەیتە.

٨- لە لاپەڕە (١٢)دا پارچەیەک شیعری (جامی) نووسراوە.

٩- لە لاپەڕە (١٣)دا پارچەیەک شیعری کوردیی قادری ساوجبلاغیی هەیە لە ستایشی شێخی ضیائەدیندا. ئەم پارچە شیعرە (٢٧) بەیتە، دوای ئەوە سێ بەیت نووسراوە لە ستایشی (فاروق)دا دەبێ ئەویش هەر لە ستایشی شێخی ضیائەدیندا بێت. دوای ئەوەیش لە لاپەڕە (١٦)دا پارچەیەکی تر شیعری میرزا قادری سابلاغی بە کوردی هەیە.

١٠- هەر لە لاپەڕە (١٦)دا پارچەیەک شیعری مستەفا بەگی کوردی هەیە.

١١- لە لاپەڕە (١٨)دا شیعری (حەریق) و دواتر شیعری (کوردی) هەیە.

١٢- دوای ئەوە پارچەیەک شیعری فارسیی خاوەن دیارینەکراو و دوای ئەویش بەشێک لە پارچەیەک شیعری عەلی حەریری نووسراوە.

١٣- دوای ئەو لاپەڕە و پێش لاپەڕە (٢١) بچڕان هەیە و دیار نییە کەوتن و بچڕانەکە چەندە. دوای ئەوە، واتە سەرەتای لاپەڕەی (٢١) بە پارچەیەک شیعری کوردیی ناتەواو – لە سەرەتاوە– دەست پێ دەکات، پێ دەچێ شیعری (مەستی) ناوێک بێت.

١٤- لاپەڕەی ٢٢ و بەشێکی لاپەڕە ٢٣ شیعری فارسییە لە ستایشی شێخی ضیائەدیندا.

١٥- لە لاپەڕە (٢٣)دا پارچەیەک شیعری ئەحمەدی کۆر دەست پێ دەکات کە لە دیوانەکەیدا هەیە تا لاپەڕە ٢٤ دەخایەنێ.

١٦- سەرەتای لاپەڕە (٢٥) پارچەیەک شیعری مەلا (عەبدوڵلای جەلی)یە بە فارسی قافییەکەی (...استی)یە. پارچەکە (٣٠) بەیتە.

دوای ئەوەیش پارچەیەک شیعری (٢٤) بەیتی کوردیی جەلیی نووسراوە. هەوڵ دەدەم هەردووکیان بنووسم.

١٧- دوای ئەوە (٤) چوار بەیت و پارچەیەک شیعری فارسی دێت. دەستخەتەکە لە لاپەڕە (٣٠)دا دەبڕێتەوە، بەڵام ئاشکرایە کە ئەو بڕانەوە تەواوبوونی دەستخەتەکە نییە و نازانرێت دوای ئەوەیش چەندەی لێ کەوتووە.

لە کۆتایی ئەم کورتە باسەوە پێش ئەوەی بێمە سەر نووسینی شیعرەکانی دەڵێم: دەستخەتەکە لە هەندێ شوێندا – نادروستی و هەڵەی نووسەرەوەی تێدا دەبینرێت، لەوانەیە ئەویش وای دەست کەوتبێت، لە پەراوێزەوە کەمە– کەمە ئاماژە بۆ دروستیی شوێنەکان دەکەم.

دەبێ ئەوەیش نەبوێرم کە شیعرەکانی مامۆستا مەلا عەبدوڵلای جەلی پێشتر نموونەیان لە (کۆیە و شاعیرانی)دا لێ بڵاو کراوەتەوە، بەڵام ئاوا بە تەواوی بە بڵاوکراوەیی نەمدیوە.

## کەلامی کوردی

صـــــــــــــــەدای زڕەی زەنــگ..

شـــەبێ دیم ئامـــا صـــەدای زڕەی زەنگ

زەواریێ نە مــوڵک کــارخــانەی فــەڕەنگ

یابوویێ نە خــەم کــەردەن وە پێـشـــەنگ

صــەد قـەتاری غـەم پەیوەسـتـەن وە هەم

هـەزار طـەنبـــەڵی ئاوەردەن نە غـــــەم

منیش نیـشـتـەبێم نە جـایێ بێـدەنگ

نە گــۆشم ئامـــا صـــەدای زڕەی زەنگ

هۆرێزام سـەرسـام واتم: یە چێـشــەن؟

واتن: بازرگــان مــەتای غــەم پێـشـــەن

واتم: خــواجـاکـای[1] کـامین مـەکـانەن؟

واتشـــان: خـــواجـــای شـــار غـــەمـــانەن

ئیـسـمش غـەمگینەن هـەر غـەم بارشـەن

چەند سـاڵ[2] خـەرید غـەمـان کـارشـەن

ســـا ئێـــد شنەفـــتم هۆرێزام دەردەم

تا شـیم وە پێشـواز تیـجـارباشـیی غـەم

واتم: نەوجەوان[3] خـەرقەی غـەم وە دۆش

ئەی تیـجـارباشـیی مـەتای غـەم فـرۆش!

سـاتێک درەنگێ قـافـڵـەکـەت لەنگ کـەر

خـــەرید مـــەتای غـــەمـــان لە یەک دەر

سا کە ئێد شنەفت خواجای[4] دڵ غەمین

فـــەرمـــا: ســـارەبان بار وست نە زەمین

من چەنی تیـجـار خــواجـای پڕ هـونەر

کــەردمــان قــیـمـــەت هەردوو بەرابەر

دەست شـیـراو بەیع هـەردوو داین وەهەم

ئەو بی وە بایـع من مـوشـتــەریی غـەم

(١) خواجەکەی بێت باشترە.

(٢) لە بری (ساڵ) ئەگەر (ساڵەن) بێ باشترە.

(٣) رەنگە (نۆجوان) باشتر بێت.

(٤) لە هەموو شوێنەکاندا راست وایە (خواجە) بێت.

مامەڵەی قیمەت شادیی و غەم کەردین
وێنەی قەپانچیی قەپان ئاوەردین
هەرچەند شادیم بی کێشام وە غەمدا
کەردم نە حوجرەی دڵەی ماتەمدا
حوجرەی دەروونم نە غەم کەردم پڕ
نامم مەنشوور بی بە خواجای غەمکڕ
بەو طەور جە ئەزەل بەختم ناخاسەن
ئیستە نە بازاڕ مەتام کەساسەن
بێ قیمەت کەفتەن نە بازاڕەدا
چمان مینای وێش داش وە خارەدا
ئینشاڵڵا[1] و ڕەحمان سوودش خاس مەبۆ
نەزانام نە بەخت من کەساس مەبۆ
وە هەر طەورێ بۆ جە من بستانۆ
وەرنە تا مەحشەر جەلام مەمانۆ
(زەلیل) نەو وەخت فامش بییەن کەم
هەرچەند شادیش بی داش وە مەتای غەم

## کەلامی ئەحمەدی کۆر

ڕوحەکەی خۆم! بۆ چ نەکەم ڕوح و دڵ و دینم فیدات؟
وەک شەککەر خۆشە قسەت، شیرینە لێوت وەک نەبات
ئاوی لێوت ئاوەکەی خضرە نە وەک چاهی [دەرت!]
بۆیە کەوتوومە چاهی چەناگەت نۆش بکەم ئاوی حەیات
پەرچەم و کاکۆڵەکانت بێن خۆشترن هەردوو لە میسک
خاڵی ڕووی ئەتۆ[2] بەنەوشە سونبولە خەططی سیات
ماهی نۆ هەروەک برۆتە ڕوومەتت هەروەک هەتاو
[کر... کوی] خەڵقی دەڵێن: ڕۆژ بوو هەڵات!
چاوەکانت بە ساحیریی لەکن من مردووان زیندوو دەکەن
من چ غەممە گەر بماوێتە بە دڵ تیرەی نیگات

---

(١) ئەگەر (ئینشاڵاو) بێت ڕەساترە.
(٢) ئەگەر (تۆ) بێ باشترە

نێوقەدت باریکە وەک موو، قامەتتە سەروی راست
سپیەتیت کافوور دەبیژی، گەردەنت هەروەک مینات
نەک بە تەنها من گرفتاری غەمی عیشقی ئەتۆم
بەڵکە شەیدا بوون لە بۆت صنفی مەلا و شێخی وڵات
صۆفییان[١] کونجی عوزلەتیان[٢] بۆ خۆیان دەگرت
ئێستا هاتوون هەموو وەک کەر کەوتوون لەلات!
خەرقەکەی بەریان دڕاند و دین و ئیمانیان فرۆت
تەکیەکەی خۆیان بەجێ هێشت بوونە خۆڵی ژێری پات
یووسفی میصرە[٣] عەزیزم تۆ منم یەعقووبەکەت
نابێ رەحمێ بکەی[٤] بە حاڵی پیرەکەی جەور و جەفات؟
دووکەڵی ئاه و هەناسەم عالەمی کردۆتە تەم
ئاگری کوورەی دڵی من وا دەسووتێ سات بەسات
چاوەکەم کوانێ وەفا و شەرتەکەی ئەو جارەکەت؟
چی بەسەرهات- روحەکەی خۆم! - گەوهەری شەهوارەکەت
زاهید و، شێخ و، وەلیی هەرسێک دەیانکرد مەنعی من
ئەوێستا- عەزیزم! - غەم دەخۆن بۆ گوڵی رووخسارەکەت
شێخەکەی دوێنێ کە تەعنەی لێ دەدام[٥]
ئیمڕۆ مێزەری سووتا لە عیشقی چاوەکەی بیمارەکەت[٦]
چاوەکەم کوێر بوو ئەوەندە گریام لە دووری چاوی تۆ
بۆم بنێرە - توو خودا- لەو تۆتیاکەی خاکی پات
با وەفاکەت دەرحەقی (ئەحمەد) تەواوبێ رۆژ بەڕۆژ
چونکە موشتاقی ئەتۆیە ناگاه دێ وەقتی وەفات.

(١) ئەگەر لێرەدا (وا) یەک هەبێ باشترە.

(٢) لێرەیشدا (لە)یەک ببێ باشترە..

(٣) رەنگە (میصری) بێت باشتر بێت.

(٤) ئەگەر (کەی) بێ رەوانترە.

(٥) لێرەدا تێکەڵاویی لە نێوان دوو باڵی بەیتەکەدا دروست بووە و دەبێ ئاوابێت:
(شێخەکەی دوێنێ کە تەعنەی لێ دەدام ئیمڕۆ ئەڵێ)
مێزەری...

(٦) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پێشوو قافییەکانیان لە تەک قافییەی ئەم پارچە شیعرەی ئێرەدا ناگونجێت و وەک ئەوە وایە لە پارچەیەکی تر بن، بەتایبەتی بەیتی یەکەم (چاوەکەم کوانی...) وەک سەرەتای پارچەیەکی تازە وایە.

## مەلا عەبدوڵڵای جەلی

دەبێ پێش ئەوەی شیعرەکانی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای جەلی بڵاو بکەمەوە بەسەر ئەوەدا نەڕۆم کە لە (م. و)دا چەند شوێنەواری مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای جەلیم دیوە لێرەدا ناونووسکردنیان دەبێت بە زیادە ڕوونکردنەوەی بەرهەم و ژیانی مامۆستای جەلی.

١- لە دەستخەتی ژمارە (١١/٤٣٣٦١م. و)دا فەتوایەکی ئەم مامۆستا هەیە لەبارەی ساڵی باڵغبوونی کچەوە بە شایەتیی- شایەتی جیا- جیا.

٢- دەستخەتی ژمارە (١١٩٣٩م. و)ش دانراوێکی ئەم مامۆستایە لە بەیاندا.

٣- دەستخەتی (٣٠٤٥١م. و)یش دانراوێکی حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلییە بە ناوی (تحفة الطلاب شرح خلاصة الحساب). محەمەدی کوڕی حاجی ئەبوبەکری بانەیی وەقفی کردووە. دەستخەتی (٣٦٦٧٨)ش نوسخەیەکی تری ئەو کتێبەیە.

٤- مەولوودنامەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای جەلیی چەندان نوسخەی لە کتێبخانەی ناوبراودا پارێزراوە ئەمە ژمارەی هەندێکیانە:

(١٤٥٢٩) نوسخەیەکی باشە ئەحمەدی یادئابادی ساڵی ١٣٤٤ بۆ مەلا ئەحمەدی شەقڵاوەیی نووسیوەتەوە. ئەم ژمارانەی تریش نوسخەگەلی ئەو دانراوەن: (٢٢٠٨٦، ٢٤٠١١، ١٤٥٢٩، ١٧٠٠٢، ٢١٢١٨، ١٨٧٣٧، ٢٠٣٦٩).

٥- نامەی مەلا عەبدوڵڵا بۆ شێخی ضیائەدین سێ ژمارە و سێ دانەی هەیە کە ئەمانەن: (٢/ ٢٦٠٩٥ ، ١٨١٩٣، ١/١٤١٩٩).

### کەلامی حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی

(یا سـیـد الرسل) چە غـەریبـە حـیکایەتم؟
(یا هادي السـبل) جـە عـەجـیبـە شکایەتم؟
ئەدبار و رووسـیـاە و فـەقـیـر و قـەلەندەرم
بێ فـیکر و ذیکر و هـۆش و (قلیل البـضـاعـتم)
بیللاهی دڵ فـیگار و مـوبەڕڕام لە خـوڵقی چاک
تەڵڵاهی شـەرمـەسـار و مـوعـەڕڕا لە طاعـەتم
بۆ مـەدحی ئەهلی فـەقـر زوبان لاڵ و ئەبکەمم
وەقـتی ثەنای ئەهلی غـینا پڕ فـەصاحـەتم

عـومـری عـەزیز بە جـیـفـەیی دنیـا تەلەف بوو
بێ قــووت و بێ زەخـیـرەی راهی قـیـامـەتم
سـەر تا قـەدەم وجـوود نوحـووسـەت قـەرینی من
چاکـیی تیـا نیـیـە، هەمـوو عـەیب و قـەباحـەتم
بۆ راهی ئاخیـرەت بە میـثلی مـوور سست پام
بۆ تۆشـەی جیـهان سـەگ و ضـەیفـەم مـەهابەتم
گـەر چە عـەمـامـەکەم سپییـە و پێم دەڵێن مـەلا
قـەلبم رەشـە مـیـثـالی [قـشـەی!] بێ هیـدایەتم
هـەنگامی دەرس خـوێندن و قـورئـان بەبێ درۆ
مـەفهوومی ئایەی قـەمطەریر و عەبووسە قیافـەتم
وەقـتی نیـفـاق و غـەیبـەت و تەزویر و ئیـفـتیـرا
بە دائیم لە صـەدری مەجلیس و ئەیوانی عیززەتم
مـــوونەوەرە هـەیکەلی زلم و قـــامـــەتی بڵند
مـەعنام گـەلێ بچووکە دەنی و پەستە هیـمـمـەتم
نەم مـاوە چـارە ئەی دڵ پڕ غـەم چە قـوڕ بکەم(!)
هەردەم هەناسـەکێشی غەم و دەرد و حـەسرەتم
ئەی شـاهی ئەنبیـا و دوڕ[1] سـەری تاجی ئـەولیا
رەحـمێ بە حـاڵی من کە سـەگی خـاکی دەرگـەتم
حـیـفظم بکە لە وسـوەسـەی دێوی لەعنەتیی
چونکە فـەقـیـری تۆو و دۆعـاگـۆیی ئوممەتم
مەمخە چنگی حوکمی هەوا و دەستی نەفسی بەد
گـەر هیچ نییـەم لە زومـرەی ئاحـادی میللەتم
بگرە بە لوطف و مـەرحـەمـەت دەستی ئەم سـەگە
هـەرچەند خـەسیس و پیس و سـزاواری نەفـرەتم
بەشـــقی چـەهـار یاری گــوزین و مـــوبارەکت
ئاگـات لە من بێ وەقـتی سـەفـەرگـاهی ریحلەتم
ئیمـان لە شەڕ و شۆڕشی شـەیطان خەلاص بکەم
شـەرمن نـەکـەی بە داوەت جـاندانی سـەکـرەتم

(١) ئەم (دوڕ)ە نەبێ باشترە.

جێگەم بکە لە شاری شەفاعەت لە رێی خودا
قوربانی دار و بەرد و زەن و مەرد و طیبەتم
خورەم بکە لە رۆژی جەزادا بە رووی سفید
چونکە فیدای [وادەی روضای!] رەوضەتم
دوورم بخە لە ئاتەش و بم[1] ئاوی ناو بەهەشت
مات و مەلوول کە دوشمن بێ دین و دەولەتم
مەطران و جاشلیق و قەشە ئوسقوفی لەعین
شادان مەکە بە ضەرب و ئیهانە و سیاسەتم
صەد جار سەگێکی پیس و گروێم هەزار شوکر
چونکە سەگی محەمەد و ئەصحابی عیزەتم
وەرنە (جەلی) چە حەددی تۆوە ئەم شکایەتە
بۆ خۆی دەزانێ حاڵ و حەواڵ و حیکایەتم

## کلام حاجی ملا عبدالله کوی

تا بکی ای دل اسیر نفسی بی پرواستی؟
مائل جا هو جلال و طالب دنیاستی
بهر دنیا هر زمان در گردش و در کوششی
غافل از ترتیب اسباب ره عقباسی
روبروی اهل دنیا پشت بر ارباب فقر
(فی المثل) مهر غنارا هم سر حرباستی
در منام و غیبتی دور از مقامات شهود
غرق بحر لابستی بی کشتی إلا ستی
بهر تکلیفات عقبا همچو موری سست پا
بهر تحمیلات دنیا اشقر شش پاستی
کس ندیدی زین خراب آباد دنیا پایدار
بگذری از وی اگر اسکندرو داراستی
میروی عریان سوی ملک بقا ای پادشه
گر چه فارغ در لباس اطلس و خاراستی
میخورد کرمان وجود نازکت در گور تنگ
گر شهی گر مانیو گر والی والاستی

(١) دەبێ ئەم (بم)ە [بمشۆ] بێت و نووسەرەوە لە بیری چووبێت.

میشوی در زیر قاف قبر پنهان بیگمان
گر سلیمان زمانستی و گر عنقاستی
زار میگردی بزیر پنجهء شیر اجل
گر ملای پر بلا گر شیخ و گر آغاستی
چون سموم قهر مردن میوزد بی اختیار
خشک لب جان میدهی گر برلب دریاستی
لشکر شاه اجل هنگام ضرب و گیر و دار
میرباید جان ز تن گر پیر اگر برناستی
سائیلان قبر با گرز گران آتشین
(یسألان عنك) گر سلطان تخت آراستی
می بکوبندت مثال پتک آهنگر یقین
گر گنویی بی غلط دردم جواب راستی
روز رستاخیز چون بینی زهر سو ولوله
مست و حیران میشوی گر عاقل و داناستی
دفتر عصیان سیاه وصفحهء رویت سیاه
در میاه رو سفیدان چون سگ رسواستی
گاه أفتی گاه خیزی غرق دریای عرق
گوییا مست مدام نشئهء صهباستی
می کشندت چون خر مرده بمیدان حساب
می نیاری دم زدن گر خود خری عیاستی
از زفیر نار دوزخ وز شهیق دوزخی
صعقهء میگیردت گر حضرة موسا ستی
نیست امید نجاتت از حساب و وز عذاب
گر نه خاک پای شاهی تخت او ادنی ستی
احمد مرسل محمد آنکه امکان ز ابتدا
بهر ایجاد جنابش از عدم برخواستی
ای شفیع المذنبین وی چاکرت روح الامین
خزنه‌دار مخزن اسرار (ما او حی ستی)
جمع شد در سینه ات انوار علم لا یزال
عالم علم محیط (علّم الاسما) ستی

با سـمـوم قـهـر تو جنّت شـود بئس المصـيـر

بـا نـسـيـم لطف تـو دوزخ فـرح افـزاسـتـى

داعى ايجـاد عـالم از كـمـينيگاه عـدم

بـانـى اصـل واسـاس سـنـت غـرّاسـتـى

قـبـهء خـضـرا عـجـوز آسـا بگريد روز شب

چونكه فـخـر و آبروى تـودهء غـبـراسـتـى

رتبـهء ادنـاترين خـادمـان روضـه ات

برتر از نـو آسـمـان (جنة المأوى) سـتـى

وارث نـور و بـهـاى انبـيـاى مـرسلين

باعث كـرى بنـاى شـوكت كـراسـتـى

با بكەم تەعديلى نەظم و قافييە و رەويەى عەرووض

بەم زبانە هيـچى تر شـيـعـرم لە بۆ هـەڵناسـتـى

بيكەمـە كـورديى زبانى خـۆمـە چاكى تێ دەگـەم

خـوايە تـەوفـيـقـم بدەى من بندە تـۆ مـەولاسـتـى

# نامەیەکی بڵاونەکراوەی مەولانا خالید

٥٨٥

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عەبدولکەریم چەندەی هەوڵ داوە و، چەندە- بەتایبەتیی لە کۆکردنەوەی نامەکانی مەولانا خالیددا- سەرکەوتوو بووە، دیارە هێشتا نامەگەلێک، یان گەلێ نامە ماون کە مامۆستا دەستی پیایاندا نەگەیشتووە و پەیی پێ نەبردوون، دۆزینەوەی هەر نامەیەک لەو نامانە و خستنیە سەر خەرمانی سامانی مەولانا، پڕکردنەوەی کەلێنێکە لەو کەلێنانە، بەڵکو زیاتر ژیانی ئەو کەڵەپیاو و کەڵەزانای گەلی کوردە روون ببێتەوە.

ئەم نامەم لەناو ئەو پەڕە پەڕانەدا دەست کەوت کە مەلا عوسمانی موفەتیشی ئەوقاف کۆی کردوونەتەوە و، ماوەی سوود لێوەرگرتنی پێ دام.

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله وسلام على عباده الذين اصطفى.

امید که مهیمن بنده نواز بیهمال و کریم خطابخش ذو الجلال، آثار تجلّیات جلال را از نفس و ملك و اموال وروح و أولاد و عیال آن مرکز دائرهء کمال بردارد، وبر نواحی ومحال أعداء دین ومخالفان ملّت سيد المرسلين- صلى الله عليه وعلى آله وصحبه أبد الآبدين - بکمارد آمین.

باز بیاد آوری فقیر بیمراد خامهء منشیان عطارد منشان را تصدیع و شمهء ینابیع فتوّت ووفارا بجوش وبحور صحبت قدیمهرا بخروش آورده، وطلب ادعیهء مستجابه در أزمنهء مستطابه نموده بودند، رسید، دل غافل را چنان بیدار نمود که گویا مجنونِ بیدارا از شهپر پری سایهء، و یا عندلیب شیدارا از شمیم گلشن وایهء آمدو، آنچه از آلام درد فراق، ولواعج آتشگدهء اشتیاق بر زبان آنعزیز نکند، وآن گذشتد بود همهرا جناب سید احمد تفصیلا أدا نمود. باز أورا توصیه وسفارش نمودیم، ألبتّه کما هی احوال را بگوش حکمت نیوش خواهد رسانید، ومادام التفاتی برواج سنت سنیه ورفع بدع ردّیه داشته باشند...

طلب دعا ازین مسکین از مقولهء تحصیل حاصل است، واگر بعض موانع نمیبود میخواستیم که سید أحمدرا باخود بسفر حجاز ببریم، اگر بدین دو بیت حافظ نامهرا ختم نمودن انسب نمود:

روز وصـل دوسـت داران یـاد بـاد

یـاد بـاد آن روزگــــاران یاد باد

گـر چه یاران فـارغند از حـال من

از من ایشــــان را هزاران یاد باد

لێرەدا وا پێ دەچێت کە ئەم نامە تەواو بوبێت، بەڵام لە هەمان پەڕەدا لە ئەودیوی لاپەڕەکەوە شتێکی تر بە هەمان خەت نووسراوە، لەوە دەچێت تەواوکەری ئەم نامە بێت، وا ئەوەیش لێرەدا دەنووسین:

عزیز من چنانکه میفرمودندو چنان بود، بدِ همسایەرا همایسه داند، سرشتِ طفلِ بدرا دایه داند، ما مرید ومتعلقان خودرا بهتر میشناسیم. اگر ملا عبدالله هراتی نباشد هرگز نظام خانقاه مبارکه براه نمیرود، وهرکس نسبت بدو چیزی گوید أز حظّ نفسی یا بشریّتی خالی نخواهد بود (من کل الوجوه) اورا وکیل فقیر دانندو، سخن هیچ مرید خلیفەرا نسبت باو قبول نفرمایند، در ایام بودن فقیر انواع أموررا نسبت باو بحضور این بیحضور میرسانیدند همه بیحاصل بود! خلاصه باید تا وقت معهود نگذراند هیچ کس اورا مکدّر کند، والسلام ختام.

اضعف العباد خالد النقشبندی المجددي اللهم اهدنا صراطك المستقيم.

**لە پەنای ئەم دەقەیشدا یەک دوو مێژوو تۆمار کراون** لەوانە:

* کۆچی دوایی سولەیمان پاشای کوڕی عەبدوڕەحمان پاشا و دانیشتنی ئەحمەد پاشای کوڕی لە شوێنی، کۆتایی مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٢٥٥ک. بەڵام گورگ هێنان بۆ ئەحمەد پاشا کە لەوانەیە پڵنگ خەوتبێ.

* کۆچی دوایی خوا لێخۆشبوو بەهەشتی مەحموود پاشا و دانانی سوڵتان عەبدولمەجیدی کوڕی لە جێگەی، خوا تەمەنی درێژ کات و پایەبەرزی بکا ساڵی ١٢٥٥ک.

# نوسخەیەکی نایابی تەفسیری بەیضاوی

٥٨٦

ڕۆژی ٢٠٠٩/٤/٢٦ لە سەردانێکی بەڕێز فوئاد عارفدا دوو شوێنەواری پڕ بایەخی کەلەپوور و کولتووری کوردیم بینی.(١)

یەکێکیان نوسخەیەکی نایابی (تەفسیری بەیضاوی)یە، کە خۆشنووسی گەورە و لەبیرکراوی کورد عەبدوڵڵای کوڕی مەلا عەبدوڕەحمانی کەرکووکی نووسیویەتیەوە. ئەم کتێبە پیرۆزە جگە لەو بایەخەی لە ڕووی ئاینییەوە وەک تەفسیرێکی جێ متمانەی زانایان - بەتایبەتی زانایانی کورد- و تەفسیری قورئانی پیرۆز.. هەیەتی، دوو بایەخی تایبەتیی بۆ مێژووی کورد هەیە:

یەکەمیان: بۆ مێژووی خۆشنووسانی کورد کە مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای نووسەرەوەی ئەم کتێبە پیرۆزە یەکێک بووە لەو خۆشنووسانە کە بەداخەوە تا ئێستە - من بزانم- هەواڵێکی نازانین و هیچمان لە شوێنەوارەکانی - کە بێگومان کەم نەبوون- لە دەستدا نییە.

مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا بەم کارە ڕەنگینەی دەچێتە ڕیزی خۆشنووسە دەستڕەنگینەکانی کوردەوە و ناوی لە لاپەڕەی زێڕیندا - وەک خۆی پێشتر بۆ کەسانی تری کردووە- تۆمار دەکرێت، دەبێ بگەڕێین و چاوەڕوان بین بەڵکو لەمەولا هەواڵ و شوێنەواری تازەی بدۆزینەوە و زیاتر لە بەرهەم و سەردەم و ژیانی شارەزا ببین.

دووەمیان: ئەو بایەخدانە بێ برانەوە و بارساییی نەزانراوەی میرانی بابانە بە زانست و هەوڵدانیانە بۆ گەشەپێدان و ڕازاندنەوەی کتێبخانەکانیان بە کتێبی نەوازە و جوان بە دەستخەتی خۆشنووسانی دەستڕەنگین و باڵادەست.

ئەم شوێنەوارە یەکێکە لەو شوێنەوارانەی شیاوی ئەوەیە - وەک کاتی خۆی میری بابان ویستوویەتی- بە جوانترین شێوە لە مۆزەخانەی تایبەت و جێگەی بایەخداری وڵاتدا بپارێزرێت.

**باسێکی ئەم دەستخەتە:**

ئەم دەستخەتە یەکێکە لەو دەستخەتانەی کە پێیان دەگوترێ (خزائنی= گەنجینەیی) واتە بۆ گەنجینەی دەستخەتی میر و دەسەڵاتدارێک نووسراوەتەوە. بەرگێکی پێستی ڕەقی نەخشێنراو بە گوڵی جۆراوجۆری بە ڕەنگەکانی: قاوەیی و پرتەقاڵی و تەڵایی و سەوز و سپی هەیە، لەبەرئەوەی باش هەڵنەگیراوە بەرگەکە لە بنەوە و سەرەوە تەقیوە و لێی بووەتەوە.

---

(١) برای بە نرخم کاک شێخ حەسیبی بەرزنجی بوو بەهۆی ئەم سەردانەم، وەک هەر ئەویش بوو هەواڵی ئەم شوێنەوارانەی پێ دام.

له سـەرەتاوە دوو سـەرلەوحـەی جـوانی بە گـەڵا و گـوڵ و ڕەنگەکـان ڕازێنراوەی هەیە. لەژێر سەرلەوحەی یەکەمدا فیهرەستی لە پەڕەی (٣٨٧ سورة الملك)ەوە تێدایە. تا کۆتاییی تەفسیرەکە کە پەڕەی (٤١٨)یە. بەم پێیە دەبێ فیـهرەسـتی بەشـێکی کەوتبێت و، ڕەنگە سـەرلەوحـەیەکی تریشی کەوتبێ.

ئەمە یەکێکە لەو دەستخەتە دەگمەنانە کە ژمارە بۆ لاپەڕەکانـی دانرابێت. جگە لە ڕازاندنەوەی سەرەتاکەی هەموو لاپەڕەکانی دوو چوارچێوەیان بۆ کراوە، چوارچێوەی یەکەم کە بە دوو خەتی تەڵایی کەمێ ئەستوور و پان کراوە تەفسیرەکەی لەناودا نووسراوە. چوارچێوەی دووەم یەک خەتی تەڵایی لەوی تر باریکترە پەڕاوێز و تەعلیقاتی زانایان و تەفسیرەکانی تر و قیرائەتەکانی قورئانی پیرۆزی تێدا نووسراوە.

تەفسیرەکە بە خەتێکی نوسخی زۆر جوان و بە مەرەکەبی ڕەش نووسراوەتەوە. قورئانەکەی ناو تەفسیرەکەیش بەهەمـان شێوە، بەڵام بە مەرەکەبی سوور و سـەر و بۆر بۆ کراویی نووسراوەتەوە. هەر لاپەڕەیەکی - بێجگە لە پەڕاوێزەکـان- (٣١) دێری تێـدایە. پێـوانـەکـەی (٢٥×١٥)یە. (٨٣١) لاپەڕەیە. لە کاغەزێکی تەنکی تورمەدا نووسراوەتەوە.

سـەرەتای سوورەتەکـان بە پانکۆڵەیەکی تەڵایی بە ئەندازەی دوو دێر بە ئاوی تەڵا ڕەنگکراو جیا کراوەتەوە. ناوی سوورەتەکە و ژمارەی ئایەتەکانی و باسی (مکی) یان (مدنی) بوونی سوورەتەکە بە مەرەکەبی سپی لەسەر ئەو پانکۆڵە تەڵاییە نووسراوە.

لە کۆتاییەوە چەند پەڕەیەکی لێی بووەتەوە، بەڵام باشە پارێزراون و تێدانەچوون.

لە دوا لاپەڕەیدا کـە تەفـسـیـرەکە کـۆتایی هـاتووە نیو لاپەڕەی سـەرەوەی بە گـوڵ و ئاوی تەڵا و ڕەنگەکانی مەرەکەب نەخشێنراوە.

یەکـێـک - دیارە بـۆ شـوێنـەونی- دوو دێری لە باسـی نووسـینەوەکـەی و ناوی نووسـەرەوە و بۆ نووسراوەی بە مەرەکەبی شین ڕەش کردووەتەوە. بەڵام باشە بە زەحمەت دەخوێندرێتەوە.

**ئەو نووسراوی کۆتاییە وەک خۆی دەگوێزمەوە ئێرە:**

«قد وقع الفراغ من تحرير القاضي بيضاوي الشريف في يوم السبت في وقت الضحى من يوم السادس في شهر محرم الحرام على يد العبد الضعيف الحقير الفقير عبدالله بن ملا عبدالرحمن الكركوكي لأجل مولانا العظام وعالي الهمام محمود پاشا المكرم ابن خالد پاشا الأكرم في سنة سبع وتسعين ومائة بعد الألف من الهجرة النبوية المصطفوية بحرمة سيد البشر.

اللهم اغفر لنا ولوالدينا ولوالد والدينا ولاوستادنا[٢] ولمشايخنا خاصة ولمن سبب في تحريرنا هذا

(٢) ئەم نووسەرەوە بەڕێزە بەپێی (مولانا العظام وعالي الهمام) دەبێ کەمێ عەرەبییەکەی لاواز بێت. بەپێی ئەم وشەیش (لاوستـادنا) دەردەکەوێ کە ئەمە پێش (٢٤٠) ساڵ نووسراوەتەوە لەو کاتەوە زەوقی نووسـەرەوەی کـورد وابووە - وەک دوایی وای لێ هاتووە- کـە لە باتی سـەر و بۆری عـەرەبی پیت لە ڕێنووسی کوردیدا بەکار بێنن.

التفسير الشريف بحرمة مولانا محمد- صلى الله عليه وسلم وعلى آله وأولاده وازواجه وذرياته - آمين برحمتك يا ارحم الراحمين».

شوێنەواری دووەم کە لەو سەردانەدا لای بەڕێز فوئاد عارف بینیم شەجەرەی بنەماڵەیەکی بەرزنجییە کە فوئاد عارف لە لقێکی ئەو شەجەرەیە بە یارمەتیی خوا لە ناو شەجەرەکاندا باسی دەکەم.

قد وقع الفراغ من تحرير القاضي البيضاوي الشريف في يوم كتبت في وقت الضحى من

سبع وتسعين ومائة بعد الالف من الهجرة النبوية المصطفوية على صاحبها

سيد كبير اللهم اغفر لنا ولوالدينا ولوالد والدينا ولاستادنا

ولمشايخنا خاصة ولمن سبب في تحريرنا هذا التفسير

الشريف بحرمة مولانا محمد عليه الصلوة والسلام

وعلى آله واولاده وازواجه وذرياته

آمين برحمتك يا ارحم

الراحمين

م

## دوو دانراوی سەید ئەحمەدی نەقیبی یەکەم

٥٨٧

دانراوی یەکەم: ناوی (خلاصة العقيدة في شرح الدرة الفريدة) دیارە بەم دانراوە شەرحی هۆنراوەی (الدرة الفريدة)ی شێخ مەعرووفی نۆدێیی کردووە. بەداخەوە ئەم دانراوە هەر سەرەتاکەی دیارە و نازانرێت چەندەی لێ لەناوچووە. ئەوەی کە لە دەستدایە حەوت لاپەڕەیە، وا دیارە نووسەرەکەی تەواوی نەکردووە؛ چونکە لاپەڕەی حەوتەم تەواو نەکراوە تا بڵێین لاپەڕەکانی دوای ئەو لاپەڕە تێداچوون.

سەرەتاکەی دوای (الحمدالله) و صەلات و سەلام ئاوایە:

«اما بعد: فيقول الفقير إلى عفو الملك المنجي احمد بن السيد محمود الگله زردي النودهي البرزنجي: لما رايت الرسالة المنظومة الموسومة بـ(الدرة الفريده) مع صغر حجمها و وجازة نظمها، مشتملة على فرايد من علم العقيدة ومحتوية على دقائق الاسرار الكلامية، منطوية على مباحث هي مفاتح العلوم الالهية، للعالم الفاضل، والنحرير الكامل الجامع بين المعقول والمنقول، حاوي الفروع والاصول، مبين الحلال والحرام، امام الائمة ومقتدى الانام، سيدي وسندي و مولاي قبلة صاحب الفضائل والراي البهي السيد الشيخ معروف البرزنجي.»

خەتی نووسەرەوەکەی خۆشە لە بەینی (ثلث) و (نسخ) دایە.

بەهۆی ئەوەوە ناتەواوە ناوی نووسەرەوە و مێژووی نووسینەوەی نازانرێ.

**دانراوی دووەم:** نامیلکەیەکی بچکۆلەی هەشت لاپەڕەییە، سەرەتا و کۆتاییی دیارە، ناوەڕۆکەکەی بەرپەرچی بیر و بۆچوونی کەسانێک دەداتەوە کە تەشەر و توانج دەگرنە هەندێک لە سەیدان و نەوەکانی پێغەمبەر(د.خ).

**لەسەر لاپەڕەی یەکەمی نووسراوە:**

«هذه رسالة شريفة قد حوت فوائد لطيفة للسيد الاكبر والمسك الاذفر، السيد احمد البرزنجي- حفظه الله المنجي- قد تملكه الحقير ابن خاله ابن النقيب- جعله الله- عالما بهمة حضرة الغوث- رضي الله عنه- . وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

**سەرەتاکەیشی ئاوایە:**

«وبعد: فيقول الراجي ربه المنجي السيد احمد بن السيد محمود الگلەزردی البرزنجی: لما كان الناس في زماننا يبغضون السادات لافعالهم التي لا تليق بشأنهم ويبحثون قبح افعالهم... » پاش

ماوەیەک نووسیویە:

«فأردت ان أصنف رسالة دالة على شرفهم وتحريم غيبتهم وبغضهم، فأقول: ان شرفهم... »

**کۆتایەکەیشی ئاوایە:**

«تم كتابة هذه الرسالة الشريفة للسيد العالم الفاضل ابن عمتي الكامل السيد احمد بن السيد محمود البرزنجی. حفظه الله المنجي على يد ابن خالته ابن النقيب، جعله الله عالما بهمة حضرة الغوث. -رضي الله عنه- ١٤ ذي الحجة سنة ١٣٠٢».

شایانی باسە دوو سەید ئەحمەدی نەقیب هەیە، سەید ئەحمەدی یەکەم و سەید ئەحمەدی دووەم. سەید ئەحمەدی دووەم ئەوەیە کە دیوانەکەی چاپ بووە بە ناوی (دیوانی سەیید ئەحمەدی نەقیب). ئەم دوو دانراوە دانراوی سەید ئەحمەدی یەکەمن کە باوکی سەید ئەحمەدی دووەمە. لەبارەی ژیانییەوە شتێکی ئەوتۆ نازانم.

# مامۆستا شێخ ڕەسووڵی گومەتەیش سەربازێکی گومناوی سەر ڕێگەی کۆکردنەوەی کەلەپووری کوردییە

٥٨٨

یەکەم جار کە دیوانی مەولەویی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسم دیوە و پێشەکییەکەیم خوێندووەتەوە باسێک بەرچاوم کەوت، کە زوو جێگەی لە مێشک و دڵمدا کردەوە و لە بیرم نەچووەوە.

باسەکەیش ئەوەیە کە مامۆستا باسی هەوڵ و کۆششی خۆی بۆ کۆکردنەوەی شیعرەکانی دیوانی مەولەوی دەکات و، باسی ئەو کەسانە دەکات کە سەرچاوەی شیعری ئەم شاعیرە بوون و، کەم تا زۆر کەشکۆڵ و شیعرییان لەلا بووە، باسی مامۆستا شێخ ڕەسووڵی گومەتەیش دەکات کە کەشکۆڵی شیعری مەولەوی و شاعیرانی تری لەلا بووە.

ساڵ هات و چوو ئەم باسە لە مێشکمدا نەسڕرایەوە و بۆ هەلێک دەگەڕام سەر و سۆراخێکی ئەو کەشکۆڵە بکەم؛ چونکە مامۆستا ئەوەی نووسیوە کە ئەو کەشکۆڵەی چنگ نەکەوتووە و نازانێ چی شیعری مەولەوی تێدایە. لە بەغداوە چەند جار نامەم نارد و دۆست و ئاشنام بۆ لای نەوەی مامۆستا شێخ ڕەسووڵ ڕاسپارد، گەلێ لەو هەولانەم بێ سوود و ئەنجام بوون. دوا هەوڵم نامەیەک بوو بۆ شێخ ئەنوەری حاجی شێخ قادری کوڕی خوالێخۆشبوو مامۆستا شێخ ڕەسووڵم نارد، بە دەمییی وەلامی دابوومەوە کە: هەوڵم بۆ دەدات.

دوایی بە ماڵەوە هاتمەوە بۆ سلێمانی، لێرەیش لە تەک جەنجاڵی و سەرقاڵیدا ئەم باسەم لە تەک هەوڵەکانی ترمدا بۆ شوێن هەڵگرتنی پەیداکردنی سەرچاوەکانی کەلەپووری ئەدەبی کوردی دانابوو.

تا ئەنجام کۆششەکانم بەریان گرت و، ئێوارەیەک کاک شێخ حسەینی کوڕەزای مامۆستا شێخ ڕەسووڵ هات بۆ بەخێرهاتنەوە کردنم و دیارییەکیشی بۆ هێنابووم کە بریتی بوو لە چەند لاپەڕە دەستخەت، کە لای ئەوان وایە ئەمە هەموو شوێنەوارەکانی باپیریانە، بەڵام من گومانم بۆ باسەکە دەچێت و، بڕوام وایە، وەک مامۆستا مەلا عەبدولکەریم فەرموویەتی، ئەو زاتە کاتی خۆی کەشکۆڵی نایابی شیعری هەبووە سا ئیتر هەرچۆن بووە یان بە یەکجاری تێداچووە، یان لای ئەم و ئەو کەوتووە و جارێ ئێمە لێی بێ هەواڵین.

هەرچۆن هەبێت دیارییەکەم، وەک دیارییەکی پڕ بایەخ لە کاک شێخ حسەین وەرگرت و، دامنا بۆ هەلێک شتێکی لە تەکدا بکەم. دوایی کە بە شێنەیی هاتمەوە سەری و سەرنجیم دا دەبینم ئەمە

پاشماوەی دەفتەرێکی کۆنی دەستخەتی شیعرە، کە گومان بۆ ئەوە دەچێت دەستخەتی مامۆستا شێخ رەسووڵ خۆی بێت.

پێش ئەوەی شتێک لەگەڵ ئەو شیعرانەدا بکەم کە لە دەستخەتەکەدان هەوڵ دەدەم مامۆستا شێخ رەسووڵ بە مێژووی زانایان بناسێنم:

مامۆستامان ناوی رەسووڵی کوڕی عەبدورەحمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەمەئەمینە. شێخ حەمەئەمین لە بەرزنجەوە هاتووەتە گوندی سێوسێنانی سەر بە ناوچەی قەرەداغ. شێخ ئەحمەد پێنج کوڕ و کچێکی بووە. کوڕەکانی گوندی گومەتەیان دروست کردووە و لەوێ جێگیر بوون.

مامۆستا شێخ رەسووڵ ساڵی ١٨٨٠ لە گوندی سێوسێنان لەدایک بووە.

مامۆستا لە منداڵیدا وریا و زیرەک و لەسەرخۆ بووە و، لەبەر نەبوونی قوتابخانە لە تەک براکانیدا خەریکی کار و کشتوکاڵ بووە، بەڵام لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا چووە بۆ خوێندن و خوێندەوارییەکی مامناوەندی بەدەست هێناوە و لە گوندی گومەتەدا نیشتەجێ بووە، بە کۆششی خۆی ژیاوە و پێشنوێژی بۆ خەڵکی گوندەکە کردووە کە بەزۆری خزم و کەس و کاری خۆی بوون.

بەداخەوە بەسەرهات و ژیانی نەنووسراوە و شتێکی ئەوتۆی لەبارەوە نازانرێت.

گومان لەوەدا نییە کە قوتابخانەیەکی بچووک - یان گەورە-ی بووە، بەڵام - دووبارە- بەداخەوە کتێبخانەکەیشی تێداچووە و جگە لە چەند پەڕەی دەستخەتی خۆی کۆکراونەتەوە و لە بەرگی دەفتەرێکدا پارێزراون هیچی تری لێ بەجێ نەماوە.

ئەوەی لەو چەند پەڕەی ئەو دەفتەرە وەردەگیرێ ئەوەیە ئەم پیاوە قوتابیی قوتابخانەی شیعری مەولەوی بووە، زۆر هۆگری شیعرەکانی مەولەوی بووە، لاساییی ئەوی کردووەتەوە، شوێن پێی لە شیعر نووسیندا هەڵگرتووە. ئەمەیش دەمانبات بۆ لای ئەوەی کە بڵێین: مامۆستا شێخ رسووڵ مەولەویناس و مەولەوییزان بووە و، بێگومان - وەک مامۆستا مەلا عەبدولکەریم لە پێشەکیی دیوانی مەولەویدا باسی کردووە- دیوانی مەولەوی لەلا بووە و، رەنگە ئەگەر سەرجەمی شیعری مەولەویی لەلا نەبووبێت زۆربەی شیعرەکانی لە دەستدا بووە، هەروەها رەنگە کەشکۆڵی شیعری شاعیرانی تریشی لەلا بووبێت.

لەبارەی کەشکۆڵی یان دیوانی مەولەوییەوە کە بوویەتی و باسی کراوە گەلێ هەواڵم پرسی و نەگەیشتمە ئەنجامێکی تەواو، ئەوەی کە ترووسکە هیوایەک لەم بارەوە دەخاتە سەر رێگەی کۆکردنەوەی بەرهەمەکانی ئەوەیە کە دەڵێن: کەشکۆڵەکە کەوتووەتە لای کاک فازیلی کوڕەزای مامۆستا شێخ رەسووڵ کە من نەمتوانی دەستی بخەم، هیوادارم لەلای ئەو پارێزراو بێت و رۆژێک بێت دەربکەوێت و سوودی خۆی بدات.

هەرچۆن هەیە ئەوەی لەبارەیەوە زانراوە ئەوەیە ژیانی لە گوندی گومەتەی قەرەداغدا بەسەر بردووە و تا دوا قۆناخی هەر لەوێ ماوەتەوە و لەوێیش ساڵی ١٩٥٨ز کۆچی دوایی کردووە و ئارامگای هەمیشەییی لەوێیە.

لێرەوە دەگەڕێمەوە لای چەند پەڕە دەستخەتەکەی کە بە دووری نازانم دەستخەتی خۆی بن و دەڵێم:

دەستخەتەکە دوو بەشە، بەشی یەکەمی ١٤ لاپەڕەیە بە خەتێکی جیاواز لە بەشی دووەم نووسراوەتەوە، وەک ئەوە وایە پاشماوەی کەشکۆڵێک بێت، سەرەتا و کۆتاییی دیار نییە و ناوی کەس و مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە. بەشی دووەم ٣٦ لاپەڕەیە، ئەویش بە دوو خەت نووسراوەتەوە. ئەم بەشەیان بە زۆری شیعری مامۆستا شێخ رەسووڵ خۆیەتی. بەڵام بەشی یەکەم (یا فەردی ئەعظەم)ی مەولانا خالید و دوو سێ پارچە شیعری تری تێدایە.

وەک گوتم مامۆستا شێخ رەسووڵ قوتابیی قوتابخانەی شیعری مەولەوی بووە، ئەم چەند لاپەڕەی بەردەستمان ئاوێنەی رووناکی ئەو باسەن و هۆگربوونی مامۆستا بابا رەسووڵ بەشیعری مەولەوییەوە زۆر بە ئاشکرا تێیدا رەنگ دەداتەوە.

شیعرەکانی هەموویان لەم دەرفەتەدا جێگەیان نابێتەوە، بەڵام وەک لاپەڕەیەکی مێژووی ئەدەبی کوردی پارچەیەک شیعری مامۆستا لێرەدا بڵاو دەکەمەوە بۆ بەڵگەی ئەو بۆچوونەم و، بۆ ناساندنی قوتابییەک لە قوتابییەکانی قوتابخانەی شیعری مەولەوی.

**(وله) گفتوگۆ لەگەڵ پیاڵەی شکاو**

(کرتی) پیاڵە ئیمڕۆ هاتە پێش
سەراسەر ئەحواڵ سوئال کەردم لێش
وات: من سەنگێ بووم کەمتەرین سەنگ
بێ قەدر و قیمەت ناڕەوا و بێدەنگ
پایز دووپشک و مار بوو لە جێما
بەهاریش مانگا و گا ریا پێما
هاوین بە گەرمیی خۆر تاوم ئەسەند
زسان بێ ئارام بە سەردیی یەخبەند
تەقدیر شاگردی ئوستادی نوورە
هۆر من گرت هەوای دامە ناو کوورە
(نعوذ بالله) چەشتم ئێشی سەخت
ئەلئەمان هەوار ئەو نوومر و بێ بەخت
نەهات بە هاوار ئەیکرد تەماشا
واتم بۆ نەجات (کلا و حاشا)
حاڵی جەهەننەم ئەهاتە یادم
واتم: چون ئیسلام ئاخر دڵشادم

تاویامـــۆ (نوره) هێنامـــیـــیـــه دەر
ئەمـــجـــار وه مـــێکوت ئاهنی گـــاســـەر
شـــاگـــردی پڕ زۆر هانەته جـــەســـەم
جا ئاغام بنوار بەو جـەستـه و خـەستـەم
بەعـــضـێ وه نەعـــره بەعـــضـێ وه ناڵه
شانه و شـان شـانان خـاص ئەو گـۆپاڵه
له شـــانـای گـــۆپاڵ زایەریم بـو بەرز
لەبەر ئێشی سـەخت جـەسـتـەم هاته لەرز
پاڕامـۆ: شـاگـرد ئامـان صـەد ئامـان
ئینصـافـەن بەسـەن دەسـتم وه دامـان
ئەزانەن جـەسـتـەم چون سـوفـتـەن له پێش
خـۆ سـوفـتـه بەدحـاڵ له یاو باڵی مـێش (!)
چه جـــای گـــۆپاڵ ئاهنی گـــا ســـەر
ئەر شـــانـان له کـــێـــو بۆ زێڕ و زەبەر
دەسـبـەردار نەبۆن تا ورد بووم چون گـەرد
بێـــچـــاره پڕ ئێش هێنام ئاه ســـەرد
واتم: دەس بـڕیـا لـه هـەمـــــوو لایه
نۆبەی رەحـــمـــەتی حـــەق تەعـــالایه
ئەو وەخـــتـــه مـــەردێ فـــەهیم هاته لام
کـــردمی وه پیـــاڵه مـــەرهەم دا له زام
حـــورمـــەت پەیدا بوو بووم به جـای چایی
عـــالەم پەرێشـــان بۆ [شـــیـــراو بای!]
طالەعـم بڵند بەخـــتم هەوای ســـەند
دەســتی مـــەهـوەشـــان له گـــەردەنم بەند
منیـش دەس له مل لێـــو وه بانی لێـــو
عـــەجـایب هەردوو بۆ یەکـتـر پەشـێـو
گـــاهێ دای ئەنام لـه پێـــشی چاوی
بێ پەروا له عـــام بێـــژێ بەدناوی
گـــاهێ دای ئەنام لەســـەر بەری دەس
عیشق بێـهۆشی کرد له تانەی گشت کەس

گـــاهــێ بـه ئاوی گـــەرم شـــست و شـــۆم
ڕەونـەقـێ عــــەجــــیب پـەیدا ئـەبـوو بۆم
گـــــــاهــێ لـەنـاو تـاق زەڕیـنـی بـێـگـەرد
تـەخــــــتـم یا بـلـوور یا ئـاڵـتـــــوونـی زەرد
گـــاهــێ لـە سندووق زەڕکـــاری ڕەنگ ڕەنـگ
نـەخــــــــتـێ دای ئـەنـام دڵـی ئـەبوو تـەنـگ
بـێــــــچـــــارە ڕۆحی بـۆ لای من پـەرواز
ئـەی هـەی نـامــــەدەر وە ســــەرپـەنجــەی نـاز
مــــیـثلی پـێــشین جــار بـەزمـێ هـەم پەیدا
هـەردوو بـۆ یەکــتــر ســــەرخــۆش و شــەیدا
ئـێش و ســــــزای پـێش نـەمــــا لـە یادم
وام زانــی بـەو حـــــــاڵ دایم دڵـشــــــادم
لـە نـاکــــاو ئـەجــــەل درەوشـــا چـون بـەرق
دای لـێم پـارە بـووم لـە پا هـەتـا فــــــەرق
ڕێزەم ڕژیا خـــاک خــۆشــــیم چوو لە دەس
چـون خــۆشـی دنیــــا نامــــێنێ بۆ کــەس
وەک خــۆی فـــانیــیــەن کـارش هـەم فـانی
حــــــەولـدەر بـۆ ئـاخــــر ئـەو جــــاویدانـی
هـەرچیم هـات بەســـــەر لـە ئـێش و خـــۆشـی
ئـیسـلامی سـەرکـەش صـوبح تۆیش ئـەنۆشی
(شـێخ ڕەسـووڵ) ئـەر تۆیش کـەمێ فـامت هـەن
دڵ بـە نـەوازش دنـیـــــا هـیچ مــــــەبـەن
چـون وەک پـشــتــەمــاڵ حــەمــام هـەر تـاوێ
هـا بـە ڕووی یـەکـێ ئـەر گـــــــەدا نـاوێ
دوشـــمـنـی پڕ فــەن بە مــیــثلی دنیــــا
فـــامت بۆ نیــــیــــەن نەبوەن لە دنیــــا
بـە حـیلە سـازیی خــۆی کــەردەن وە لەیل
بەمــەجـنوون مــەککار چی مــەدەرۆ مــەیل؟
ئـەر مـــــەیلـێ بـدەی وە تۆڕداوی فـــــەنـد
ئـەسـیــــرت ئـەکـا و ئـەبـی حــەســرەتـمەنـد

قـــولابی فـــیکری گـــیـــرۆ ریشـــەی دڵ

پڕ ئـێـش بـێ ئـارام تـا چـی بـۆ تـۆی گـڵ

شـــوو نـاکـــا بە کـــەس بۆ هیچ کـــەس نابێ

پشـــــتی خـــوار ناکـــا بۆ کـــەس دانابێ

***

ئەم پارچەیە درێژە و ١٧ بەیتی تری ماوە، بەڵام ئەوەندەی کە نووسرا بەسە بۆ ئەوەی بزانرێت کە چۆن لاسایی پارچە شیعری.

نەتیـــجـــەی پاک دین شـــێخ ســـازانی!

خـــاس وەتـەن نە دڵ مـــەعـدووم ســـازانی

مەولەویی دەکاتەوە کە قسەی لەگەڵ پارچە شووشەیەکی شکاودا کردووە کە شێخ مومینی سازانی دابوویە دەستی.

**باسێکی دەستخەتەکە:**

ئەم دەستخەتە چەند پەڕە کاغەزی کۆنی پەرپووتی دڵۆپەلێدراوی دۆرنجاوییە، دوایی بەبێ تەرتیب یەک خراونەتەوە تێکڕا (٦٠) لاپەڕە دەبێت، وا پێدەچێت بەشی زۆری خەتی خوالێخۆشبوو مامۆستا شێخ ڕەسووڵ بێت.

ئەو شیعرانەی لە دەستخەتەکەدان چەند بابەت دەگرنەوە. وەک گفتوگۆ لەگەڵ دڵ.

موناجات

شیرین بەهارە

گفتوگۆ لەگەڵ شەماڵ

مەرثیەی شێخ غەفووری شێخ حسەینی چرچە قەڵا

مەرثیەی شێخ طەیبی برادەر زادم

گفتوگۆ لەگەڵ شەماڵ

دیارە ئەمانە پاشماوە و کۆکراوەن لە دەستخەت و دیوانی مامۆستا شێخ ڕەسووڵ و ڕەنگە شیعر و بەرهەمی تری زۆر بووبێت، بەڵام لەوانەیە هەر ئەمەی مابێت.

## وسيلة الوصول الي حضرة الرسول

٥٨٩

دەستـخـەتێکی بچکۆلەی سـەرەتا ناتـەواو بەو ناونیـشـانـەی سـەرەوە لـە کـتـێـبـخـانەکـەمـدایە، بە سەرچاوەکاندا گەڕام بەڵکو نوسخـەی تری بدۆزمەوە، یان هەواڵی دانەرەکەی بزانم شتێکی ئەوتۆم دەست نـەکـەوت، ئـەوەندە هـەیـە لە **(ایضـاح المکنون)**دا ناوی دانـراوێک هـەیـە نزیـک لەم ناوەوە کـە ئەمەیە (وسیلة الوصول الی معرفة حدیث الرسول لبدرالدین محمد بن سلامة الماردینی).[١]

لە شوێنەکانی تردا ناوی ئەم دانراوەی مامۆستا ماردینیم نەبینی.

لێرەدا ئەم دانراوەیش بە کـتـێـبـخـانـەی کوردی دەنـاسـێنم بـەڵکو لەمـەولا نوسـخـەی تر دەست بکەوێت یان زانیاریی زیاتری دەربارە بزانرێت.

وەک گوتم دەستخەتەکە سەرەتاکەی نەماوە، ئەوەی کە هەیە ئاوا دەست پێ دەکات:

«اللهم صل وسلم علی سیدنا ومولانا محمد وعلی آل سیدنا محمد السید الجلیل. اللهم صل وسلم علی سیدنا ومولانا محمد وعلی آل سیدنا محمد الذي اخترته من نسل اسماعیل... »

کتێبەکە لەسـەر شێوەی **(دلائل الخیرات)**و ئەو جۆرە کتێبانە لە بابەتی صەلاواتدایە لەسەر پێغەمبەر(د.خ). نازانرێت لە سەرەتاوە چەندەی لەناوچووە، ئەوەی کە ماوە ٨٤ لاپەڕەیە بە پێوانەی (١٦×١٠) لاپەڕەی (٩) دێری تێدایە. مـەحـمـوودی کـوڕی ئەحـمـەدی کوڕی عـومـەر سـاڵی ١١٧٨ک نووسیویەتییەوە.

دەستخەتەکە پەرپووت بووە، وەک زۆر لە دەستخەتەکانی کوردستان کەوتووەتە ئاوەوە و تەڕ بووە بەڵام نووسینەوەکەی نەکوژاوەتەوە.

---

(١) بڕوانە: ایضاح المکنون في الذیل علی کشف الظنون عن اسامي الکتب والفنون. تألیف: اسماعیل پاشا البابانی. المجلد الرابع. ص: ٧٠٩ طبعة دار الفکر ١٤٠٢هـ - ١٩٨٢م.

# دانراوێکی مامۆستا مەلا عەبدولقادری قەرەحەسەنی

٥٩٠

نازانین ئەو مامۆستانەمان بە تاکەکەسیی لە پەنا و پەسێو و سووچ و قوشبنی ئەم کوردستانە بەرینەدا بێ چاوساغ و ڕێگە پێشاندەر خۆبەخۆ کاریان کردووە و لە سەرەتای بەکوردی نووسینەوە هەوڵی ئەوەیان داوە بەشی خۆیان لەسەر ڕێگەی ئەو کاروانە پیرۆزەدا هەبێت.

بێگومان گەلێک لە بەروبوومی ئەو هەوڵە سەرەتاییانە بەهۆی کەمتەرخەمیکردنی بنەماڵەی ئەو کەسانە و ڕۆشنبیرانی دەوروبەریانەوە لە عاستیاندا، تێداچوون و گوڵی هیوای خاوەنەکانیان پووکاوەتەوە.

ئەگەر تاک و تەرایەکیان لەملاولا مابن و شیاوی ئەوەن بناسێنرێن و، یادی خاوەنەکانیان زیندە رابگیرێت؛ چونکە یەکە یەکەی ئەو کەسانە هەڵگری مەشخەڵی ڕووناککەرەوەی ئەو ڕێگە پیرۆزەن و چینانی دوای ئەوان شوێنکەوتووی ئەوانن.

یەکێک لەو مامۆستایانە مامۆستا مەلا عەبدولقادری قەرەحەسەنییە، ئەم مامۆستا لە سەردەمی خۆیدا هەوڵی داوە پێغەمبەری ئیسلام ( د.خ) بە زمانی کوردی بە گەلەکەی بناسێنێ. بۆ ئەم مەبەستە کتێبێکی بە ناونیشانی «مانگ و ڕۆژی ژیانی حەزرەتی پێغەمبەر( د .خ )» داناوە.

مامۆستا عەبدولقاد جگە لەم دانراوەی کە لەلای منە دانراوی تریشی هەبووە و بەختی یار بووە توانیویەتی چاپیان بکا، لە دانراوە چاپکراوەکانی چەند لاپەڕەی کتێبی «سی پارەی خوو رەوشت» لەدەستدایە کە لەسەر لاپەڕەی یەکەمی - دوای بەرگەکەی - نووسراوە:

«سی پارەی خوو رەوشت دانراوی عبدالقادری محمد علی قەرەحەسەنی حصاری. ئەم سی پارەیە پی شەوەی باسی تاریخی قران و حدیث ئەکا.

مزی چاپ لی دانو بلاو کردنەوەی هی ملا احمد مسعودی جونەلی لە قضای رواندز وە ملا عبدالکریم هکزیە.

چاپخانەی فرات - بغداد

لە سالی ١٣٥٧»

هەروەها کتێبی (شجرەی پێغەمبەر)یشی هەیە. ٢٠ لاپەڕەیە، ساڵی ١٩٣٧ لە بەغدا لە چاپخانەی فورات چاپ کراوە.[١]

---

(١) بڕوانە: ببلیۆگرافیای کتێبی کوردی، نەریمان مستەفا سەید ئەحمەد، بەغدا، ١٩٧٧، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ل: ٤٨.

مامۆستا عەبدولقادری دانەری ئەم کتێبە، کتێبەکەی بەش بەش کردووە، بەشەکانی بە ناوی (بەند) داناوە، دوای پێشەکییەک (بەندی یەکەم) دەست پێ دەکات و، کتێبەکەی لە چوار بەندا تەواو دەبێ.

**مامۆستا سەرەتای کتێبەکەی ئاوا دەست پێ کردووە:**

«بە ناوی خوای بەخشندە و پەروەردگاری عالەم.

هەموو کەس بە قەدەری ئیقتیدار واجبە کە سەعی و کۆشش بۆ قەوم و خوێشی خۆی بکات و، لە هەموو چاخێکدا لەسەر تەرویجی فرمانی نیشتمانی بێت، وە دانا و فەیلەسووفی هەر پۆلێک بە واسیطەی ذەکا و فیکری خۆیەوە کۆشش بۆ دەفعی نیفاقی ئەو پۆلە بکات. زێرا هەر کۆمەڵ و پۆلێک مۆرانەی نیفاقیان لە ناودا بوو پایە بەرز و بڵند نابن و ژێرکەوتوو موحەققەر و بێ هێز و مەتانەت ئەبن. دوشمن و ناحەزیان لە هەموو وەختێکا مووەفەق و باڵا دەس ئەبێت، وە دائیما مەغلووبی جیهاتی ئەربەعەی خۆیان ئەبن.

ئەمجارە واجبە کە هەموو زانست و دانایێک بە دڵ و بە گیان لە رێککەوتن و دەفعی نیفاقی بەینی پۆلی خۆی کۆشش بکات.

هەر کۆمەڵێک کە رێککەوتوو بن نامە و شوهرەتێکیان وەرگرتووە و لە ناو ئەمثال و ئەقرانی خۆیاندا ناژمێررێن، وە بەڵکو عەلاوە بە (مافوق) و ئەعلا عەد ئەکرێن. ئێمەی کورد... »

**ئەمەیش بەشێک لە کۆتاییی دانراوەکە:**

«ئیتر هیچی کە نانووسین، زێرا درێژە دەکێشێت، خوا ئەگەر تەوفیق بدا حەیاتی ئەبوبەکریش (مستقلا) لە سێپارەیەکدا دەنووسینەوە، وە هەتا لاوی نیشتمان بە تەواویی لە حەیاتی ئەبوبەکر تێ بگەن کە چەند زاتێکی گەورە و بە هیممەت بووە.

دائیما تکامان لە خزمەت لاوی نیشتمان ئەوەیە لە دوعای تەوفیق غافڵمان نەکەن و ئەوانیش بە قەدەر تاقەت کۆشش بکەن، دا وەکو باقیی ئومەمی موجایرە پێش بکەوین.

لە ٣ی ذیلحەجە وە لە ساڵی ١٣٥٥ی هیجریی [١٩٣٦– ١٩٣٧ز] تەواو بوو».

ئەم دانراوە ٣٤٥ لاپەڕەیە. لاپەڕەی ١٧ دێر و کەمتر و زیاتری تێدایە. خەتەکەی مامناوەندی و خۆشخوێنە. بە رێنووسێکی سەرەتاییی کوردی نووسیویەتی، لە هەندێ شوێندا بۆ لامی قەڵەو و پێی کراوە (...) سێ خاڵی داناوە.

زمانەکەی کوردییەکی سادەیە وەک نووسینی ئەو سەردەمە و دوای ئەوە و نووسینی گەلاوێژ و دەنگی گێتیی تازە و کتێبەکانی ئەو سەردەمە.

لە لاپەڕەی دوایی کتێبەکەدا مامۆستا ناونیشانی کتێبێکی نووسیوە دانراوی خۆیەتی، بەڵام جگە لە ناونیشانەکەی هەواڵێکی تری نازانم ناونیشانەکەی ئاوایە:

«كتاب السيف المحمدية في الرد على الشدلية النقشبندية»

تألیف: عبدالقادر محمد علی القرەحسني الحصاری ١٣٥٥»

بە ناونیشانەکەیدا دیارە کتێبەکەی بە زمانی عەرەبی بووە و، دیارە لەو کاتەدا بزووتنەوەی حەقە لە گۆڕێدا بووە و، ئەمیش بۆچوونەکانیانی بەلاوە هەڵە بووە و بەرهەڵستی کردوون. ئەگەر کتێبەکەی لە دەستدا بووایەت شتێکم لە بارەیەوە دەنووسی.

ئەم دانراوەی ئێرەی کە باسیم کرد لە باسی (سیرەت) رەوشت و ژیانی پێغەمبەر و یارانیدایە، کتێبەکەی لە کۆمەڵێ سەرچاوەی باوەڕپێکراوی ئیسلامی وەرگرتووە و کارەکەی تا ئەندازێکی باش زانستییانەیە.

# خۆشنووس و ئەدیب و مێژوونووسی کورد
# مامۆستا سەید تاهیری هاشمی

٥٩١

**کورتەیەکی ژیانی بە قەڵەمی خۆی:**

«هێشتا وام لێ نەهاتبوو کە بانگی داکم بکەم و بڵێم: دایە گیان! دایکم بە رەحمەت بی رۆیی، من مامەوە و باوکێکی زۆر بە رەحم و خاوەن بەخشش کە هەموو چەشنە تەقەلایەکی بۆ بەرزیەتی من بەتایبەتی بۆ خوێندەواریم ئەدا.

رۆژێک دەست و پێ و خزمان وتیان: تاهیر لە مانگی ذیلحەجەی ساڵی ١٣٣٢ی کۆچی مانگیدا لەدایک بووە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە بنرێتە بەر خوێندن.

بەڵێ لە خزمەت مامۆستا شێخ عارف و خاتوون مریەمی خێزانیدا - کە هەردووکیان لە ساداتی لهۆن و بە ئەصل بەرزنجی بوون- دەستم بە خوێندن کرد و، لە خزمەت خاتوون مەریەمدا قورئانم خەتم کرد.

دواتر ماڵی باوکم تالان کرا و خوێندنی منیش دواکەوت و، وا ئەزانم ساڵی ١٣٣٩ کۆچی مانگی بوو کە منیان نایە بەر خوێندن.

لە مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٣٤٠ک دا چوار پێنج هەزار سوار هێرشیان هێنایە سەر ماڵی باوکم و تالان و سیر و سۆز کراین. دەربەدەر کەوتین، باوکم بردمانی بۆ هۆرین و شێخان بۆ ماڵی عوسمان بەگی شەرەف بادینی. بەبۆنەی ئەوەوە هۆرین و شێخان ئەوبەری سنوور بوو لەژێر دەسەڵاتی ئینگلیزدا بوو هۆردووی تالانکەر نەیانتوانی بمانگەنێ.

ئەوەیش بڵێم: لەبەرئەوەی باپیری پێنجەمم سەید شێخ رەسووڵ لە گوندی سۆڵەی سەر بە ناحیەی قەرەداخی سلێمانی دانیشتووە پێمان ئەڵێن: سۆڵەیی. شوێنی لەدایکبوونم دێی دەوڵەتئاوای رەوانسەرە.

لە خزمەت باوکمدا سەردانی سۆڵەم کرد و بە خزمەت شێخ حسەینی رەئیسی سەیدەکانی سۆڵە - کە پوورزای باوکم بوو- گەیشتم.

لە کۆتاییی ساڵی ١٣٤١دا گەڕاینەوە بۆ دەوڵەتئاوا لە ساڵی ١٣٤٧دا باوکم خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا محەمەد رەحیمی رۆحانیی سنەیی بە مودەڕیسی هێنایە دەوڵەتئاوا. منیش لە خزمەتیدا خوێندنم دەست پێ کردەوە.

کاتێ تەمەنم گەیبووە ١٦ ساڵ شیعری کوردی و فارسیم دەگوت، بۆ هەڵسەنگاندن و

ڕێکخستنی شیعرەکانم پێشانی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا حەمەڕەحیم ئەدا، ئەویش بە ڕووخۆشی و میهرەبانییەوە شیعرەکانی بۆ ڕێک دەخستم و زۆر لە شیعر و ئەدەبیاتدا هانی دەدام. هەر لەو ساڵانەدا شاگردیی کاکم خوالێخۆشبوو سەید وەجیهەدینی هاشمیم دەکرد، کاکیشم سەبارەت بە مانا و وەزن و ڕیشەی قسەی جوان زۆری پێشاندام.

لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا دەفتەرێکی دووسەد پەڕەییم کڕی و بەناوی دیوانی شیعرەوە دەستم کرد بە کۆکردنەوەی شیعرەکانم، ئەم دەفتەرەم ئێستایش ماوە.

ساڵی ١٣١٨ چوومە کرماشان و لە بانکی کەشاوەرزی دامەزرام. لەوێ لە خزمەتی مامۆستای پایەبڵند (بدیع الزمان مهی فرهی) خەڵکی سنەدا دەستم کرد بە خوێندن، تا ئەو مامۆستایان گواستەوە بۆ تاران. هەر لەو سەردەمەدا هاوساڵ و هاودەمم خوالێخۆشبوو مامۆستا بابا مەردۆخی ڕۆحانی بوو.

بەم چەشنە ڕۆژ بەڕۆژ لەگەڵ شیعر و ئەدەبدا عیشقم زیاتر ئەبوو. ئەنجا دەستم کرد بە نووسینی پەخشانی فارسی، هەڵبەت ئەو پەخشانانەی کە من نووسیومن پەخشانێکی سۆفییانەیە، سەبارەت بە پیاوە گەورەکانی عیرفان.

ئەو کاتە کە لە کرماشان بووم تازە گۆڤاری گەلاوێژ بە سەرۆکایەتی خوالێخۆشبوو مامۆستا عەلادین سەجادی بڵاو دەبووەوە. دۆستی خۆشەویستم ئیبراهیمی نادری هەم گۆڤاری گەلاوێژی بۆ دەهێنام و، هەم وتارەکانمی ئەگەیاندە گەلاوێژ. ئەو کەسانەی کە وتارمان بۆ گەلاوێژ دەچوو من بووم و خوالێخۆشبوو یەدوڵڵای ڕەزایی کە بە زاراوەی کەڵهوڕ دەینووسی، لە سنەیشەوە خوالێخۆشبوو ناسرخانی ئازاد پوور.

ساڵی ١٣٣٢ وازم لە کاری ئیدارە هێنا و گەڕامەوە دەوڵەتئاوا تا ساڵی ١٣٤٨ی هەتاوی. لەو ساڵەوە تا ساڵی ١٣٥٦ زستانان لە کرماشان و هاوینان لە دەوڵەتئاوا دادەنیشتم و هەر لەو ساڵانەدا لە ڕادیۆی کرماشان دەستم کرد بە نووسینی بەرنامەی ئەدەبی. گرینگترین بەرنامەم کە لە هەموو قوڵێکی کوردزمانەوە بەتایبەت گوێیان بۆ ڕادەگرت و داوایان دەکرد، بەرنامەی (هەوارگەی دڵان) بوو.

هەوارگەی دڵان لە سێ بەش پەخشان و سێ بەش شیعر پێک دەهات، کە پەخشانەکانی لەگەڵ شیعرەکاندا جۆر دەردەهات. ئەو سێ پارچە شیعرە کە لە بەرنامەی هەوارگەی دڵاندا ئەمهێنان و برێ جار هەرسێکی هەڵبەستی خۆم بوون، برێ جاریش لە شیعری مامۆستایانی شیعر و ئەدەب وەکو: مەولەوی، بێسارانی، وەلی دێوانە، سەیدی، نالی، مەحوی، بێخود و... هەڵم دەبژاردن و لە هەموو شوێنێکا پەخشانەکەش سەبارەت بە مانا لەگەڵ شیعرەکاندا دەس لەمل بوو.

جگە لە هەوارگەی دڵان هێندێکی زۆریش بەرنامەم سەبارەت بە شیعر و ئەدەب و مێژوو بۆ ڕادیۆ کرماشان دەنووسی، تەنانەت چەند بەرنامەی ئاینیم لە ژیانی ئیمامەکاندا نووسی، کە لە بابەتەوە زۆر کەموێنە بوون، بەڵام هیچکام لە بەرنامەکانم نەیتوانی ناوبانگی هەوارگەی دڵان، کە بۆ خۆی کتێبێکی پەخشان و هەڵبەستە لە هەڵبژاردەی شاعیرانی کورد، بەدەست بهێنێ».

تا ئێرەم بە کورتکردنەوە و دەستکارییەوە لە نووسینی مامۆستا سەید تاهیر خۆیەوە وەرگرت. مامۆستا سەید باقری هاشمیش کورتە ژیانیکی مامۆستا سەید تاهیری نووسیوە، بەشێکی هەر ئەوەی خۆیەتی و بەشەکەی دوایی تەواوکەری هەندێکی و بەشێکی دوای کۆچی دواییی مامۆستایە، پوختەی ئەو بەشەی کە لەوێدا نییە دەکەم بە تەواوکەری ئەم بەشە:

مامۆستای هاشمی یەکێک لە خۆشنووسانی سەردەمی خۆی بووە، بەتایبەتی شێوە خەتی (نسخ) ئەویش بە سەبکی حافز عوسمان لەم شێوەدا بە شایەتی شارەزایانی ئەم هونەرە مامۆستا سەید تاهیر بێوێنە بووە. بەم شێوە خەتە جوانە چەن کاری گەورەی ئەنجام داوە، لەوانە:

١- قورئانی پیرۆز. بە خەتێکی (نسخ)ی نایاب قورئانێکی نووسیوەتەوە کە بەداخەوە تا ئێستە چاپ نەبووە و تەنیا نوسخەی لەلای سەید حەسەنی کوڕی لە کرماشان پارێزراوە.

٢- الصحيفة السجادية. چاپ کراوە.

٣- دلائل الخيرات. ئەمیش چاپ کراوە و، خەتێکی زۆر جوانە و، لە خزمەت نوسخەیەکی دام.

مامۆستای هاشمی جگە لە زانایی و بلیمەتی و هونەرمەندی یەکێک بووە لە پیاوە رەوشت بەرزەکانی سەردەمی خۆی لە رەهەندەیی و سەخاوەت و، راستگۆیی و، ئەمانەت و، دەمپاکی و، قسە خۆشی و، وەفا و دڵپاکیدا گۆی هونەری لە هاوڕێیانی خۆی بردووەتەوە.

مامۆستا بە فارسی و کوردی و عەرەبی شیعری وتووە. کە قەسیدە و غەزەل و جۆرەکانی شیعر دەگرنەوە. پاش خۆی چەند دانراوی پڕ بایەخی لێ بەجێ ماوە، لەوانە:

١- دانراوێک لە ژیان و بەسەرهات و کەراماتی شێخ عەبدولقادری گەیلانیدا.

٢- ائمەء اطهار از دیدگاه اهل سنت.

٣- قرة العين. بەسەرهات و کەراماتی شێخ حسەینی سۆڵە.

٤- نور الواصلين في ذكر كرامات السيد عبدالقادر الملقب بقمچی رەش.

٥- پێشەکییەک بۆ دیوانی (ابو الوفا) شێخ عەبدورەحمانی نەقشبەندی.

٦- برهان الحق. بابەتێکی عیرفانییە.

٧- منبع الانوار. بەسەرهات و کەراماتی شێخ حەسەنی قەرەچیوار.

٨- نامیلکەیەک لەبارەی ژیانی شێخ عەبدولقادری گەیلانییەوە.

ئەم هەشت دانراوەی بە فارسین و بە خەتێکی زۆر جوانی فارسی نووسیونیەوە.

**شوێنەوارە کوردییەکانیشی ئەمانەن:**

١- ژیانی وەلی دێوانە.

٢- کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی دیوانی بێسارانی.

٣- کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی سەید ساڵحی کرماشانی.

٤- کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی دیوانی مەولەوی.

٥- ناميلکەیەک لەبارەی عەرووز و قافیەوە لە زمانی کوردیدا.

٦- ناميلکەیەک لە عیلمی بەدیعدا.

٧- دیوانی لەیلێ و مەجنوون بە سەبکی نیظامی گەنجەوی لە ٢٠٠٠ بەیتدا.

٨- هەوارگەی دڵان، بە شیعر.

٩- زنجیرەیەک پەخشان، ئەوانیش هەر بەناوی (هەوارگەی دڵان)ەوە.

ئەم مامۆستا مەزنە رۆژی دووەمی تیرماهی ساڵی ١٣٧٠ی کۆچی هەتاوی لە تەمەنی ٧٨ ساڵیدا ماڵئاوایی لە جیهان کرد و لە گۆڕستانی دەوڵەت ئابادی زادگا و دڵخوازی بەخاک سپێرراوە.

ئەمەی من نووسیم کورتەیەکی زۆر کورتی ژیانی مامۆستا سەید تاهیرە. ژیانی مامۆستا و لێکدانەوەی هونەری و بەرهەمەکانی بە کتێبێکی درێژ تەواو نابێت، بەڵکو رۆژێک بێت یەکێکی کارامە و شارەزا ئەو پرۆژە پیرۆزە جێبەجێ بکا.

الحمد لله خالق الارض والسماء والصلوة والسلام على حبيبه سيدنا

محمد افضل المرسلين والانبياء واله الاصفياء واصحابه الاتقياء

كتبه العبد المذنب الغبي المفتقر الى عفو ربه الغني محمد طاهر سيد زاده

الهاشمي ابن قيدار الهاشمي الحسيني الشولي البرزنجي عفى الله عنه وعن والديه

راجيا قبول ربه الكريم وكان الفراغ في ليلة الخميس

العاشر من شهر شوال سنة ثلث واربعمائة

بعد الالف من هجرة من له

العز والشرف عليه

وعلى اله السلام

وودادك من اهل بلادك وبك منك فاجعلني
بشبابك واهلك عنادك
المنصورك ومن نعادك ونعود
اللهم انا نعوذ بك [illegible]
والسلام الله تعالى عليه

وَاَنْ لَيْسَ لِلْاِنْسَانِ اِلَّا مَا سَعٰى وَاَنَّ سَعْيَهٗ سَوْفَ
يُرٰى ثُمَّ يُجْزٰهُ الْجَزَآءَ الْاَوْفٰى اَللّٰهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِ
صَلٰوةً تُشْرَحُ بِهَا الصُّدُوْرُ وَتَهُوْنُ بِهَا الْاُمُوْرُ
وَتُكَاشَفُ بِهَا السُّتُوْرُ وَسَلِّمْ تَسْلِيْمًا كَثِيْرًا دَآئِمًا
اِلٰى يَوْمِ الدِّيْنِ دَعْوٰهُمْ فِيْهَا سُبْحَانَكَ اللّٰهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ
فِيْهَا سَلَامٌ وَاٰخِرُ دَعْوٰهُمْ اَنِ الْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ

اللهم صل على سيدنا محمد والحمد لله رب العالمين وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وآله وصحبه اجمعين

تمت الاوراد والصلوات الغوثية لحضرة غوث الاعظم و
ملاذ اولياء العالم شيخ الاسلام السيد الشيخ الامام
محي الدين عبد القادر الحسيني الحسني الحنبلي الجيلاني
سلام الله تعالى عليه في ليلة الاربعاء ٥ ربيع الثاني سنة ١٤٠٦
بيد المذنب طاهر الهاشمي . وصلى الله على النبي محمد وآله

كتبه الفقير الى الله تعالى
الهاشمي طاهر بن قمر الدين
الحسيني القادري الحنبلي
عفى الله عنه وعن والديه
في ليلة الاربعاء ٢١ جمادى
الآخرة سنة ١٤٠٧ [illegible]

# پێڕست